ناوی کتێب: رامیاری لە ئیسلامدا
نووسینی: ئەحمەد کاکە مەحمود
ژمارەی سپاردن: (1275) ساڵی (2008)
شوێنی چاپ: خانەی چاپو بڵاوکردنەوەی چوارچرا
نۆرەی چاپ: یەکەم
ساڵی چاپ: 2008
نەخشەسازی بەرگ: فازل قەرەداغی
نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی
لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (34)
ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com
ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

پرۆژەی تیشك

**بەناوی خوای گەورەو میهرەبان**

## وتەیەکی پێویست

ڕۆژگارێك کە بێداریی ئیسلامیی تازە بە تازە لە گەشەسەندندا بوو، لاوان بە پەرۆشەوە لە دووی: مامۆستایەك، وتارێك، دەگەڕان کە تینوێتییان لە دین تێگەیشتنیان بشکێنێت، لەو ڕۆژگارە نەهاتەدا، مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحمودی مامۆستاو نووسەرو وتاربێژ، لە هەر سێ بوارەکەدا، ئازایانە هاتە مەیدانو سەرکەوتووانە ئەسپی خۆی تاودا.

دوو بواریان بەجێدەهێڵین بۆ کەسانی دی تا لەسەریان بدوێن، نەوەك لەم پێشەکیەدا ماف خۆیان پێنەدەین، بەڵام ئەو نووسەرە بەڕێزە لە کۆتایی هەفتاکان تا کۆتایی هەشتاکان بە نووسینە بەپێزەکانی بەشدارێکی دیاربوو لە بێدارکردنەوەو ڕۆشنبیرکرنی لاواندا، کاتێك کتێبەکانی (خوا لە ڕوانگەی زانیاریەوە)، (وتەی زاناکانو باوەڕ بە خوا)، (خواپەرستی لە ئیسلامدا)و (... لە ئیسلامدا)کانی دیکە چاپدەکران، لاوان دەستەو دەستەو بە پەرۆشەوە پێشوازیان دەکردنو تامەزرۆی بەرهەمی داهاتووی دەبوون، چونکە ئەو کتێبانەش وەڵامدانەوەی پێویستیەکانی ئەو دەمانە بوون، هەر خێرا لە کتێبخانەکاندا دەفرۆشرانو داوای چاپی نوێیان دەکرا.

هەرچەندە مامۆستا لە کۆتایی هەشتاکانەوە تا لە ساتەوەختی وەفاتی، بە کردەیی سەرقاڵی کاری سیاسیو کارگێڕی بوو، بەڵام خۆشبەختانە هەرگیز دەستبەرداریی قەڵەمەکەی نەبوو، چونکە لە گرنگیو هەستیاریی ئەو مەیدانە باش گەیشتبوو.

بۆیە چەندین بەرهەمی بە دەستنووسیی تا وەفاتی کرد هەر مانەوەو چاپنەکران، مەزنترینیان تەفسیرەکەی (تەفسیری ڕامان) بوو دوای کۆچی مامۆستا چاپکرا.

ئەم بەرهەمەش (ڕامیاری لە ئیسلامدا) یەکێك بوو لەو دەستنووسانە کە وەك ڕێزلێنانو وەفایەك بۆ مامۆستای کۆچکردوو پرۆژەی تیشك بە چاپی گەیاند، سەرەڕای گرنگی ناوەڕۆکەکەی کە پەردە لەسەر زۆر گومان لادەداتو چەندین ڕاستی لەمەڕ سیاسەتو ئاییینی ئیسلام دەخاتەڕوو.

لە خوای گەورە داواکارین: ئەم کتێبە بە خێری نەبڕاوە بۆ مامۆستا ئەحمەد وەگرێت.

دەشخوازین بە بڵاوکردنەوەی، توانیبێتمان خزمەتێك بە گیانی مامۆستای کۆچکردوو کردبێتو مەڵۆیەکمان خستبێتە سەر خەرمانی ڕۆشنبیری کوردیی.

**پرۆژەی تیشك**
2008/6/15

## کورتەی ژیاننامەی مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحمود



– ساڵی 1950 لە گوندی یالآنپێ لەدایك بووە.

– لە تەمەنی حەوت ساڵیەوە خراوەتە بەر خوێندنی زانستە شەرعیەکان لە گوندی یالآنپێ لای مامۆستا سەید حسێن.

– بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن چۆتە کورستانی ئێران و لای چەند مامۆستاو لە چەندین ناوچەی کوردستان درێژەی بە خوێندنداوە.

– دواتر دەگەڕێتەوە کوردستانی عێراقو لەسەردەستی مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتوە.

– دوای کرانەوەی پەیمانگای ئیسلامیی لە هەڵەبجە، مامۆستا ئەحمەد دەبێتە قوتابی ئەو پەیمانگایەو ساڵی (1971) خوێندنی پەیمانگای تەواو کردووە.

– دواتر دەبێتە ئیمام و وتاربێژو لە چەند مزگەوتی ناوچەی هەڵەبجەو پێنجوێن و بە وتارەکانی خەڵکی وشیار دەکاتەوە.

– لە (1982– 1987) وتاربێژی مزگەوتی گەورەی سیروان بووەو بە وتارو نووسینەکانی ڕۆڵی دیاری هەبوو لە وشیارکردنەوەی خەڵکیو گەشەکردنی ڕابوونی ئیسلامیی لەو دەڤەرەو کوردستاندا.

– یەکێکە لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە (1987)داو بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوە.

– چەندین بەرهەمی چاپکراوی هەیە لەوانە: خوا لەڕوانگەی زانیاریەوە، وتەی زاناکان و باوەڕ بە خوا، خواپەرستی لە ئیسلامدا، سەربەستی لە ئیسلامدا، ئاشتی لە ئیسلامدا، پەروەردە لەئیسلامدا، جیهاد لە ئیسلامدا، تەفسیری ڕامان.

– لە 2007/1/25 کۆچی دوایی کردووە.

## پێشەکیی

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ دروستکەری جیهان، بۆ چاودێریکەری هەمووان... درودو سڵاوی بێ وێنە، بۆ مامۆستای "سیاسەتی" ئەم دینە "موحەمەد" و یاران و هاوەڵانیشی بە تێکڕا، بەتایبەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی، لەگەڵ بنەماڵە و خاوو خێزانی، هەرکەسێکی تریش کە ببێتە خزمەت گوزاری ئەم ڕچە و پرۆگرامە تا کۆتایی ئەم جیهانە.

کاتێ مێشکم پڕ بوو لە وشەی "سیاسەت" و بەکارهێنانی لەلایەن هەموو درزو درۆزن وچاوبەست و، تەڵەکەبازو، خۆفرۆشو ئایینفرۆشو، نیشتمانفرۆشێك.... !!!

کاتێك وشەی "سیاسەت" لە بنج و ریشە دەرهێنراو پێچەوانە کرایەوە:

دز بووبە "سیاسی"، شەوکوت بوو بە "سیاسی"، پیاو کوژبوو بە "سیاسی"، پیاوی وریاو داناو زانا و خەمخۆری وڵات بە "کۆنە پەرست" ناوبرا...!!!، کاتێ ئەمانە و سەدەهای تریشم ئەبیست زۆر داخم بۆ خوارد، بۆچی ئەم چەرخە وا پێچەوانە بوەتەوە؟ خاوەن ویژدانەکان کوان؟ چۆن ئەم وشە ناهەقانە ئەبیستن وبێ دەنگ ئەبن لێیان... جا ئەوە بوو هیچ فەیلەسوف و زانایەك دوو لێوەی نەکردەوە سەبارەت بەم هەموو ناهەقیانە، ئەگەر موسڵمانێك ڕاقەی ئەو درۆی درۆزنانەی بکرادایە و بیوتایە: ئەو کەسەی سامان و دارایی خەڵك دەخوات "سیاسی" نییە، دزە، پیاوکوژ ئاژاو دلێرو سیاسی نییە، دوو زمان سیاسی نییە، خەڵك فریودەر سیاسی نییە... ئەگەر موسڵمانێك ڕاپەڕیبا بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەم ڕاستیە وەك ئەژدیها ئەو "سیاسیانە!" نوقسانە بۆی و پاشەکشەیان لێ ئەکرد، مەبەستیشیان تەنها ئەوە بوو کە گوایا پیاوی مزگەوت نازانێ سیاسەت چییە و بەری چ گیایەکە؟! موسڵمان کەی دەزانێ "سیاسەت" چییە تا بۆی هەبێ باسی بکات؟ ئیسلام هەقی بەسەر ئەو جۆرە شتانەوە چییە؟

باشە، ئیسلام بریتی نییە لە چەند ڕکاتێك نوێژو هەندێك دروشمی ترو پەیوەندیی مرۆڤ بە خواوە؟

ئیتر چۆن ڕەوایە ئیسلام مرۆڤ هەڵسەنگێنێ و بە خەڵکێك بڵێ دزو پیاو خراپ؟ چۆن بۆی هەیە باسی حوکمڕان و پێشەواو سەرکردەکان بکات؟ ناشێ خەیاڵی ئەوەی ببێت بڵێت منیش هەم، منیش دەتوانم حوکمی وڵات بکەم، سیاسەتی ناوچەو وڵات بەڕێوە بەرم، دەست لە ژیان بدەم، بەپێی ئابووریی خۆم گەل ببەمە پێشەوە؟!

دیارە بۆچی ئەم توانجانە دەگرن و بەو شێوە شاڵاو بۆ ئیسلام دێنن ! کاتێ باسی سیاسەتی ئیسلام ئەکەین، چونکە ئاگایان لە هیچ دەقێکی قورئان و فەرموودە و بیروڕای دەستەی زانایان سەبارەت بە "سیاسەتی ئیسلام نییە، نازانن کە قورئان ئەفەرموێ: ﴿... وأنزلنا الحديد...﴾ یان پێغەمبەر ـ ﷺ ـ دەفەرموێ: "... ومن مات وليس في عنقه بيعة مات ميتة جاهلية".

نازانێ مەبەست لەم "ئاسن"ە وەك ڕاڤەکەرانی قورئان و هەندێك لە زانا هەڵکەوتووەکانی ئیسلام ـ بەکۆن و تازەوە ـ دەفەرموون، هێزی سیاسەتی ئیسلامییە. دەستەواژەی هەموویان ئەبێتەوە بەم ڕستەیە لە تەفسیری ﴿ وأنزلنا الحديد" دا: "فالمراد من الحديد في الاية هو القوة السياسة" بێجگە لەمەیش نەیانزانیوە کە ئیسلام زۆر زۆر پێش سیاسەتمەدارانی ئەورووپای ئەوان باسی سیاسەتی کردووە و لەسەری نووسیوە، وەك قاضی ئەبووبەکری باقیلانی ـ کە لەساڵی 403 ی کۆچی لە دنیا دەرچووە، کتێبێکی بە ناوونیشانی "التمهيد في الرد على الملاحدة والرافضة و الخوارج و المعتزلة" نووسیو "عەبدول قاهیری بەغدادی ـ کە لەساڵی 429 ك لە دنیا دەرچووە کتێبی "كتاب اصول الدين".. و، امام الحرمين ساڵی 478 ك کتێبی "الارشاد الى قواطع الأدلة في اصول الاعتقاد"... ئیتر بێجگە لە ئیمامی غەزالی – کە لە ساڵی 505 ك کۆچی دوایی کردووە – کتێبی "فضائح الباطنية" و "الاقتصاد في الاعتقاد".. و بەڕێز "قاضی ئەبولحەسەن عەلی ئەلماوردی (م 450 ك) کتێبی "الاحكام السلطانية"ی نووسیوە.. و، هەروەها مامۆستای موجاهید (ئیبن تەیمییە 728 ك)ش کتێبی "السياسة الشرعية" ی نووسییوە. و، بەدەها نووسرا و پەڕاوی تر کە نووسراون بۆ ئەم بابەتە کە هەرکامێکیان سەیر بکەیت بیری سیاسی ئیسلامی بە تێرو تەواوی پێشکەش ئەکات..

ئینجا منیش لەبەرئەو تانەو توانجانە وەك قوتابییەكی خزمەت گوزاری قورئان ــ هەرچەند ئەم باسە باسێكی قورسی ئالۆزە ــ پێنووسم بۆ گرت بەدەستەوە و هەوڵێكی زۆرم بۆ داو لە پێش هەمووشتێكەوە پشتم بە خوای گەورە بەست و داوای یارمەتیم لێكرد بۆ ئاسان كردنی ئەم ڕێگەیە تابتوانم تیشكێ بهاوێژمە سەری و بیسەلمێنم كە لە جیهاندا سیاسەت بە (ماناو واتەی وشەكە) ی خۆی دەست ناكەوێت لە ئیسلامدا نەبێت و هیچ كەسێك ڕامیاری نەزانیوە، مەگەر لە ئیسلامەوە وەری گرتبێت.

بەڵكو بتوانم لەم كتێبەدا – ڕامیاری لە ئیسلامدا – پەردە لەسەر ڕووی ئەو هەموو درزو درۆزنانە هەڵماڵم كە بە وشەی "سیاسەت" مێشكیان پڕكردووین و گوێیان كەڕكردووین، كە لەڕاستیدا هەر هەموویان شایەنی ئەوەن كە زاخاوی مێكشیان بدرێتەوە و لە وشەی "سیاسەت" تێبگەیەنرێن.

تێبگەیەنرێن كە دنیای بێ ئایین، دەوڵەتی دوور لە ئایین، هەرگیز بە شێوەیەكی دادگەرانە ناگونجێت، چونكە مێژوو سەلماندوویەتی كاتێك لە سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەكانی ڕاشدیندا ئیسلام ئایین و دەوڵەتیش بوو، هێمنی و بەختیاری كۆمەڵ چۆن بوو، كاتێكیش بە پیلانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە دەوڵەت دوورخرایەوە چۆنە؟

ئەمەم نووسی تا هەموو كەسێك – بە تایبەتی هەموو لاوێ – بزانێ كە ئیسلام باسی هەموو قوژبنێكی ژیانی كردووە. هەر لە چوونە سەر ئاوەوە تا ئەگاتە چوونە سەر حوكم.... پێت ئەڵێت چۆن برۆیتە ئاودەست... پێت ئەڵێت چۆن وڵات بەڕێوەبەری.. بۆیە لە "سەلمانی فارسیان" پرسی: پێغەمبەرەكەتان ﷺ هەموو شتێكی فێركردوون، تەنانەت یاسای چوونە سەر ئاویش؟! سەلمان فەرمووی: بەڵێ[1] ... هەرچی شت هەیە كە پەیوەندیی بە ژیانی تاك و كۆمەڵەوە بێت، فێری كردووین.

ساخوایە، بۆ ڕۆشن كردنەوەی ئەم ڕاستیە بۆ هەمووان و، تێگەیاندنیان ــ كە ئەم نوسینانە مەبەستیان ڕێگە ڕۆشن كردنەوەیە بۆ ئەوان ــ داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەكەم.

جا ئەگەر توانیبێتمان لە "نیشانە" كە بدەین، ئەوا زیاتر سوپاسی خوای گەورە دەكەین... خۆ ئەگەر خوێنەر پێی ڕازی نەبوو، ئەوا داوای لێبوردن ئەكەین، چونكە زانیاریی مرۆڤــ زۆر كورت و ناتەواوە "وفوق كل ذی علم علیم"[2].

"ربنا لا تؤاخذنا إن نسینا أو اخطأنا ربنا ولا تحمل علینا إصرا كما حملته علی الذین من قبلنا ربنا ولا تحملنا ملا طاقة لنابه وأعف عنا واغفر لنا وارحمنا انت مولانا فانصرنا علی القوم الكافرین".

"ربنا آتنا من لدنك رحمة وهیئ لنا من أمرنا رشدا".

"رب اشرح لی صدری ویسرلی أمری وأحلل عقدة من لسانی یفقهوا قولی...".

وصلی الله علی سیدنا وقائد السیاسة الشرعیة بین الراعی والرعیة محمد و علی آله واصحابه وكل من یدعو لتطبیق السیاسة الاسلامیة الی یوم الدین.

**نووسەر**

15 / 6 / 1406 كۆچی

23 / 2 / 1986 زاینی

---

[1] ) رواه مسلم وابوداود والترمذی.

[2] ) طه

## سیاسەت لە ئیسلامدا

بەڵێ، بەکارهێنانی وشەی _ سیاسەت _ لەبیری ئیسلامیدا بەلای ئەوانەوە کە دڵیان چۆتە سەر یاساو باو و پرۆگرامی بێگانەکان، جێگەی سەرسوڕمانە، کاتێ دەیبیسن، چاویان زاق دەبێ و، دڵیان پێی دەلەرزێ ! !، چونکە وا تێگەیەنراون کە ئیسلام تەنها پەیوەندییە لە نێوان ئادەمیزادو پەروەردگاریدا.

بەسەرسوڕسمانەوە دەڵێن: ئیسلامی چی و سیاسەتی چی؟!

ئیسلامی چی و سەرکردایەتی چی؟!

ئیسلام چۆن بەکەڵك دێت "فەرمانڕەوایی" بکات، بەتایبەت لە سەدەی بیستەمدا؟! بزانن ئیسلاممان لێ زل ناکەن!، ئیسلام هەر ئەوچەند زیکرەیە کە لەمزگەوتەکاندا دەکرێ.

بزانە نایهێننە گۆڕەپانی ژیانەوە و لایەنەکانی سەبازی و ئابووری وپیشەسازیی پێ ناگرنەوە! !بەڵێ، بەپێی بیروبۆچوونی تەسکی ئەوان، ئیسلام هەرئەوەندەیە خەڵکی شەووڕۆژێ چەند جارێك لەبەردەم پەروەردگاریدا ڕابوەستێ، ئیتر بۆی نییە دەستکاریی کاروباری گەلان بکات،، بۆی نییە دەست بخاتە کاروباری بازرگانەکان و جوتیارو مامۆستا و ئەفسەرو سەرۆکەکان، بۆی نییە باسی شۆڕش بکات، باسی ئاشتی بکات، باسی جەنگ بکات، باسی ئازادیی وسەربەستی بکات، باسی پەروەردە بکات، باسی یاسای خوێندن و فێرکردن بکات !

واتە: مێشك بەنج کراوەکان بێ پێچ و پەناو شەرم دەڵێن: دەبێ ئایین لە کاروباری دنیاو دەوڵەت جیا بکرێتەوە. لە ڕاستیدا ئەمانە زۆر بەهەڵە لە ئیسلام گەیشتوون، چونکە ئیسلام ئایین و دەوڵەتە، "عەقیدە" و یاسایە، سیاسەت و "حوکم" ە یان دەڵێین "خواپەرستیی لە ئیسلامدا" هەموو ڕووەکانی ژیانی ئادەمیزاد دەگرێتەوە.

جابا بزانین ئایا دامەزراندنی دەوڵەت لەسەر ڕێبازی ئیسلام پێویستە یان نا؟

گوتمان.. ئیسلامی پیرۆز بێ پێچ وپەنا سیاسەت وحوکم دەگرێتەوە و، زۆر ئاشکرایە کە ئیسلام شان بەشانی سیاسەت لەسەرەتای دامەزراندنییەوە تا کۆتایی "خیلافەت"ی عوسمانییەکان، چاودێری کۆمەڵی کردووە.. ئەمە هەرکەسێك شارەزاییەکی مێژوویی هەبێت گومانی نامێنێ لەمەدا.

بەڵێ، لەسەر هەموو موسڵمانەکان پێویستە هەوڵ بدەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی قورئانی بەپێی ئەم بەڵگانەی خوارەوە:

1) لە قورئانی پیرۆزدا گەلێك ئایەت هاتوون کە پشتگیری ئەم بیرەی ئێمە دەکەن، بیری دامەزراندنی حوکمەتی ئیسلامی و دەسەلات گرتنە دەست لەسەر زەویدا، وەك ئایەتی: ﴿ يايها الذين آمنوا أطيعوا الله وأطيعوا الرسول وأولى الامر منكم ﴾.[1] واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان بە ئیسلام و ڕێبازەکەی هێناوە، گوێڕایەڵی خوا بن و فرمانەکانی پیادە بکەن و، فەرمان بەرداری پێغەمبەر بکەن ،، بەگوێی کاربەدەستەکانی ناوخۆتان بکەن .

خوای گەورە لەم ئایەتە کورتەدا، یاسای کۆمەڵایەتی بۆ موسڵمانەکان دادەمەزرێنێ و شێوەی "حوکم" یان بۆ دیاری دەکات و، سەرچاوەی هێزو دەسەلاتیان بۆ دەست نیشان دەکات.. کە دەبێ ئەمانە هەر هەموویان لە خواوە وەربگیرێن.

"حاکمیەت" لە ژیانی ئادەمیزادا، تەنها بۆ خوایە و بەس، هیچ کەسێك بۆی نییە یاسا بۆ ئادەمیزاد دابنێ و مرۆڤی موسڵمان دەبێ تەنها گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بێ، پێغەمبەریش لەوڕووەوە کە هەرچی دەڵێت لەلایەن خواوە دەیگەیەنێ... ئەنجا فەرماندەو پێشەوا موسڵمانەکان، واتە: کاتێك فەرمان بەرداریی "کاربەدەست" پێویستە، کە

[1] النساء / 59 .

موسڵمان و بڕوا دار بێت بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بەڵگەیشمان هەرئەم ئایەتە خۆیەتی: ﴿ وأولي الامر منكم...﴾ خاوەن فەرمان لە ئێوە "ئەی موسڵمانەکان"، کەوابوو سەرپێچی پێویستە لە فەرمانی فەرماندە خراپەکان، چ جای کافرو خوا نەناسان ئەوە بە گوێ کردنیان هۆی خەشم وقینی خوایە.. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: "إنما الطاعة في المعروف"[1] واتە: بە گوێ کردن بەو مەرجەیە فرمانەکەی دژ نەبێت لەگەڵ ئیسلامدا، هەروەها ئەفەرموێ: "السمع والطاعة على المرء المسلم فيما احب أو كره مالم يؤمر بمعصية، فإذا أمر بمعصية، فلا سمع ولا طاعة".[2] واتە: گوێڕایەڵی و فەرمان بەرداری پێویستە لەسەر موسڵمان (بۆ کاربەدەستەکانیان) لەوشتەدا کە پێی خۆش بێ و پێی خۆش نەبێ، تا فەرمان نەکرێ بە تاوان و سەرپێچی، جا ئەگەر فەرمان بە سەرپێچی فەرمانەکانی خوا درا، ئەوە (لەو کاتەدا) نەگوێ بۆ وشەیان ئەگرێت و، نە گوێڕایەڵیش ئەکرێن.

مەبەست لە ڕستەی "اولي الامر..." ئەوە بووکە باسکرا، نەك ئەو دەستەیە بەزۆرو زۆرکاری بێنە سەر کاروپەیوەندییان بە ئیسلامیشەوە نە بێ و ئەم ئایەتەیش بخوێننەوە بۆ پشتگیری خۆیان، بێ ئەوەی بیر بکەنەوە لەوە خۆ ئەم ئایەتە "ڕاناو" ێکی تێدایە و ئەگەڕێتەوە بۆ پێشەوە و ئەوی لە پێشەوە بێت موسڵمانەکانن، نەك ئەمان.

هەروەها ئەم ئایەتەیش ئەوەئەدات بە گوێ ی موسڵماناندا کە پێویستە موسڵمانان دەوڵەتیکی قورئانیان هەبێت.

﴿... ولو ردوه الى الرسول والى أولي الامر منهم لعلمه الذين يستنبطونه منهم... ﴾.[3]

واتە: ئەگەر دەنگو باسی هێمنی و ترس وبیمیان ببردایەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) یا بۆلای کاربەدەستە موسڵمانەکانیان، ئەوە حەقیقەت و باری تەواوی مەسەلەکەیان وەردەگرت ئەوانەی ئەودەسەڵاتەیان هەیە. ئەم ئایەتە پەروەردەیە بۆ سەربازی ڕاستەقینەی موسڵمان و وانەی دادەدات کە هەرکات دەنگو باسێك بڵاو بووەوە - پێش ئەوەی بڵێین بە خەڵکی - بیگەیەنینە پێغەمبەر و ئەفسەرە موسڵمانەکان، چونکە ئەوان دەزانن چارەسەری بۆ دابنێن.

ئەمانە و چەندەها ئایەتی تریش بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە لە قورئانی پیرۆزدا وەبەرچاو دەکەون.

2) سیماو ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامییە... چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەمووکاروبارێکی دەوڵەتیدا ئیشی کردووە، لە کاروباری ساماندا، خێزاندا، تۆڵە وەرگرتندا، جێ بەجێ کردنی سنوور (حدود) دا، "والی" ی داناندا، لە ڕووی سەبازییەوە سەرکردەو فەرماندەی داناوە، بۆ کۆکردنەوەی "زەکات و" کارگێڕی تایبەتی دیاری کردووە. و بەسەر هەژارو بێ نەواياندا دابەشی کردووەتەوە، وڵاتی لە پەلاماری دوژمنان و دنیا خۆران پاراستووە، جەنگی لەگەڵ ستەمکارو کافراندا کردووە، هەروەها... ئەمانە هەموویان کاروباری دەوڵەتن. ئەگەر دەوڵەتێك دابنرێ بێجگە لەمانە چی تر دەکات..؟ کەوابوو دانانی دەوڵەت لە سەربنەماکانی ئیسلام پێویستە. هەرچەندە ئێستا هەندێ دەنگی زڕ - بێ شەرمانە - بەرزبوونەتەوە، کە گوایا: ئەو ئیشانەی پێغەمبەر (ﷺ) هیچیان لە ڕووی دەوڵەتییەوە نەبوون و پەیوەندییان بە "سیاسەت" ەوە نەبووە بەڵکو لەڕووی ئایینەوە بوون !!.

ئەم تاقمە بۆیە وا دەڵێن، دەیانەوێ ئایین لە دەوڵەت جیابکەنەوەو ئەو سەردەمەی نێوان "خەلیفە" کان لە یاسای سیاسی هەڵاوێرن.

---

[1] ) بوخاری و مسليم .

[2] ) بوخاری و موسلیم .

[3] ) النساء / 83 .

جا بۆ ئەوەی وتەی ئەمانە بەتەرازووی ڕاستی و واقیع هەڵسەنگێنین و، وە بۆ ئەوەی دەرکەوێ کەتاچ ئەندازەیەك، ئەو قسەی دەڵێ: ئەو سەردەمە لە سیاسەت دوور بوو، ڕاستە، با لەدەمی یاسا ناسەکانەوە پێناسەی "دەوڵەت" بکەین ئەوجا لەگەڵ سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکان بەراوردی بکەین.

یاسا ناسەکان دەڵێن: "دەوڵەت بریتییە لە کۆمەڵە خەڵکێك، هەڵئەستن بە جێبەجێکردنی کاروباری وڵات لە ناوچەیەکی دیاریکراودا، کەسایەتی تایبەتی خۆی هەیە و، ڕژێمی خۆی هەیە و، یاسایەکی سەربەخۆی سیاسی خۆی هەیە". کەوابوو: پایەکانی دەوڵەت ئەمانەن:

1ـ کۆمەڵە خەڵکێك لە پارچە زەوییەکی تایبەتیدا نیشتە جێ بێت.

2ـ کەسایەتێکی تایبەتی خۆیی هەیە کە کۆمەڵ لەژێر سێبەریدا بەختەوەر دەبێت و خاوەن دەسەڵات "نوێنەرایەتی" دەکات.

3ـ ڕژێمێك کە کۆمەڵ سەری بۆ دادەنەوێنیّ و جۆری "حوکم"ەکە دەست نیشان ئەکات.

4ـ سەربەخۆییەکی سیاسیی کە کۆمەڵ تەنها ئەو پەسەند دەکات و دوای هیچ دەوڵەتێکی تر ناکەوێ.

ئەمانەن پایەکانی دامەزراندنی دەوڵەت... دەی بێگومان ئەم خاڵانە هەرهەموویان لە دەوڵەتەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبوون، چونکە هەموو کات لە شاری "مەدینە" ی پیرۆزدا کۆمەڵە مرۆڤێك بوون، و ئەو کۆمەڵە کەسایەتی تایبەتی خۆیان هەبووە و پێغەمبەریش (ﷺ) سەرکاریی کارەکانی دەکرد،.. لەولایشەوە ڕژێم و پرۆگرامێکی هەبوو خۆی و مرۆڤەکان دوای دەکەوتن و بەپێی ئامۆژگارییەکانی ئەو ـ قورئان ـ لە نێو کۆمەڵدا بڕیار دەدرا و دوای بەرنامەی هیچ دەوڵەتێکی تری وەك (فارس و ڕۆم و حەبەشە) نەدەکەوتن، بەڵکو بەپێی ئامۆژگارییەکانی خۆی ڕەفتاری دەکرد، بۆیە ئەوەی بەوردی سەیری " حکومەت"ەکەی "مەدینە" بکات، ئەم ڕاستییە دەسەلمێنیّ. بێجگە لەمەیش هەرکەسێك سەرنجێکیّ بانگەوازەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بدات و، بیر لە حەقیقەتی ئیسلام بکاتەوە، دەزانیّ ئەم دووانە بیّ تێکەڵ کردن و پەیوەند کردنی "ئایین و دەوڵەت" جێبەجیّ نابن، لەلایەکی تریشەوە زۆربەی "خۆرئاواییەکان و ڕۆژهەڵاتییەکان" ئەمەیان سەلماندووە:

1ـ دکتور "فیتز جیرالد" دەڵێت: ئیسلام وەنەبێت تەنها ئایین بیّ، بەڵکو یاساو ڕژێمێکی سیاسیشە هەرچەند لەم دوا دواییەدا هەندێك لەو موسڵمانانەی خۆیان ناوناوە "هاوچەرخ"، هەوڵیان دا بۆ جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت ! ! !.

2ـ تللینیو" ـ خۆرهەڵاتناسی ئیتالی بەناوبانگ ـ دەڵێت: بەڕاستیی موحەمەد لەیەك کاتدا بناغەی ئایین و دەوڵەتێکی دامەزراندو، بەدرێژایی تەمەنی/ ئایین و دەوڵەت بەیەکەوە بوون.

3ـ دکتور شاخت دەڵێت: ئیسلام تەنها ئایین نییە، بەڵکو خاوەنی چەندەها تیۆری یاسایی و سیاسیی بووە، بەکورتیی: ئیسلام ڕژێمێکی تێرو تەواوە، ئایین و دەوڵەتیش دەگرێتەوە.

4ـ ستروتمان دەڵێت: ئیسلام ڕوخسارێکی ئایینی و سیاسییە، چونکە ئەوی دایناوە پێغەمبەرو حاکمێکی بیّ وێنە بووە و شارەزای ڕژێمی حوکم کردن بووە.

ئەمانەو سەدان زاناو دانای تر گەواهی دەدەن کە ئیسلام تەنها ڕوخسارێکی ئایینی نییە، بەڵکو یاساو سیاسەتیشە، ئیتر نازانم ئەوانەی دەڵێن: ئەو سەردەمەی پێغەمبەرو (خەلیفە) کانی شێوەیەکی دەوڵەتی نەبووە... ئەبیّ دەوڵەت بەلای ئەوانەوە چۆن و چی بێت؟ !

بۆ ئەوەی ڕوونتر بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) دەوڵەتی هەبووە لەسەر دەوڵەت وڵاتی بەڕێوە بردووە بفەرموون هەندیّ لە پەیماننامەی مەدینە ورد ببنەوە کەلە نێوان جوولەکە و پشتیوانان و کۆچەرەکانی ناو مەدینەدا نوسرابوو.

"بسم الله الرحمن الرحيم"

هذا كتاب من محمد (ﷺ) بين المؤمنين والمسلمين من قريش ويثرب ومن تبعهم فلحق بهم وعاهد معهم، إنهم أمة واحدة من دون الناس...".

واتە:"بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان"

ئەمە نووسراوی موحەممەدە (ﷺ) لە نێوان بڕوادارەکان و موسڵمانەکانی قورەیش و "مەدینە" داو هەرکەسێکی تریش دوایان بکەویّ و پەیمانیان لەگەڵدا ببەستێت، سەبارەت بەوەی کە ئەوانە یەك گەل و کۆمەڵن..." نابێ گزییان لیّ بکریّ و سامان و داراییان دەستی بۆ ببریّ و، دەبیّ ئایین و هەستیان بریندار نەکریّ.

لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە: "من مات وليست في عنقه بيعة مات ميتة جاهلية" واتە: هەرکەسێك بمریّ و پەیمان (بەیعەت) ی لە ئەستۆدا نەبیّ، ئەوە مردنێکی نەفامانە مردووە. بەومانایە موسڵمان ئەبیّ پەرەوازەو جیاجیا نەبێت، ئەم لەگەڵ ئەوی تردا نەبێت و، بیّ خاوەن بسووڕێتەوە، بەڵکو دەبیّ کەسێکی باش و دڵسۆزی ئیسلام بدۆزێتەوە بۆ جیهادو تێکۆشان لە پێناوی ئیسلامدا، پەیمانی لەگەڵ ببەستیّ. ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ــ ﷺ ــ هەر ئاماژە بۆ ئەو مەبەستە دەکات، کە دەفەرمویّ: "إذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمروا احدهم" واتە: هەرکات سیّ کەس بۆ سەفەر ڕۆیشتن بایەکێکیان بکەن بە "ئەمیر" ی خۆیان، تا پشێوی و ناڕێکی دروست نەبێت لەناویاندا. مەبەست لەمە ئەوەیە ئەگەر هەموویان وەك یەك بن، هەریەکە بەتەمای ئەوی تریان دەبێت، یا خود هەریەکە بۆچوونێکی دەبیّ و یەك ناگرن و سەرئەنجام ئەو دەڵیّ من و، ئەم دەڵیّ من، تا خەڵکیان لیّ کۆئەبێتەوە. ئەگەر کاروباری وڵاتیش نەدرێتە دەست کەسێکی تایبەتی هەر وای لیّ دێت، واتە: بۆ سەفەرێکی یەك دوو ڕۆژەیی، ئەمیرو سەرکردە پێویست بێت، ئەی چۆن بۆ دەوڵەتێك کە لە (ملیۆنەها) کەس پێکهاتووە "ئەمیر" پێویست نییە؟ !!.

دیسانەوە دەفەرمویّ: "لايحل لثلاثة يكونون في فلاة من الارض إلا أمروا عليهم احدهم".

واتە: ڕەوا نییە سیّ کەس لە شوێنێکی چۆڵیدا بن و، یەکێکیان نەکەن بە "ئەمیر" ی خۆیان. دیارە ئەگەر لە چۆڵیدا "ئەمیر" پێویست بێت، بەناچاریی لەناو قەڵەبالغیدا دەبیّ هەر ببیّ.

خوێنەری بەڕێز: بەوردی سەرنجی بدەو بزانە کاتیّ پێغەمبەر (ﷺ) چاوپۆشی لە سیّ کەس ناکات بەبیّ ئەمیرو لێپرسراو پێکەو بن، دەبیّ چۆن ڕێگە بدا ملیۆنەها موسڵمان بیّ پێشەوا و سەرکردە بمێننەوە؟!!.

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: "كلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته فالإمام راع وهو مسؤل عن رعيته، والرجل راع على أهل بيته وهو مسؤل عن رعيته" واتە: هەمووتان شوان و چاودێری کەرن، وەهەموو شوانێك لیّ پرسراوە لەژێر دەستەکەی خۆی... پێشەوا شوانە و لیّ پرسراویشە لەژێر دەستەکەی خۆی، مرۆڤ شوانی خاوو خێزانیەتی و، لیّ پرسراوە لەژێر دەستەکەی، هەروەها دەفەرمویّ: "من أتاكم ــ وأمركم جمع على رجل واحد ــ يريد أن يشق عصاكم أو يفرق جماعتكم فاقتلوه. ومن خلع يدا من طاعة لقى الله يوم القيامة لاحجة له، ومن مات وليس في عنقه بيعة مات ميتة جاهلية". واتە:کەسیّ هات ــ لەکاتێکدا ئێوە کۆمەڵ بوون و یەك کەس ئەمیرتان بوو ــ ویستی هێزو دەسەڵاتتان بشکێنیّ، یان پەرەوازەتان بکات، ئەوە بیکوژن و، هەر کەسێك دەست لە "پەیمان" هەڵگریّ، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەخزمەت خوا دەگات و هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نییە....

ئەمە لەدیدی پێغەمبەرو سیمای پێغەمبەردا ئەوەندە مەسەلەی کاروباری "سەکردایەتی" گرنگە... ئەگەر دوای مردنی ئەویش سەیری موسڵمانەکان بکەین، دەبینین تەرمە پیرۆزەکەی هێشتا نەنێژراوە کەچی ئەمان باسی هەڵبژاردن و دیاری کردنی "حاکم و ئەمیر" دەکەن.

ئەمە مانای وایە پێغەمبەر (ﷺ) تێی گەیاندوون کە هیچ کات نابیّ بی سەرۆك و ئەمیر بن. ئەوەبوو دەستەیەکیان ڕێگەیان بۆ ناشتنی تەرمە پیرۆزەکەی پێغەمبەر گرتەبەرو دەستەیەکی تریشیان بۆ هەڵبژاردنی"خەلیفە" و پێشەوایان کۆبوونەوە، دوای وتووێژێکی درێژو، دوای ئەوەی کە بەیاسای "شوورا" و تەگبیرو ڕاوێژهەڵسان، موسڵمانەکان دەنگیان بۆ حەزرەتی "ئەبوبەکر" دا (خوا لێی ڕازی بێت) بە بەڵگەی ئەوە ئەو پێش ئەوان موسڵمان بووە و، پەیوەندیشی بە پێغەمبەرەوە لەوان زیاتر بووە و لە ئەشکەوتی "سەور" یشدا هاوڕێ ی بووە و هەروەها...

بەو شێوەیە موسڵمانەکان _ چونکە بەباشی تێگەیشتبوون _ قبووڵیان نەکرد بۆ ماوەیەکی کەمیش، بێ پێشەوابن، جار لەدوای جار خەلیفەو "ئەمیریان هەڵئەبژارد... تالەم دواییەدا بۆچوون و "بیردۆز" ەی موسڵمانەکان لاواز بووو و بێ سەرۆك وئەمیر پاڵیان لێ دایەوە _ وایان زانی کە تەنها نوێژ و حەج و... هتد تەواوی ئیسلامە _ بۆیە ئاوا بەش بەش بوون و بەشکران و هەر کیشوەرێك حاکمێکی پەسەندکراوی خۆرهەڵات، یا خۆرئاوای بۆ دانروا بێ ئاغاکەی پەنجە بە ئاودا ناکات !!!.

3) وتەی خەلیفەکان و زاناکان:

* حەزرەتی ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: "موحەمەد (ﷺ) کۆچی دوایی کرد دەبێ دوای ئەو یەکێ بە هەڵسوڕاندنی کاروباری ئەم ئایینە هەڵسێ".

* پێشەوا عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: "ئیسلام لەناو کۆمەڵدا نەبێت دەرناکەوێ، کۆمەڵیش بێ "کارگێڕ" پێك نایەت، کارگێڕیش بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری کردن نەبێت جێگیر نابێت. "لا إسلام بلا جماعة ولاجماعة بلامارة ولا إمارة بلا طاعة".

* زانای هەڵکەوتووی ئیسلام "ماوەردی" دەفەرموێ: "پەیمان دان بەوکەسەی هەڵئەسێ بە پیادەکردنی کاروباری ئایین واجبە واتە پێویستە بە "ئیجماع" ی زانایان پەیمان دان بەو کەسەی کاروباری ئایین جێ بەجێ دەکات، واجبە، واتە: پێویستە.

* پێشەوا "غەزالی" دەفەرموێ: "کاروباری دنیا وهێمنی و ئاسایشی گیان و سامان بەبێ دەسەلاتدار بەڕێوە ناچێ. بەلگەی ئەمەیش ئەو پشێوی و ئاژاوانەیە کە بەمردنی کاربەدەستەکان دروست ئەبن...".

* مامۆستای موجاهید و تێکۆشەر و فیداکاری ئیسلام "ئیبنی تەیمیە" دەفەرموێ: "یجب أن یعرف أن ولایة أمر الناس من أعظم واجبات الدین، بل لایقام الدین إلا بها، فإن بنی آدم لاتتم مصلحتهم إلا بالاجتماع لحاجة بعضهم الی بعض، ولابد لهم عند الاجتماع من رأس حتی قال النبي (ﷺ): "إذا خرج ثلاثة في سفر فلیؤمروا احدهم". واتە: سەرپەرستی کردن و چاودێری کردنی کاروباری مرۆڤەکان، لەگەورەترین پێویستیەکانی ئایینە، نەك هەرئەوەندە، بەڵکو ئایین بە "ولایە" و "خیلافە" نەبێت ڕاگیر نابێت، چونکە ئادەمیزادەکان بە کۆبوونەوەو پاڵ وێکدان نەبێت، بەرژەوەندییان تەواو نابێت، کاتێکیش کۆبوونەوە پێویستە "سەرۆك" یان ببێت، تەنانەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هەرکات سێ کەس بەلایەکدا ڕۆیشتن با کاروباریان بدەنە دەستی یەکێکیان.

پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆمەڵێکی کەمدا پێویستی کردووە یەکێکیان بکەن بە پێشەواو "ئەمیر" ی خۆیان... تا مرۆڤەکان لەمەوە فێر بین و تێ بگەن: کاتێ لەسەفەرێکدا "ئەمیر" پێویست بێ، دەبێ لەکارەکانی تردا باشتر هەوڵی بۆ بدەن..، ڕیوایەت کراوە: "ستون سنة مع إمام جائر اصلح من لیلة بلا سلطان". واتە (60) ساڵ ژیان بردنە سەر لەگەڵ پێشەوایەکی ستەمکاردا چاکترە لەوەی کە تەنها شەوێك بێ دەسەلاتدار و "سوڵتان" ژیان بەرێتە سەر.

* مامۆستای کۆمەڵناس (ئیبن خەلدوون) دەڵێت: "إن نصب الامام واجب قد عرف وجوبە فی الشرع بأجماع الصحابة و التابعین، لان اصحاب الرسول (ﷺ) عند وفاته بادروا الی بیعة ابی بکر (رضي الله عنه) والی تسلیم النظر الیه في أمورهم وکذا في کل عصر بعد ذلك، ولم یترك الناس الیفوضی في عصر من الاعصار، واستقر ذلك اجماعا دالا علی وجوب نصب الامام وقد نهب بعض الناس الی ان مدرك وجوبه العقل، وأن الاجماع الذی وقع إنما هو بقضاء العقل فیه"... بەو مانایە: دانانی پێشەوا (لەسەر موسڵمانان پێویستە) ئەمەیش بە "ئیجماعی هاوەڵان و شوێن کەوتوو)) مکانە، چونکە ئەوە بوو دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) دەست بەجێ هەڵمەتیان برد بۆ دانانی حەزرەتی ئەبوبەکر و کاروباری خۆیانیان دایە دەست، دوای ئەویش خەلیفەکانی تر دانران... ئینجا دوای ئەوان کافران زانیان کە ئیسلام بەرەو پێشکەوتن دەڕوات و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ

لەپەرەسەندندایە لەهەموو لایەکەوە هەوڵیان دا بۆ نەهێشتنی "خیلافەت" ی ئیسلام ولاوازکردنی لە ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵدا.

بەکورتی: ئایەتێکی زۆر هەیە کە بەڵگەن لەسەر دانانی دەوڵەتێك لەسەر بنەماکانی ئیسلام و، بۆ ئەوەی کە ئیسلام دەوڵەتی هەبووە ماوەیەکی زۆر، ئەمەش هەندێکی ترە لە ئایەتەکانی قورئان:

أ / ﴿ وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا إن الله لايحب المعتدين ﴾ واتە: بجەنگێن لەڕێگەی خوادا لەگەڵ ئەوانەدا جەنگتان لەگەڵ دەکەن و، دەستدرێژی و زیادەڕەویی مەکەن، چونکە خوا دەست درێژی کەرانی خۆش ناوێت.

دەی، ئەگەر موسڵمانان سەرۆك وپێشەوا و سەرکردەیەکیان نەبێت بۆ ئامادەکردنی سەربازو سوپاوچەك، چۆن جەنگ لەگەڵ ستەمکارو ناپاکدا دەکرێ لە کاتێکدا ئەو یاساو ڕژێمێکی ببێ؟!.

ب / ﴿ واعدوا لهم مااستطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم.. ﴾ ئەم ئایەتە داوای ئامادەکردنی هەموو جۆرە هێزو دەسەڵاتێك دەکات بۆ ترساندنی دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆیان... دەی، ڕێگە بۆ ئەم ئامادەکرنە کامەیە، ئەگەر یاسایەك و دەستەیەك نەبێت بۆ هەڵسووڕاندنی ئەم کارە؟!!.

ج / ﴿ ولكم في القصاص حياة يا أولي الالباب.. ﴾ خوای گەورە لەم ئایەتەدا داوای هەق وەرگرتنەوەمان لێ دەکات لە مرۆڤ کوشتن و هەموو جۆرە دەست درێژییەکی تر.. واتە: هەرکات کەسێك کوژرا ئەوە پێویستە _ بۆ دامەزراندنی تەرازووی دادگەریی _ تۆڵەی لێ وەربگیرێتەوە، (بەکوشتن بێت، یا خوێنی لێ وەربگیرێ بۆ کەس و کاری کوژراو)، دیسانەوە ئەگەر دەوڵەتێك نەبێت هەڵسێ بەسەرپەرشتی ئەم کارە، کێ بێ بتوانێ ئەم ئیشە بکات و ڕێگە لە پشێوی پتر بگرێت لە وڵاتدا...؟!

بەکورتی: ئەگەر دەوڵەتێك نەبێت، بەشێوەیەکی گشتی دەرگای تۆڵە وەرگرتنەوە دادەخرێ.

**سەربەخۆیی یاسای ئیسلامیی:**

هەرکەسێك سەرنجێکی ورد بدات بە ڕۆشنی بۆی دەردەکەوێ کەڕژێمی سیاسی لە ئیسلامدا، ڕژێمێکی سەربەخۆیەو هیچ پەیوەندیی بە زاراوە سیاسییەکانی تری جیهانەوە نییە.. واتە: زاراوەی ئیسلامیی، جیاوازی تەواوی لەگەڵ زاراوە دەستکردەکان هەیە، کەوابوو ناوبردنی ئیسلام بەهەندێك لەو ناوانەی کە ئەمڕۆ بۆ هەندێك کۆڕو کۆمەڵ کراون بەزاراوە، دروست نییە وەك "دیموکراتییەت، سۆشیالسیتی، سەرمایەداریی، ئیمپراتۆرییەت"، ئەمانە زیاتر لەلایەن ئەوانەوە بەکاردێن کە ئیسلامیان خۆش دەوێ و دەیانەوێ وا ڕیزو پلەی بخەنە دڵی کۆمەڵەوە !!. هەروەها هەندێ زاراوەی تریش هەن لەلایەن ناحەزانی ئیسلامەوە بەکاردێن، وەك ناونانی ئیسلام بەدەوڵەتی "ثیووقراتیی"، "دەوڵەتی پیاوە ئایینەکان... هتد"، با هەردوولا بزانن کە ئەو زاراوانە نارێك و نادروستن بۆ ئیسلام، چونکە ئیسلام پێویست ناکات بۆ بەرزکردنەوەی شانی، ئەوناوانەی لێ بنرێ، نەخێر ئیسلام خۆی خاوەنی ڕژێمێکی بێ وێنەیە، یاساو پرۆگرامی جیاوازی هەیە، بەهیچ لایەك ناچێ، خۆ ئەگەر ڕێك کەوت یاسای ئیسلام لەگەڵ هەندێك خاڵی چەند ڕێبازێکی تری وەکو "دیموکراسی" دا یەکی گرتەوە، ئەو مانای وانییە ئیتر ئیسلام لەگەڵ "دیموکراتیەت" دا یەکە، چونکە دیموکراسی زۆر شتی هەیە کە لەگەڵ ڕێبازەکانی ئیسلامدا ناگونجێت، ئەمەیش لەبەر ئەمەیە ئەم تێڕوانینی تایبەتی خۆی هەیە دەربارەی گەردوون.

ئەمە لە ڕووی دیموکراتییەوە، خۆ ئەگەر لەگەڵ سۆشیالیزمیشدا هەڵی سەنگێنین دیسان هەر ناگونجێت، چونکە سۆشیالستی بەڕێگەیەکی تایبەتی خۆیدا ئەڕوات.

بەکورتیی: هەر زاراوەیەك لەدەرەوەی ئیسلامدا بەکاربهێنرێت، ئەوە بە باڵای ئیسلام ناکات، چونکە ئەو ناوو زاراوە لەدۆخێکەوە دەستی پێ کردووە وردە وردە لەژێر ڕژێمی سیاسیدا پەرەی سەندووە تا گەیشتۆتە ئەو پلەیە، بۆ نموونە:

دیموکراسی بۆ یەکەم جار یۆنانییەکان لەفەرهەنگی"سیاسیدا" بەکاریان هێنا بەمانای حوکمی گەل، مەبەستیان ئەوە بوو کە "گەل" خۆی یاسا بۆ خۆی دابنێ و هەرخۆیشی حوکمی خۆی بکات. واتە: یۆنانییەکان _ ئەولنەی لە بنچینەدا خەڵکی ئەوێن _ حوکمی وڵات بکەن نەك ئەولنەی لە بناغەدا خەڵکی ئەوێ نین، ئەوانە بە هیچ شێوەیەك بۆیان نییە کاروباری وڵات بگرنە ژێر دەست بازۆر لەوان زانا تریش بن ! !.

دەی بەم شێوەیە و بەم مانایە بەکارهێنانی بۆ ئیسلام ناڕەوایە و نادروستە، چونکە لە ئیسلامدا بەرنامە دەبێ بەپێی نەخشەی خوای گەورە بێت، نەك بەپێی نەخشەی گەل و گەل دای بنێت. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە هەرکەسێك سیفەتی سەرکردایەتی و پێشەوایەتی تێدابێت _ ئیتر زمان و ڕەگەزی هەرچی بێت _ ئیسلام دەیکات بەسەرکردەی وڵات و کاروباری وڵاتی دەخاتە بەردەست.

ئەمە وشەی "دیموکراسی" لە بنچینەدا وا هاتووە و ماناکەشی ئاوایە. خۆ ئەگەر "دیموکراسی" بریتی بێت لە یەکسانی گەل و کۆمەڵ لەمافدا، ئەوە دەڵێین تەنها ئیسلام "دیموکراسی" ی تێدایە [1] چونکە بەڕاستی یەکسانی ڕاستەقینە هەر لەئیسلامدایە، هەروەها بەکارهێنانی وشەی "ئیشتراکیە _ سۆشیالیزم" بۆ ئیسلام بەهەمان شێوەیە. واتە: ئەگەر مەبەست بەوشەی سوشیالیزمی ئەوە بێت کە ئیسلام لە مافدا هیچ تاکێك، هیچ چینێك لەوانی تر جیا ناکاتەوە، یان ئیسلام بەیەك چاو سەیری هاو وڵاتیان دەکات لەمافدا، لە ژیاندا، وەیان ئەگەر مەبەست ئەوە بێت کە ئیسلام باوی هیچ کەسێك بەسەر کەسی تردا نادات...، ئەوە ئیسلام "سۆشیالیستە". خۆ ئەگەر مەبەست ئەوە بێت کە ئیسلام ڕژێمێکی سوشیالیزمی یە، ئەمە بەهیچ شێوەیك بەکارهێنانی بۆ ئیسلام دروست نییە، چونکە سوشیالیزمی بە شێوەیەکی "مادی" سەیری ژیان دەکات، فەلسەفەو بۆچوونی لەسەر نەخشەی ماتریالیزمی دەڕوا.

هەروەها ئیشتراکی تێڕوانینی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئابووری کە زۆر زۆر جیاوازیی لەگەڵ ڕژێمی ئابووری ئیسلامدا هەیە.

دوای ئەمانە پێویستی سەرشانمانە ڕوونی بکەینەوە: ئایا وشەی "ثیووقراتی" کە هەندێك نووسەر بەکاری ئەهێنن، بەکارهێنانی بۆ ئیسلام دروستە؟

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەم وشەیە سەبارەت بە شێوەی حوکم لە ئیسلامدا لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێ ، با لەگەڵ هەندێك ڕێبازیشیدا بگونجێ، چونکە ئەگەر مەبەست لەم وشەیە ئەوە بێت کە لەیاسای خوای گەورەوە یاسای سیاسی وەربگرێ، ئەوە دیارە کە ئیسلام ئاوایەو، ڕەوایە پێی بگوترێ "ثیوقراتی"، خۆ ئەگەر مەبەستیش ئەوەبێت کەلە "ئەوروپا" دا باوە و بەناوی خواوە بڕیار دەرئەکەن ئەوە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێ و دروستیش نییە پێی بگوترێ "ثیوقراتی"، چونکە ئەم وشەیە لە ئەورووپادا بۆ ئەو چین و تاقمەی کە بەناوی ئایینەوە قاچیان بەسەرکۆمەڵدا ڕاکێشاوە و حوکمڕانی دەکەن بەناوی ئایینەوە و خۆیان ناوناوە "پیاوەکانی ئایین = رجال الدين" وە هیچ کەسێکیش بۆی نییە سەرپێچیان لێ بکات بەتایبەت "پاپا" ! ! ! ئاشکرایە ئا بەم شێوەیە لە ئیسلامدا "ثیوقراتی"یەت دەسەت ناکەوێ، ئەگەر لە ئیسلامیشدا چینێك هەبن پێیان بگوترێ زانایانی ئایین، ئەمە لەو ڕووەوە نییە کە بتوانن قسەی خۆیان بەسەر کۆمەڵدا بسەپێنن و خەیاڵ و ئەندێشەی خۆیان بکەن بە یاسا، نەخێر، بەڵکو ئەمە کۆمەڵگە دروستی کردوون و ناوی تایبەتیان لێناون، هۆکەیشی ئەوەیە کە ئەو کەسانە لە خەڵکی کۆمەڵگەکەی خۆیان زیاتر لە ئاییندا ڕۆچوون وشارەزاترن، وەك چۆن کەسێك لەزانیاری ئەندازەدا شارەزا بێ پێی ئەڵێن "ئەندازیار".

ئەو شێوەی ئەوروپا (حوکمکردن بەناوی خواوە) پاڵی بەکۆمەڵگەوە نا داوای جیاکردنەوەی ئایین لەدەوڵەت بکەن، چونکە پیاوە ئایینییەکانیان هیچ کەسێك بۆی نەبوو ڕەخنەیان لێ بگرێ و چاودێریان بکات..، بەڵام هیچ کات ئیسلام

[1]) منهاج الإسلام في الحكم / محمد اسد .

ئەوەی بەخۆیەوە نەبینیوە ، کەوابوو هەرکات داوای حوکمیئیسلامیی کرا، ئەوە داوای حوکمی بەرنامەی خوا و پیادەکردنی ئەو بەرنامە دەکریٚ نەك وتەی "پیاوەکان ئایین"، چونکە هەرکەسێك ئەو لێهاتنەی تێدا بەدی کرا و بەتەواوی ملکەچی فەرمانەکانی خوا بوو، ئەوە ئەوکەسە دەکریٚ بە پێشەوا و "خەلیفە" ی موسڵمانان وئیتر ئەندازیار بێت، مامۆستا بێت، ئەفسەر بێت... کەوابوو پێویستە لەسەر نووسەرانی ئیسلام بەتایبەتی و گشت ڕۆڵەکانی ئیسلام بیٚ جیاوازیی "ئیسلام بەوشەی ئیسلام" بەمرۆڤەکان بناسێنن، چونکە خوای گەورە ناوی ناوە "ئیسلام"... دیارە تەنها خوا لە هەمووکەسیٚ چاکتر دەزانیٚ، بۆیە بەو ناوەوە خەلاتی ئێمەی کرد، چونکە ئەم ناوە _ ئیسلام _ مانای یەکسانی و یارمەتی ی هاو ولاتیان نیشان دەدات، کەس زیان لەکەس نادات و، کەس مافی کەس زەوت ناکات.

**بناغەکانی حوکم لە ئیسلامدا:**

ئاشکرایە هەموو جۆرە حوکمێکی ئیسلامیی ــ وەك ڕژێمی سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئابووری ــ بناغەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، ئینجا لەو بناغەوە ڕچەی "فیکریی وفەلسەفە" یش پەیدا دەبێت.

1) بنەما فیکرییەکان:

بێگومانم کە هەموو ڕژێمێکی سیاسی، فەلسەفەو تێڕوانینێکی تایبەتی خۆی هەیە و لەو فەلسەفەوە سەیری بوونەوەرو مرۆڤ و ژیان دەکات، با بۆ نموونە زۆر بەکورتی "بنەما فیکرییەکانی مارکسیزم" باس بکەین، ئەوجا بڕۆینەوە سەرباسەکەی خۆمان.

مارکسیزم وانەخشەی بۆ خۆی کێشاوە کە بڕوای بەدروستکەری بوونەوەر نییە، بڕوای نییە کە خولیەك هەیە هەڵدەستێ بەئاڵوگۆڕی بوونەوەرو دەستکاری دەکات! ! بەڵکو بە چاوێکی مادییەوە سەیری بوونەوەر ئەکات و بەلایەوە وایە کە "تطور" و گەشەی ماددی بناغەیە بۆ هەموو ئاڵ و گۆڕێکی ژیان، تەنانەت هەرولیش مانای گۆڕانی بیریی "تغیر فکری" دەکەن! !.

أ / پەیدابوونی مارکسیزم:

"کارل مارکس" ی جوولەکە ساڵی "1818" لەشاری "ریفز" لە "ئەڵمانیا" لە دایك بووە لە ساڵی "1883" ی زاینیدا لە "ئینگلتەرە" مردووە، بناغەی مارکسیزمی دامەزراند و لە ساڵی "1847" دا بێ پێچ و پەنا تیوورو ڕاکانی خۆی خستە ڕوو، ئەویش دوای ئەوەی کە دڵنیا بوو لەڕووخانی ڕژێمی سەرمایەداریی و ئەمەی بۆ ڕێ خۆش کردنی فریودانی چینی کرێکار و هەژارەکان بەهەل زانی بۆ ئەوەی بیانخاتە دوای خۆی... وە بە ئاشکرا ئەمەی تۆمار کرد بەناوی مانیفێستی کۆمۆنیزم".

ب / بۆچی "مارکس" کۆمۆنیزمی هەڵبژارد؟ و بۆچی ڕقی لە دەوڵەمەندەکان هەڵگرت؟

هەرکەسێك بەوردی سەیرێکی ژیانی مارکس بکات بۆی دەرئەکەوێ بۆچی کۆمۆنیزمی بۆ ژیانی خۆی هەڵبژارد و، خەڵکیشی بۆ بانگ کرد...

1) مارکس ساڵی "1836" خوازبێنی کچێکی کرد کە لە بنەماڵەیەکی "ئورستوقراتی" بوو، هێشتا ئەم بنەماڵەیە نەیان ناسیی بوو، کاتێ ناسیان کچەکەیان نەدایە، لەبەر نزمی ئاستی "چینایەتی" مارکس ! ! ئەمە زۆر تێبنی کردە سەر مارکس و بوو بەهۆی ئەوەی ڕقێکی فراوانی لەکۆمەڵی دەوڵەمەندەکان هەڵگرێ.

2) ساڵی (1835) لە "بۆن" دا ڕێی کەوتە "یانەی شاعیران"، بینی لەوێ زۆربەی دەوڵەمەندەکان کۆبوونەوتەوە، کردی بە شیرێکدا بۆیان ئەوانیش نەیانکردە نامەردیی یەکێکیان لێی هەڵپەڕیوو "برۆو ناوچەوانی" بریندار کرد... بەڵێ ئەم جمو جۆڵە پتر دەروونی مارکسی پڕ کرد لە ڕق و کینە و دەستی کرد بە دژایەتی کردنی دەوڵەمەندەکان.

3) دەست کورتی و هەژاری ئەوخێزانەی مارکسی لێ کەوتبوویەوە.. ئەم هەژارییە وای لێکرد کە بە ئاشکرا هێرش بباتە سەر دەوڵەمەندەکان، لە تاو هەژاری ئەم وتەی "شکسپیر" بوو بووە وردی سەر زاری و هەر دەیوتەوە : "ئەی زێڕ.. ئەی زێڕ.. ئەی زێڕی بەنرخی بریقەدار.. سپی دەکەیت بە ڕەش، ناشرین ئەگێڕی بە جوان، خراپە دادەنێت بەچاکە، پیر دەگێڕی بەلاو، ترسنۆك بە پاڵەوان ...."

ئەمە لەلایەکەوە.. لەلایەکی تریشەوە زوڵم و زۆری دەرەبەگەکان وچەوساندنەوەی جوتیارەکان لەلایەن دەرەبەگەکانەوە پاڵی بە زۆربەی هەژارو جوتیارەکانەوە نا کە لە شوێنە نادیارەکانی ئەوروپادا خۆیان بشارنەوە، یا ڕووبکەنە چەم و دۆڵەکانی "سیبریا"، خراپتر لەهەموو کڵێسا پشتی دەرەبەگەکانی دەگرت ! ! ئیتر مارکس لەوەوە ڕقی لەهەموو ئایینێکی ئاسمانی هەڵگرت و وای زانی ئەمە لەلایەن خواوە هاتووە کە کۆمەڵێ دەست بەسەر بەرووبوومی وڵاتدا

بگرن و ئەوانی تریشیان تۆکەرو ڕەنجبەری ئەوان بن ! ! ! بۆیە خەڵکێکی زۆر دوای کەوتن و چەپەڵەیان بۆ لێدەدا، ئێستایش داوای مانەوەی ڕێبازەکەی دەکەن، چونکە وا دەزانن لە ئیسلامیشدا دەرەبەگایەتی هەیە و تا قیامەتیش هەر دەبێ ئاغابێ ! بەڵام ئەمە بەهیچ شێوەیەك ڕاست نییە، چونکە ئیسلام بۆ یەکسان کردنی ژیانی کۆمەڵ پێش هەموو کەسێك کەوتووە، بەڵام بە شێوەیەکیش لە شێوەکانی ڕێزی خاوەنایەتی تاکەکەس ئەگرێت [1] .

## کۆمۆنیزمی دان بە نادیاردا نانێت :

مارکسیزم بە جۆرێ ماددەو بونەوەرو مرۆڤ و ژیان هەڵدەسەنگێنێ، کە بەهیچ شێوەیەك دان بە نادیاردا نانێت، وەك "ڕۆح و بەهەشت و دۆزەخ وحیساب و سزاو پەری و فریشتە" ! ! بەڵگەیشمان ئەمانەن:

* مارکس دەڵێت: "هیچ خوایەك نییە و ژیانیش ماددەیە".

* لینین لە ساڵی (1913) دا وتی: "ئەمە کە دەڵێن خوایەك بوونەوەری ڕێکخستووە، ڕاست نییە، بەڵکو وشەی "خوا = الله" بیرێکی ئەفسانەیی یەو، مرۆڤە بێ دەسەڵاتەکان دایان هێناوە" کەوابوولینین دەڵێت هەرکەسێك هەوڵ بدات بۆ سەرخستنی وشەی "خوا" ئەوە مرۆڤێکی بێ دەسەڵاتە و، بێجگە لەوە نەفامیشە ! !.

* لە وتارێکی لینیندا ـ کە لەساڵی (1913) دا لە کۆنگرەی ڕووسیدا خوێندوویەتی یەوە هاتووە دەڵێت: "پێویستە لاوەکان بە خۆڕەوشتی کۆمۆنیزمی پەروەردە بکرێن، بەڵام ئەم ڕەوشتە لە ئایینی خواییەوە وەرنەگیراوە، چونکە ئێمە بڕوامان بەخوا نییە" ! ! !

* لینین دەڵێت: بیری ئایینی و هەر بڕوا بە خوا بوونێك.. "تەنانەت هەر بیرکرنەوەیەك لە بوونی خوا" ئەوە خوویەکی نزمی پەستە لەدەروونداً.

* ڕۆژنامەی "پراڤدا" ساڵی (1954) بڵاوی کردەوە کە: "بڕوا بوون بە خوا کەلەپووری پێشینە نەفامەکانە" ! ! !.

* وە لەساڵی (1958) هەمان ڕۆژنامە گووتی: "بەڕاستی ئەرکی سەرشانمانە هەڵمەتێکی عەقیدەیی ڕاستەقینە بەرینە سەر ئایین.

* لە 3/ 4 / 1958 دا ئێزگەی مۆسکۆ بڵاووی کردەوە: "ئایینەکان هەموو لە پڕوو پوچی و ناڕەواییدا وەك یەکن

* ڕۆژنامەی "تورکمانسکایا" لە 1 / 12 / 1958 دا بڵاوی کردەوە کە: ((ئایینی ئیسلام هێزێکی ڕەشی ستەمکارەو ژێری گەندەڵ ئەکات و ژیانی گەل تێك ئەدات، لە ڕێگەی بەختیاری و ڕووناکیدا دەوستێ و، ئەم دروشمە ئایینیانە لە کۆڵ کۆمەڵ نابنەوە و هەر تلیاکن بۆ هەندێ مرۆڤ و سڕیان دەکەن و، لە پێشکەوتنیان دەخەن".

* "باکنسکی بابوشی" لە 17 / 12 / 1958 دا گوتی: "لو کان الله موجودا لما سمح ان تنبذ الدین" واتە: ئەگەر خوا هەبوایە نەیدەهێشت ئێمە ئایین فڕێ بدەین" ! ! !.

* ڕۆژنامەی "ئالای سوور" ڕۆژی 1 / 3 / 1959 دا بڵاوی کردەوە: "زۆرانبازی نێوان بێ باوەڕی و بڕوا بوون بەخوا شتێکی سروشتییەو هێشتا کۆتایی نەهاتووە و پێویستە جەماوەر ڕێو شوێنی بۆ دابنرێ بۆدەرهێنانی بن وبێخەکانی باوەڕبوون بە ئەفسانە وجنۆکە و خواکان، بە شێوەیەکی قووڵ تر لە جاران.

* لە کۆنگرەی شەشەمی کۆمۆنیزمی نێو نەتەوەیدا ساڵی 1928، ئەم بڕیارە درا: "جەنگ دژی ئایین ـ تلیاکی گەل ـ شوێنەوارێکی گرنگی گەورەی هەیە لەنێو ئیشەکانی شۆڕشی ڕۆشنبیری دا، دەبێ بێ وچان و، بە شێوەیەکی ڕێکخراوی، ئەم هەوڵە بدرێت"

ئەمانە و سەدان وتەی تری ناشیرینی بێ جێی مارکس و مارکسستەکان کە مەگەر تەنها هەرئەوان بیڵێن، ئەگینا هیچ کەسێك ـ بێ شەرمی ئاوای نەکردووە ـ بۆیە زۆر زۆر بە توندو تیژی بەرهەڵستی موسڵمانەکان دەکەن و ئەشکەنجەو

---

[1] ) بۆ ئەم مەبەستە سەرێك لە کتێبی سەربەستی لە ئیسلامدا بدە.

ئازاریان دەدەن و هەوڵ دەدەن لە ئیسلام پاشگەزیان بکەنەوە... تەنانەت هەزاران مزگەوتیان ڕووخاندن !! هەزاران کەسیان لە سێدارە دا.. هەزارانیان لە بەستەڵەکەکانی "سیبریا" دا بێ سەروشوێن کرد.

خۆ ئەگەر ئەمە لەبیر چووبێتەوە، هێرشە بێ ویژدانەکەیان بۆ سەر شاری "خۆقند" لە ساڵی "1917" دا هەرگیز لەبیر ناچێتەوە. هۆکەشی ئەمە بوو.. موسڵمانەکانی "تورکستان" داوای "ئۆتۆنۆمی" یان دەکرد، داوای مافی خۆیانیان دەکرد، داوای ئازادیان دەکرد، دوای ئەوە، هەرئەوەندەیان زانی سەربازی دڕندەی بێ ویژدان هاتە سەریان وهەزارانی لێ شەهید کردن، ماڵەکانیان بەسەردا ڕووخاندن، هەرچی دارایی و سامانیان بوو دەستیان بەسەردا گرت و قاتی و قڕیش _ دوای ئەوە کەوتە ناویانەوە _ بەهۆی ئەوەیشەوە ژمارەیەکی زۆریان لێ مردن.

هەندێ سەرچاوەی ڕەسمی دەڵێ: ژمارەی ئەو موسڵمانانەی کە "ڕووس" کوشتونی لەنێوان ساڵی 1917 _ 1918 دەگەنە ملیۆنێك [1].

خوێنەری بەڕێز: ئەمە بوو تیۆرو تێڕوانینەکانی مارکسستەکان دەربارەی بوونەوەر، دەربارەی دروستکەری بوونەوەر، دەربارەی نادیاری بەگشتی و دەربارەی ڕای بەرانبەر بەوان !

ئیتر هیوا دارم ئەوانەی کە تائێستا لە مارکسیزم تێنەگەیشتوون، لەمەولا تێبگەن و بزانن: مارکسیزم لەگەڵ هیچ ئایینێکی ئاسمانیدا ناگونجێ، چونکەن بەلایەوە وایە کە لەبوونەوەردا تەنها "ماددە" هەیە و، بێجگە لەو هیچی تر نییە، ئەم ماددەیەش هەربووە و هەر دەشمێنێ و لە نێو ناچێت و ئەو ئاڵ وگۆڕەی لەم بوونەوەرەدا بەدی دەکرێت لە یاسای جموجووڵی ماددەوە پەیدا بووە... نەك لە شتێکی ترەوە !!

ئەوە بوو لە نامیلکەیەکدا بەناوی "وتەی زانایان و باوەڕ بەخوا" وە هەندێ لە وتەو ڕای کۆمەڵێ زانا هەمە جۆرەکانمان هێنابۆ پشتگیری و سەلماندنی ئەوەی کە ئەم بوونەوەرە پڕ لەیاسای سەرسوڕهێنەرە لەخۆیەوە نەبووە، بەڵکو دەبێت بەدیهێنەرێکی ببێ و ئەوی لە "نەبوون"ەوە هێنابێتە خانەی بوونەوە.

سەبارەت بەو وتەیەی دوو (سینی) هەیە دەڵێن _گوایا جیهان هەربووە و هەر دەشمێنێ _ وتەی ئەم زانایانە دەخەینە پێش چاو:

1) جۆرج هوپرت بلۆنەت _ گەورەی ئەندازیارەکان لەبەشی توێژینەوەی ئەندازەدا لە زانکۆی "کالیفۆرنینا" دەڵێت: "بەڵگە گەردوونیەکان ڕۆشنیان کردۆتەوە کە ئەم جیهانە لە ئاڵ و گۆڕدایە، [2] کەوابوو بێ سەرەتاو نەبڕاوە _ ئەزەلی و ئەبەدی _ نییە".

2) ئوسکار لیوپرایرنرا _ مامۆستای "فەلسەفە" لە دانشگای "کالیفۆرنیا" دا دەڵێت: قەبارە ئاسمانییەکان دووگریمان هەڵدەگرن:

أ / هەرهەبوون و سەرەتایان نییە.

ب / تازەن و دروست کراون.

ئینجا لەڕووی زاناyارییەوە هەردوو گریمانەکە لە بێژنگ دەداو دەڵێت: گریمان یەکەم _ کە هەرهەبوون و سەرەتایان نییە _ لە ڕووی زانیارییەوە پووچەڵ وبێ ناوەڕۆکە، چونکە ماددە لە ئاڵ و گۆڕدایە.

---

[1]) حقیقة الشیوعیة لاپەڕە 186 _ 198 .

[2]) هەرچیش _ بەپێی زانیاری مەنتیق لە ئاڵوگۆڕدا بێ ئەوە تازەیەو بێ سەرەتا نییە، کەوابوو _ لە ئەنجامدا _ ئەم جیهانەیش تازەیەو، بێ سەرەتا نییە. ئەمەیش قیاسە مەنتیقییەکەیە: (العالم متغیر ، وکل متغیر حادث فالعالم حادث) .

3) "جون كيفلاند كوثران _ سەرۆكی بەشی زانیارییە سروشتی یەكان لە زانكۆ "دولت" دا" دەڵێت: بەڵگەی كیمیاویی و نا كیمیاویی وا دەردەبڕن كە سەرەتای ماددە هێواش هێواش و لەسەرخۆ پەیدا نەبووە، بەڵكو كوتوپڕ دروست بووەو، ئێستا زانیاری دەتوانێ و دەسەڵاتی هەیە سەرەتاكەی دیاری بكات، كەوابوو جیهانی ماددی دەبێ دروست كراوبێت" [1].

بەڵێ كۆمۆنیزمی هەروەك دژی عەقیدەو بیروباوەڕە بەهەموو ئایینێكی ئاسمانی، هەروایش دژی نیشتمانەو دان بە "نیشتمان" دانانێت.

ڕاپۆرتێكی كۆمۆنیزمی دەڵێت: "كرێكار نیشتمانی نییە _ ئەی هەژارەكانی جیهان یەك بگرن".

ستالین ساڵی 1924 دا "موحازەرە" یەكیدا گوتی: "پێویستی سەرشانی كۆمۆنیستە لە هەموو دۆخێكدا تێ بكۆشێ دژی نیشتمان پەروەریی تەنگ و بەر تەسك" [2].

بەڵێ، "كۆمۆنیزمی" هەوڵ دەدات بۆ ڕووخاندنی ئایین، چونكە بەلایەوە ئایین قەڵایەكی پۆڵایینە بۆ پاراستنی ڕەوشت و "بەهاكان"، ئایین ناهێڵێ "ئامانجە" سەرەكییەكانیان بێنەجێ، ئەویش كە بەرەڵایی و داوێن پیسی و بێ ڕەوشتی یە !! لە ڕاستیدا ئامانجیان تەنها ئەمەیە ئیتر با خۆیشیان بڵێن وانییە.. با وا دابنێین كۆمۆنیزم دژی ئایین نەوستاوە و لە "یەكێتی سۆڤیەت" ئەوپەڕی ئازادیی ئایین هەیە... ئەوەتا "صوت الاحرار" ژمارە "125" ی 19 / 5 / 1959 بڵاوی كردەوە كە: ئاییندارى لە "ڕووس" دا ئازادە. ئەوان وا دەڵێن! ! بەڵام بەدەمیان بەڵگە هەیە بۆ سەلماندنی ئەم داوایەمان، جا بۆ نموونە:

1) دەستوری یەكێتی سۆڤیەت ماددە "122" ژمارە "30" ی ساڵی "1929" دەڵێ: "هەركەسێك لە قوتابخانەكاندا، باسی ئایین بۆ منداڵان بكات.. ساڵێك، یا زیاتر دەكرێتە بەندیخانەوە".

هەروەها ماددە "353" دەڵێت: "هەموو جۆرە ئامۆژگارییەكانی ئایین _ ئیتر هەرچۆن بێت _ نابێت باس بكرێن لە تەواوی دام ودەزگاكاندا، جا میری بن، وەیا سۆشیالیستی بن، یا هەر تایبەتی بن".

2) (میكو) یان پیاوی دووەمی "كرملین" هێزی لای ڕاستی "خرۆشۆف" دەڵێت: "باوكێكی دارتاشم هەبوو، زۆر هەوڵی دەدا من ببم بە "قەشە" و، هەموو ژیانم لە خزمەتگوزاری "خوا" دا تەواو بكەم، بەڵام من كاتێك بڕوانامەم بەدەست هێنا تەماشا دەكەم ناتوانم بڕوام بەخوا ببێ..." [3].

3) ماركسیستەكانی عێراق _ لەبەرچاو بەستی موسڵمانان _ كاتێ یەكێكیان لێ بمردایە ئەم ڕەستەیان بۆ بەكار دەهێنا "خوا بە بەزەییە فراوانەكەی دایپۆشێ. بەڵام كاتێ زانیان ئەمە لەگەڵ ڕێبازی پارتەكەیاندا ناگونجێت و، هەندێ كەس لێیان دەسڵەمێتەوە _ بەتایبەت وڵاتە سۆشیالیستەكان _ هەڵسان بڕیارێكی نهێنیان دەركرد لەوپەڕی پلەی نهێنیداو بڵاویان كردەوە كە نابێ ڕستەیەك بێ ناوی خوای تێدا بێ "چونكە ئەوان دان بەخوادا نانێن ! !".

ئەمەیش دەقی ئەو بەڵگەنامەیە :

أمر إداري سرى ومهم للغاية

العدد / س _ ن _ 417 _ 59

التاريخ/11/ 3/ 1959

---

[1] ) الماركسية والعالم والفلسفة ل27 _ 28 جواد الخالصی .

[2] ) الدولة القانونية والنظام السياسي الاسلامي من ص 238 _ 200 للشوری .

[3] ) مجلة المصور ژمارە 1785 لە 2ی كانونی دووەمی ساڵی 1959 .

لقد رأينا في الآونة الأخيرة أن مكاتب بعض النقابات عند ماتنعي أحد الرفاق على صفحات الجرائد تذكر جملة "تغمدة الله برحمته الواسعة" أوما شاكل ذلك مع جمل الاساطير والخرافات الرجعية التى لا تتفق مع تقاليد الحزب و معتقداته كما تعلمون، لذلك نود ان نلفت نظركم الى هذا راجين أن تكتفوا عند كتابة النعى بجملة "راجين له ولرفاقه العزاء والسلوان" [1].

سكرتارية اللجنة المركزية.

للحزب الشيوعى العراقى.

* خوێنەری بەڕێز:

ماركسيستەكان هەرچی تيۆريان هەيە، لەسەرئەم بناغەيە داى دەنێن و لق وپۆپى لێدەكەنەوە، واتە: لەسەربناغەی بێ خوايی، گوايا ئەم زەوی و ئاسمان و... هتد لە خۆيەوە بووە و، هەر لەخۆيەوە ڕاوەستاوە !! كەوابوو سيستمی ئابووريان لەسەر بێ خوداييە، فەلسەفەيان لەسەر بێ خوداييە، شۆڕش و سياسەتيان لەسەر بێ خودايی يە، دەی هەركەسێكيش بڕوای بە هەركامێكيان ببێت پێی كافر دەبێت.

ئاواتە خوازم لە خوای گەورە و بەدەسەڵات دڵی هەموولايەكمان ڕۆشن بكاتەوە و وامان لێ بكات لە سياسەتی ئيسلامييەوە سەيری گەردون و ژيان و مرۆڤ بكەين.

جا با ئيتر بڕۆينە سەر باسەكەی خۆمان: "بناغەكان حوكم لە ئيسلامدا".

2) بناغە كردارييەكان: بە دلخەوە مامۆستا بنەما فيكری و نەزەرييەكانی سيستمی حكمڕانی ئيسلامی لێرەدا جێهێلاوە و مەرگيش فرسەتی نەدا كە چاوی پێدا بخشێنێتەوە، با بۆ ئەوباسە سەيری كتێبی ژمارە (18) پرۆژەی تيشك بكرێت

گرنگترينی بناغە كردارييەكان لە ئيسلامدا ئەمانەی خوارەوەن:

1) بنەمای ڕاوێژ "شوورا" و ياسادانان "السلطة التشريعية"
2) دەسەڵاتی پيادەكردن."السلطة التنفذية"
3) دەسەڵاتی داوەريی. "السلطة القضائية"
4) دەسەڵاتی دارايی. "السطة المالية "
5) دەسەڵاتی چاودێريكردن. "السلطة المراقبة"

جا وا پشت بەخوای گەورە يەك لە دوای يەك درێژەيان پێ دەدەين:

**يەكەم: ڕاوێژ ( شوورا )** [2]

ئيسلامی پيرۆز زۆر گرنگی بە بنەمای "شوورا" داوە: ئەوەتا خوای گەورە بێ پێچ و پەنا فەرمان بە پێغەمبەر (ﷺ) دەكات كە لەهەندێ كاروباردا تەگبيرو ڕاوێژ بە موسڵمانەكان بكات. خوا دەفەرموێ: ﴿ وشاورهم في الامر فإنا عزمت فتوكل على الله ﴾ [3] واتە: ڕاوێژيان پێ بكە لە كاروباردا، جا كە دڵت جێگير بوو لەسەر بارێك ئينجا پشت بە خوا ببەستە و پيادەی بكە. لەمەيش زياتر، خوا "شوورا" ی كردوە بە سيفەتێكی نەپچڕاو بۆ ئەو موسڵمانانەی بەدەنگ فەرمانی ئەوەوە دەچن:

---

[1] ) هزيمة الشيوعية ص 90 .

[2] ) بناغەی پەيوەنديیە لەنێوان كۆمەڵگە و فەرماندەدا و، بنچينەی گوێڕايەڵی لەلايەن كۆمەڵەوە بۆ (حاكم) و فەرماندەر، دادگەريش بۆ ئەم ڕاوێژە گەورەترين مەرجە، واتە شوورا كە هەر لەسەرتاوە مانای (( عەدالەت )) ی تێدا لەپێش چاو بگيرێت .

[3] ) سوورەتی/ آل عمران / 160 .

﴿ والذين استجابوا لربهم وأقاموا الصلوة و أمرهم شووری بينهم ومما رزقناهم ينفقون ﴾[1] شووراو نوێژو بەخت کردنی سامان نیشانەی بڕوان.

### ئیشەکانی ئەنجوومەنی ڕاوێژ:

دەستوور لە ڕژێمی سیاسی ئیسلامیدا لە کۆمەڵە "حوکمێکی شەرعی" پێك هاتووە، ئینجا ئەم حوکمانە لقی "خوا پەرستی و مامەڵە و تۆڵە "العبادات والمعاملات والعقوبات" یان لێ پەیدا دەبێت، مامەڵە و تۆڵە وەرگرتن یاسای گشتی و تایبەتی بەهەموو جۆرەکانییەوە دەیان گرێتەوە .

حوکمە شەرعییەکان _ کە ئەم هەموو مانایانە و هەموو ڕووەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵ و میری دەگرێتەوە _ هەندێکیان قورئانی پیرۆز بە ڕۆشنی دانی پێدا ناون، یان فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)، یان ئیجماعی موسڵمانانی لەسەرە، یان حوکمەکەی لە ڕێگەی "ئیجتهاد" ەوە دەرهێنراوە.

ئیجتهاد ئەگەر چی ئەوی دەسەڵاتی ئیجتهادی ببێ _ موسڵمانان _ بۆی هەیە ئەنجامی بدات، بەڵام ئەگەر لە کۆڕێکدا وەك کۆڕی ئەنجوومەنی ڕاوێژ (مجلس الشوری) چەند موجتەهیدێك کۆبوونەوە ئەوا کاریان تەنها ئەوەیە کە "حوکمە شەرعییەکان" وەردەگرن و ئامادەیان دەکەن بۆ پیادەکردنیان، ئینجا ئەنجومەنی ڕاوێژ هەڵدەسێ بە پیادەکردنیان بەو شێوەیەی لەلایەن تێکڕای کۆڕەکەوە بڕیاری لەسەر دراوە. ئەمەیش دوای ئەوەی کە "پێشەوا = ئیمام" فەرمان بە پیادەکردنیان دەدات. جا کە پێشەوا بڕیاری دا هەردەبێ ئەوەپیادەبکرێ: ﴿... أطيعوا الله وأطيعوا الرسول وأولى الامر منكم.. ﴾[2] .

دەگێڕنەوە کاتێ ئەم ئایەتە _ وشاورهم فی ألامر... _ هاتە خوارەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بزانن خواو پێغەمبەرەکەی پێویستیان بە ڕاوێژ نییە، بەڵام خوای گەورە بەزەیی و سۆزی بۆ ئوممەتەکەم هەیە، دەرووی خێری بۆ کردوونەتەوە، جا هەرکەسێك ڕاوێژ بکات ڕێگە هەڵە ناکات، هەر کەسێکیش پشتگوێی بخەن تووشی گێروگرفت دەبن".

پێغەمبەر (ﷺ) زۆرجار موسڵمانانی بۆ بنەمای "شوورا" هەڵناوە وەك ئەم فەرموودەیە:

"ماندم من استشار، ولا خاب من استخار"... وە فەرموویەتی: "المستشار مؤتمن"... وە فەرموویەتی: "ماتشاور قوم قط الا هدوا الی رشد أمرهم".

دەستەی زانایانیش بێ جیاوازی لەم نەخشەوە ڕۆیشتوون بۆیە دەفەرموون: "هەر فەرماندەو سەکردەیەك بنەمای"شوورا" پشت گوێ بخات لادانی واجیب و پێویستە[3] .

کەولبوو هەرباسێك و پێویستییەك بێتە گۆڕەپانی ژیانەوە _ یاسایی بێت، ئابووری بێت، سیاسی بێت.. هتد _ دەبێ بدرێت بە ئەنجوومەنی ڕاوێژ تا لەژێر ڕووناکی قورئان و فەرموودەکاندا حوکمەکەی بۆ دەربهێنێ واتە: دەبێ لەسنووری ئەم دووانە دەرنەچن....

ئەنجوومەنی ڕاوێژ کە لەدەستەی زانایان و موجتەهیدەکان و هەندێ پسپۆڕ لە برێ بواردا پێکهاتووە نابێ ڕایەك بدات لەگەڵ تەرازووی ئیسلامیدا نەگونجاو بێت، ئەندامەکان هەریەکەیان لەگەڵ بەڵگەدا "لە قورئان و فەرمودەو ئیجماع و قیاس ئیستحسان و مەصڵەحەو..." وتەی خۆی ئاراستەی کۆڕ دەکات واتە هەرکات شتێك هاتە بەردەم پێشکەشی ئەنجومەن دەکرێ و لە ڕاگۆڕینەوەدا ئەویش حوکمی بۆ دەردەهێنێ و دەکرێتە یاسای دەوڵەت.

---

[1] ) الشوری / 35 .

[2] ) النساء / 59 لە پێشەوە مانا کراوە .

[3] ) الاسلام واوضاعنا السياسية / عبدالقادر عوده .

دەسەڵاتی ئەنجوومەنی ڕاوێژ بە ئیجتهادێکی ڕەواوە بەسراوە، کە لەگەڵ یاسا بنەڕەتییەکانی ئیسلامدا بگونجێت، کەوابوو نابێ بڕیارێ دەربکات کە لەگەڵ قورئان و فەرمودەدا نەگونجێت، ئەگەر وایکرد ئەوە لە یاسای خوا دەرچووە و بەدەستدرێژی کەر دەدرێتە قەڵەم ﴿ ومن يتعد حدود الله فقد ظلم نفسه ﴾[1]. واتە: هەرکەسێك لە سنووری خوا دەرچێت ئەوە ستەمی لە خۆی کردووە.

"ام لهم شركاء شرعوا لهم من الذين مالم يأذن به الله"[2]..؟!.

**کارەکانی نوێنەرانی گەل:**

دانانی دەستەیەك بە نوێنەرانی هەموو گەل کارێکی پێویستە لەئیسلامدا بۆ ئەم مەبەستە ئەگەر چاوێك بگێڕین بە فەرمووده و ڕەوشتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕۆشنی ئەم تیۆری نوێنەرایەتی کردنە لە کۆمەڵدا (نظرية النياية عن الامة) بەرچاو ئەکەوێ. واتە لە ئیسلامدا ڕەوایە "کۆمەڵێك" ببنە نوێنەری هەموو گەلی موسڵمانان.

1- کۆمەڵێك هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە پەیمانی "عەقەبە" دا ئەویش پێی فەرموون: "دوازدە کەستان هەڵبژێرن بۆم تا ببن بەدەسەبەر "کەفیل" ی گەلەکەیان... ئەوانیش دوازدە کەسیان بۆ هەڵبژارد"[1]. ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون: "أنتم – كفلاء – على قومكم، وأنا على قومي قالوا نعم".[2] واتە ئێوە ـ ئەی کەفیلەکان ـ بەرپرسیارن بەسەر هۆزەکەتانەوە منیش بەرپرسیارو چاودێری کەری گەلەکەمم. ئەوانیش وتیان بەڵێ؟

ئەمە مانای وایە کە مرۆڤ بۆی هەیە کەسێك هەڵبژێرێ و بیکا بەنوێنەر "ممثل" ی خۆی بۆ پیادە کردنی کاروباری ژیانی، وەك ئەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێکردن و ئەوانیش ئەو دوازدە کەسەیان هەڵبژارد و ئەمیش بێ پێچ و پەنا فەرمووی ئێوە کەفیل و نوێنەری تیرەکەتانن.

2- لە ڕۆژی "بەدر" دا پێغەمبەر (ﷺ) ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی کردو فەرمووی: "أشيروا علي ـ وانما يريد الانصار ـ فقام سعد بن معاذ فقال: أنا أجيب عن الانصار، كأنك يا رسول الله تريدنا قال: أجل قال: فامض يا نبي الله لما أردت فوالذي بعثك بالحق لواستعرضت بنا هذا البحر فخضته لخضناه معك مامنا واحد. فقال رسول الله (ﷺ) سيروا على بركة الله".[5] ڕای خۆتانم بۆ دەربڕن ـ مەبەستی لە یارمەتیدەرەکان بوو ـ سەعدی کوڕی معاذ هەڵساو وتی: وا دیارە مەبەستت لە ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی بەڵێ، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چیت ئەوێ: بیکە سوێند بەو کەسەی تۆی بەهەق ناردووە ئەگەر تۆ بمانخەیتە ئەم دەریاوە و خۆت بڕۆیتە ناوی لەگەڵت دێین، تا پیاوێکمان بمێنێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەوابوو لەسەر "بەرەکەت"ی خوا ڕێگە بگرنەبەر.

ئەمەیش وا نیشان ئەدات کە دروستە تەنها مرۆڤێك بێ بە "ممثل" و جێگری کۆمەڵێك وەك "سەعد" کە یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی یارمەتی دەرەکان، ئەوە بوو کاتێ وتی: "من لەباتی ئەنصار وەڵام ئەدەمەوە پێغەمبەر (ﷺ) بێ دەنگ بوو و کارەکەی پەسەند کرد.. لەولایشەوە یارمەتیدەرەکان بێدەنگ بوون لێی، بەتایبەت ئەگەر سەرنجی وشەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بدەین کە فەرمووی "بەڵێ، اجل" پتر دەرئەکەوێ دانانی یاسای نوێنەرایەتی تەنها کەسێك لەجیاتی هەموو تیرەکەی ئەگەر پەسەندی نەکردایە ئەی فەرموو: "لاتجبنا عنهم ولنسمع آراءهم". تۆ لەباتی ئەوان قسە مەکە، با خۆیان قسە بکەن.

---

[1]) الطلاق / 1 .

[2]) الشورى / 21 .

1 ) الطبقات الكبرى / لابن سعد(ج3 / ص602)

2) سەرچاوەی پێشوو .

) الطبقات الكبرى / لابن سعد( ج2 ص14 )[5]

3- کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ویستی "ئەوس و خەزرەج" ئاشت بکاتەوە لەگەڵ "بنی غطەفان" دا ڕاوێژی بە "سەعدی کوڕی معاذ و سەعدی کوڕی عبادە" کرد سەبارەت بە مەسەلەکە لە سەر سێ یەکی بەروبوومی "مەدینە".

دەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاوێژ تەنها بەو دووانە ئەکات لە کاتێکدا بەروبومی مەدینە لە گیرفانی هەموویان دەردەچێت ئەمە مانای وایە دروستە تەنها کەسێك نوێنەرایەتی تیرەیەك بکات.

## ئیجماعیش نوێنەرایەتی ئەسەلمێنێ :

دیارە لە یاسایی ئیسلامی پیرۆزدا هەڵبژاردنی "خەلیفە" و پێشەوا لە ڕووی پەیمان و "بەیعەت"ەوەیە، ئەمەش لە ڕێگەی ئەو کەسانەوە ئەبێت کە نوێنەرو "ممثل" ی کۆمەڵن کە بەیاسای فیقهی ئیسلام پێیان ئەڵێن "ئەهلی حەل و عەقد = ئەنجوومەنی ڕاوێژ" ئینجا دوای بەیعەتەکە "هاوەڵەکان" "ئیجماع" یان لەسەر بەست.

گرنگترین بەڵگە بۆ ئەمە سەردەمی ئیمامی "عومەر"ە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەوەبوو دانی نەنا بە هیچ کەسێکدا دوای خۆی بکرێت بە جێ نشین، بەڵکو دایە دەست گەل و کۆمەڵ، دایە دەست نوێنەرەکانی خەڵك کە ئەنجوومەنی ڕاوێژی ئەو کاتە بوون وەك: ئیمامی "عەلی، عوسمان، تەلحە، زوبەیر، سەعد، عەبدولرەحمان". ئەوەیشمان لەبیر نەچێت کە ئەمانە لە پیاوە هەڵکەوتووەکانی هاوەڵەکان بوون. واتە ئەبێت کاروبار بە دەست ئەهلی خۆیەوە بدرێت، وەك چۆن عومەر لە ناو هەموو هاوەڵاندا ئەوانەی پەسەند کرد. ئاشکرایە ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە بۆ دان نان بە تیۆری نوێنەرایەتیدا [1].

ئیبن سەعد لە کتێبی "الطبقات الکبری"دا و"ماوەردی" لە کتێبی "الاحکام السلطانیة"دا لاپەڕە "12" ئەفەرموون: کاتێك ئەنجوومەنی ڕاوێژەکە کۆبوونەوە (عەبدولرەحمان) فەرمووی: کاروبارتان بدەنە دەست سێ کەستان "واتە ڕاتان کۆبکەونەوە و بیسپێرن بە سیانتان" ئینجا "زوبەیر" ئیمامی عەلی کرد بە "وەکیل" تەلحە ئیمامی عوسمانی کرد بە نوێنەری خۆی، سەعدیش عەبدولرەحمانی هەڵبژارد، ئینجا ئەو سێ کەسەیش کۆبوونەوەیەکیان کرد. عەبدولرەحمان فەرمووی: ئەم ئیشە ئەسپێرن بەمن ـ وا من لێی دەرچووم ـ سوێند بەخوا هەرگیز چاو نانوقێنم لە چاکتان؟ وتیان بەڵێ، ئینجا بەتەنها لەگەڵ ئیمامی "عەلی" دا کۆبووەوە و پێی وت: سوێند بە خوا ئەم کارە شایەنی تۆیە، چونکە خزمایەتیت لەگەڵ پێغەمبەردا هەیە، وە زۆر لە کۆنەوە بڕوات هێناوە، وە ئەگەر تۆ ببی بە جێ نشین سوێند بە خوا بە دادگەریانە ڕەفتار ئەکەیت، خۆ ئەگەر "عوسمان" یش بکرێ بە "خەلیفە" تۆ وتەی وەرئەگریت و فەرمان بەرداری ئەکەیت وتی بەڵێ. بەتەنها لەگەڵ عوسمانیشدا کۆبوویەوە و چی وت بە "عەلی" وتیشی بەو، عوسمانی فەرمووی: بەڵێ "تۆ هەرچی دابنێیت من بەگوێت ئەکەم". ئینجا (عبدالرحمن) فەرمووی: عوسمان دەستت بێنە، ئەویش دەستی هێنا و عەلی پەیمان و "بەیعەتی" لەگەڵ بەست و، خەڵکەکەیش چاویان لەو کردوو بەیعەتیان پێکرد".

ماوەردی ئەفەرمووێ: "ئەنجوومەنی ڕاوێژەکە دوای ئەوەی کە شەش بوون، بوون بە سێ ئینجا دوای ئەوە بوونەوە بە دوو "عەلی و عوسمان" ئیتر (عبدالرحمن) ڕۆیشت تا خەڵکەکە ئاگادار بکات بە باسەکە.

بەڵێ ئەم شەش کەسە کە نوێنەری کۆمەڵ بوون بۆ هەڵبژاردنی "ئەمیر" سەرئەنجام هاتەوە سەر یەك کەسیان و ئەوانی تریان کارەکەیان بەئەوسپارد

ئەنجوومەنی شوراکە بۆ یەکەمجار ئەمانە بوون:

---

1) هەڵبژاردنی ئەمیر (مافێکی ڕەوای کۆمەڵە و بە کرداری پێغەمبەر (ﷺ) ثابت بووە. چونکە ئەوەتا لە لایەکەوە (پێشەوا) یی پێویست کردووە، لە لایەکی تریشەوە کاتێك کۆچی کرد هیچ کەسێکی دانەنا لە جێگەی خۆیدا، بەڵکو هێشتیەوە. ئەمە مانای ئەوەیە کە هەڵبژاردنی پێشەواو سەرۆك مافی گەلە . ئەوەبوو دوای کۆچ کردنی ئەوەیش هاوەڵەکانی (ئیجماع) یان بەست بۆ (ویلایەت)ی ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت). [1]

"عەلی، عوسمان، تەلحە، زوبەیر، سەعد، عبدالرحمن"، بۆ دۆخی دووەم هاتنەوە سەر ئەمانە "عبدالرحمن، عەلی، عوسمان" ئەم سیانە بوون بە نوێنەری کۆمەڵ بۆ هەڵبژاردنی "ئەمیر" بۆیان، ئینجا "عەلی و عوسمان" "عبدالرحمن" یان هەڵبژارد تا ئەویش سەربەست بێت بۆ هەڵبژاردنی "ئەمیر". دوای ئەوە "عبدالرحمن" ئیمامی عوسمانی هەڵبژارد.

با ئەوەیش بخەینە پێش چاو کە بەهیچ شێوەیەك ڕەخنە نەگیرا لەو شەش هەڵبژێرراوانە لە لایەن هاوەڵەکانەوە، هەروەك بۆ هەڵبژاردنی سێ کەسەکەیش ڕەخنە نەگیرا، لە کۆتاییشدا بۆ تەنها کەسەکە هیچ کەسێك دوو دڵی پێشان نەدا. کەوابوو ئەم کارە بوو بە "ئیجماع" لەسەر ئەوەی کە دروستە نوێنەر بۆ گەل "هەڵبژێری".

"ئەو ئەنجوومەنەیش کە بەمکارە هەڵدەستن وەنەبێت کار بۆ خۆیان بکەن، بەڵکو هەرچی ئەکەن "وەکیل" و جێگری کۆمەڵن [1].*

## "فەرزە کیفاییەکان بناغەن بۆ بیرۆکەی نوێنەرایەتی"

بەڵێ، فەرزە کیفاییەکانیش بەڵگەیەکی ترن بۆ دروست بوونی نوێنەرایەتی لەجیاتی کۆمەڵ واتە ئەو شتانەی کە پێویستن لەسەر شانی هەموو کۆمەڵ بیکەن لە ناوچە و کۆمەڵەکەدا، بەڵام ئەگەر تەنها کەسێك پێی هەڵسێ لە کۆڵی هەموویان ئەکەوێ و تاوانبار نابن لای خوای خۆیان، چونکە ناگونجێ هەموو کۆمەڵەکە خەریکی تەنها ئیشێ بن وە دەست لە پێویستی یەکانی تر هەڵبگرن.

ئاشکرایە هەموو کۆمەڵ ناتوانن ببن بە "ئەمیر"، وە هەموویشی ناگونجێت بۆ ئەو ئیشە، کەوابوو دانانی جێگر بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات "فەرزی کیفایە" یە. تەنها کەسێك _ وەك وەکیلی کۆمەڵەکە _ هەڵئەسێ بە پیادەکردنی ئەو کارانەی گەل پێویستی پێیان هەیە.

بێجگە لەمەیش بەپێی یاسای ئیسلام کۆمەڵی موسڵمانان هەرگیز لەسەر تاوان و گومڕای کۆنابنەوە: واتە کە تیۆری نوێنەرایەتی بە "ئیجماعی ئوممەت" سەلمێنراوە، مانای ڕاستێتی و پەسەند بوونیەتی لە تەرازوی ئیسلامدا، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: "ان أمتی لاتجتمع علی ضلالة" [2]، واتە: بێگومان گەلی من لەسەر گومڕایی کۆنابنەوە.

## کێ ئەبێ بە نوێنەری کۆمەڵ...؟

بۆ ئەو کەسانەی ئەبن بە نوێنەری گەل دەستەتەی زانایان گەلێ ناویان لێ ناون گەلێ مەرجیشیان بۆ داناون و بۆ دیاری کردوون...

"ماوەردی" پێیان ئەڵێت: "ئەهلی حەلل و عەقد" و سێ مەرجیشی بۆ داناون:

1 – ئەبێ دادگەر بێت...

2 – ئەبێ شارەزایی ئەو زانیارییەی ببێت کە بتوانێت ئەو کەسەی پێ بدۆزێتەوە کە شایەنی "ئیمامەت" و پێشەولیەتی بێت.

---

[1]) د. محمد ضیاء الدین الریس / النظریات السیاسیة الاسلامیة ص 177 .

* لێرەدا سەرنجێك بە پێویست ئەزانین، سێ ڕۆژ دانراوە بۆ ڕاوێژکردن بە خەڵکی و "عەبدولرەحمان (ڕەزای خوای لێ بێ)" ڕاوێژی بە هەموو خەڵکی کرد، ئایا کێ دەنگ بە (عەلی) و کێ دەنگ بە (عوسمان) ئەدات ! "ئیبن کەثیر "لە البدایة والنهایة: (146/7) دا ئەلێ: عەبدولرەحمان پرسی بە هەموو کەسێك کرد لە فەرماندەی سوپاو کارمەندانی حکومەتی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەنصارو موهاجرین و تەنانەت پرسی بەو کچە گەنجانەش ئەکرد کەلەپەردەدا بوون، پرسی بەو منداڵانەش ئەکرد کەلە حوجرەکاندا بوون، هەموو دەنگیان بۆ عوسمان ئەدا".. "عبدالرحمن ڕای ئەو ڕێبوارو سوارانەشی وەردەگرێت لەو سێ ڕۆژەدا کە دانرابوو بۆ ڕاوێژکردن بەخەڵك ئەهاتنە مەدینە، هەمووڕایان بۆ عوسمان ئەدا تەنیا (عەمار) و (میقداد) نەبێ کە ڕایان بۆ (عەلی) ئەدا"..(تیشك)

[2]) سنن الترمذی 4/ 466 وسنن ابن ماجه 2/ 1203 و الجامع الصغیرالسیوطی، ص88 .

3– خاوەن ڕاو حیکمەت بێت تا بتوانێت ئەو کەسەی کە شایەن تربێت بۆ پێشەوایەتی هەڵێبژێرێ. واتە: ژیرو وریا و تێگەیشتوو و خاوەن حیکمەت بێت.

"بەغدادی" پێیان ئەڵێت: "ئەهلی ئیجتهاد".

(*) لێرەدا سەرنجێك بەپێویست ئەزانین، سێ ڕۆژ دانرا بۆ ڕاوێژکردن بەخەڵکی و خاوەنی "تەفسیری ئەلمەنار" یش مانای "ئەهلی حەلل و عەقد" بە ڕۆشنتر ئەکات بۆیە ئەفەرمووێ: "خاوەن دەسەڵات "أولوا لامر" دەستەی (حەلل و عەقدن) کە ئەوانیش بریتین لە "ئەمیر"ەکان و فەرماندەکان وزاناکان و ئەفسەرەکان و ئەوانەی تریش کە خەڵکەکە لە کاتی تەنگانە و پێویستی دا پرس ورایان پێ ئەکەن"[1].

ئیمامی نەوەویش (خوای لێ ڕازی بێت) "ئەهلی حەلل و عەقد" بەم شێوەیە پێناسە ئەکات و ئەڵێت: ئەهلی حەلل و عەقد دەستەی زانایان و سەرۆکەکان و ئەو پیاوە ماقوڵانەن کە دەست بدات بۆ کۆبوونەوەیان"[2].

مامۆستای زیرەك و وریایش "ئیبن تەیمییە" (خوای لێ ڕازی بێت) پێناسەیان ئەکات کاتێك باس لە "أولو الامر" ئەکات و ئەڵێت: "خاوەن کردارو فرمان ئەو کەسانەن فرمان ئەدەن بە خەڵك لەمەیشدا دەسەڵاتدارو دەستت دار، زانا و ئەهلی "کلام" بەر ئەکەون... کەوابوو خاوەن فرمانە "اولوا الامر"ەکان دوو تاقمن: زانایان و فەرماندەکان... ئینجا پاشا و هەر پیاوێکی تری هەڵکەوتەیش لەمەدا بەر ئەکەون"[3].

ئیبنی خەلدونیش ئەڵێت: ڕاوێژو "حەلل و عەقد" بۆ کەسێك ئەبێت دەسەڵاتی کردنەوە و گرێدانی کار کردن و نەکردنی ببێت... ئەو کەسەی کە هێزی ئەوەی نەبێت و نەیشتوانێ کاروباری خۆی ببیاتە سەرو پارێزگاری خۆی بکات و باریش بێت بەسەر خەڵکییەوە، ئەوە ئەو کەسە چ پەیوەندییەکی بە ئەنجوومەنی ڕاوێژەوە هەیە؟ !.

دیارە ئەوە پرس و ڕا و تەکبیرو ڕاوێژی بێ سوودە.. سا مەگەر پرس ورای ئەوەندەی پێ بکرێت بۆ دەرهێنانی "حوکمە شەرعییەکان" و "فتوا" لێوەرگرتنی. ئیتر لە ڕووی سیاسی یەوە هیچ ڕۆڵێك نابینێت"[4].

بەکورتی: ئەنجوومەنی ڕاوێژ ئەو زانا و سەرۆکانەن ئەو مەرجانەیان تێدابێت کە ماوەردی باسی کردن. دیارە هەموو کەسێك ئەو مەرجانەی تێدا نایەتە جێ و نابێتە زاناو دانا، بۆیە کۆمەڵ کاروباری خۆی ئەسپێرێ پێیان و ئەیانکات بە نوێنەری خۆیان.

### نوێنەری کۆمەڵ چۆن ئەگاتە ئەنجوومەنی ڕاوێژ؟

بەڵێ ئەم پرسیارە خۆی دێنێتە بەردەم و ئەڵێت: ئایا ئەندامەکانی کۆڕی ئەنجوومەنی ڕاوێژ چۆن ئەگەنە پلەی جێگریەتی..؟ ئایا بە خزمەتە؟ وەیا بە"تەقوا" و خوا ناسینە؟ یان چۆن و چۆنە؟.

لە وەڵامدا ئەڵێین: هەرکەسێك چاوێ بگێڕێ بە مێژووی پێشووی ئیسلامدا بۆی دەرئەکەوێ کە ئەنجوومەنی ڕاوێژ ــ ئەهلی حەلل و عەقد ــ ناسراو وڕدیاری بوون وبە پەنجە ئاماژەیان بۆ کراوە.. خەڵکەکە هاتووچۆی کردوون، داوای فەتوایان لێکردوون.. سەرئەنجام کردەوەی پاکی خۆیان و تەقواو دادگەریی و ڕاستیان و هەوڵ و جیهادیان و خزمەتیان لەگەڵ پێغەمبەر دا (ﷺ) و خۆشەویستی موسڵمانەکان بۆیان و متمانەیان پێیان و ڕەزامەندییان لێیان، ئەمانە هەموو بەرزی ئەکرێنەوە بۆ ئەو جێگە و ڕێگەیە کە پێی ئەڵێن: ئەنجوومەنی ڕاوێژ .

---

[1]) تفسیر( المنار) ( ج 5 ص181 ) ، دیارە ئەمە تەفسیری ئایەتی : (( یاایهالذین امنوا اطیعواالله واطیعوا الرسول واولی الامر منکم ...)) ە

[2]) المنهاج للنووی .

[3]) الحسبة في الاسلام ص 102 ابن تیمیة .

[4]) ابن خلدون : المقدمة ص 224 .

ئینجا با بزانین ئەو"عەقد" و پەیمانەی ئەو نوێنەرانە پێی هەڵئەسن و ئەبێ بە بەڵگەی ڕاستی و ڕەوانی کارەکەیان چییە؟ واتە هەر ئیشێك ئەکرێ و کەسێك پێی هەڵئەسێ ئەبێ لەلایەن خاوەن کارەوە مۆڵەت بدرێ و ڕەزامەندی بخرێتە پێش چاو، دەی ئایا ئەم ئیشی ئەنجوومەنە "وەکالەتە" یان؟ وە ئەگەر وەکالەتە ئەبێ چ جۆرە وەکالەتێك بێت؟ چونکە ئاشکرایە وەکالەتمان دوو جۆرە:

ا/ وەکالەتی ڕاشکاوانە و ڕاستەوخۆ "الصراحة".

ب/ وەکالەتی ناڕاستە وخۆ "ضمنية".

کەواتوو وەکالەت _ کە پەسەند بێت لە فیقهی ئیسلامیدا _ ئەو دوو جۆرەیە.. ئەگەر سەیری سەردەمی "خیلافەی ڕاشیدین" بکەین بۆمان دەرئەکەوێ کە هەڵسانی ئەو کۆمەڵە پاکانە بۆ جێبەجێکردنی کاروباری موسڵمانان بە شێوەی "وەکالەتی ناڕاستەوخۆ = ضمنيي" بووە.

بۆ ئەو سەردەمە وەکالەتی ناڕاستەوخۆ بەس بووە، چونکە موسڵمانان پتر لە خەڵکی ئەم سەردەمە دادگەرو ڕاست تر بوون، وە هیچ کات ئەگەر "صیفەتە" کانی نوێنەرایەتیان تێدا نەبێت هەرگیز خۆیان ناهێننە پێشەوە.

کەواتوو ئەی ئێستا چۆن ئەنجوومەنی ڕاوێژ هەڵئەبژێرن؟ ئایا وەکالەتی ناڕاستەوخۆ بەسە وەك سەردەمی جێ نشینەکانی ئیسلام؟ یا ئەبێ بە وەکالەتی ڕاستەوخۆوڕاشکاوانە بێت؟.

بەڵێ، ئەگەر سەرنجێك لە یاسای ئیسلام بدرێ کە چۆن هەموو گۆشەو قوژبنێکی ژیانی گرتۆتەوە، دەرئەکەوێ زۆر بە ڕۆشنی کە لە ئیسلامدا یاسای هەڵبژاردنیش هەیە، چونکە کاروبار ناڕوات بێ ئەو ئەنجوومەنەیە، هەرشتێکیش کاروباری لەسەر بڕوا بەڕێوە پێویستە و واجبە، کەواتوو یاسای هەڵبژاردنیش پێویستە، بەڵام بەو شێوەیە کە لەگەڵ "ڕۆحی" ئیسلامدا بگونجێت، ئەویش بەم جۆرە ئەبێت کە: دوور بێت لە دەست بڕین و پڕو پاگەندە و چاو بەس و کڕین و فرۆشتنی دەنگ و ڕەنگەکان وەك ئەمڕۆی سەدەی بیستەم !!، وە بەومەرجەی کە مەرجەکانی هەڵبژاردن _ لە ئیسلامدا _ لە نوێنەرەکاندا بێنەجێ، واتە نوێنەرەکان ئەو کەسانە بن لە ئیسلامدا پەسەند بن، ئینجا با ئەوەیشمان لە بیر نەچێت کە ئێستا "وەکالەتی نارستەوخۆ" بەس نییە، بەڵکو ئەبێ بە ڕاستەوخۆ "ئەو ئەنجوومەنە بکرێن بە نوێنەر لەلایەن کۆمەڵەوە،چونکە "پەسەندکردنی" ئەم جۆرە وەکالەتە ناڕاستەوخۆیانە دەرگایەکی ناهەموار ئەکاتەوە بۆ گەل و کۆمەڵ، بە شێوەیەك "زۆر جار" سەر بکێشێ بۆ ئاشوبوو "بشێوی"، چونکە هەموو کەسێك _ با مەرجیشی تێدا _ نەبێت _ هەوڵ ئەدا و خۆی ئەگەیەنێتە ئەو ڕێگەیە و خۆی ئەکات بە نوێنەری گەل بە بەڵگەی ئەوەوە کەگوایا نوێنەرایەتی یەکەی "ضمنيي" و ناڕاستەوخۆیە" [1].

**نوێنەرانی کۆمەڵ پاسەوانیان بۆ دائەنرێت:**

نوێنەرەکان، ئەهلی حەلل و عەقد، یا کۆڕی ئەنجومەنی ڕاوێژ مافیان هەیە لەڕژێمی سیاسی ئیسلامدا پاسەوانیان بکرێ و چاودێرییان بکەن لەدەست ناپاك و پیاوخراپ، بۆ ئەوەی دەست درێژییان بۆ نەکەن، لەولایشەوە بشتوانن بەڕێکو پێکی کارەکەیان ئەنجام بدەن بێ ئەوەی ترس و بیمیان لەهیچ کەسێك ببێ.

خاوەنی کتێبی "الطبقات الكبرى)" ئەڵێت: پێشەوا عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) بە چەند کاتێك پێش مردنی_ ناردی بۆ لای ئەبوو طەلحە و "فەرمووی: پەنجا کەس لە خزمە "ئەنصاری" یەکانت هەڵبژێرە بۆ چاودێری کردنی ئەنجوومەنی ڕاوێژ..." [2].

---

[1] ) د. عبدالكريم زيدان أصول الدعوة ، ص160 .

[2] ) ابن سعد / الطبقات الكبرى (ج3 ص61 ).

ئەبوو (طەلحە) یش _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ دەستبەجیٚ هەڵسا پەنجا کەسی هەڵبژارد و لەدەرگای ئەنجوومەنی ڕاوێژدا وەستاندنی و کردنی بە پاسەوانیان.. کاتیٚ ئەوان کارەکەیان سپارد بە "عەبدولڕەحمان" بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی کۆمەڵ، ئەوەبوو (طەلحە) خۆی و پەنجا کەسەکە هاتنە بەر دەرگای ماڵی (عبدولڕەحمان)، بەجێیان نەهێشت تا پەیمانیان بەست و بەیعەتیان کرد بە ئیمامی عوسمان _ خوا لێی ڕازی بێت _ کەوابوو پێویستە _ بۆ ئەمڕۆ زیاتر لەو سەردەمە _ کە ئەنجوومەنی ڕاوێژ پاسەوان و چاودێرێکەریان بۆ دابنریٚ.

خوێنەری بەڕێز: پێم خۆشە هەردووکمان سەرنجێکی ئەم جێگایە بدەن و بیرێکی لیٚ بکەینەوە... تەماشا بکەین چۆن پێشەوا عومەر فەرمانی دا کۆمەڵێك لە یاران بکرێن بە پاسەوان، تا تیٚ بگەین کە موسڵمان ئەبیٚ دوور بین بێت، وریا بێت، هۆ بەکاربهێنێت بۆ مانەوەی خۆی.

خاتوو عائیشە "خوا لێی ڕازی بێت" فەرمووی: شەوێکیان پێغەمبەر (ﷺ) نەخەوت و مایەوە تا شەوێکی درەنگ، _ بەهەر هۆیەکەوە بوو_ فەرمووی: "ليت رجلا صالحا من أصحابي يحرسني الليلة إذ سمعنا صوت السلاح، قال من هذا؟ قيل: سعد يارسوا الله ! جئت لحرسك فنام النبي (ﷺ)حتى سمعنا".[1] واتە: خۆزگە ئەم شەو پیاوێکی چاك لە هاوەڵەکانم ئەهات پاسەوانی ئەکردم... کتوپڕ دەنگی چەکمان بیست، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کێیە؟ لەلایەن سەعدەوە وەڵام درایەوە: ئەی پێغەمبەری خوا: سەعدم بۆ ئەوە هاتووم پاسەوانیت بکەم، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) (بە دڵنیایی پاڵی دایەوە و) نوست، (هەرچەندە زۆر پشت سوور بوو کە خوا ئەیپارێزیٚ) وە گوێمان لە پرخەیەوە بوو. ئەمە مانای وایە بۆ موسڵمان پێویستە پاسەوانی خۆی بکات بە "چەك" و هەرشتێکی تر بە کەڵکی ئەو سەردەمە بێت.

هەرچەندە _ زۆر بەداخەوە _ موسڵمان ناوێریٚ نزیکی چەك بکەوێتەوە ئەم قسەیە قسەی هەشتاکانە وەدواترئەو قسەیە جێگەی گاڵتەی خەڵك بوو (تیشك)_ خێرا بە فیکەی دوژمنانی خوا _ جاڕی بۆ ئەکێشن و ئەڵێن: موسڵمان ئەگەر موسڵمان بێت چەکی بۆ چییە؟ پاسەوانی کەی ئەویٚ؟ !.

## پێکهێنانی ئەنجوومەنی ڕاوێژ بە چەند جۆر ئەبیٚ؟

لە مێژووی ئیسلامیدا شێوەیەکی تایبەتی دیاری نەکراوە بۆ ڕاوێژکردن بە خەڵکی، بەڵکو چەندەها جۆری هەبووە وەك:

یەکەم: پرس و ڕا بە پێشەوایانی کۆمەڵ... ئەمەیش لە جەنگی "خەندەق = چاڵ" دا دەردەکەوێت. ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) پرس و ڕای کرد بە "سەعدی کوڕی معاذ وسەعدی کوڕی عوبادە" کە گەورەو سەرکردەی "ئەوس وخەزرەج" بوون، پێغەمبەر (ﷺ) پرس و ڕاو ڕاوێژی پیٚ کردن بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ تیرەی "بەنی غەطەفان" دا لە سەر سیٚ یەکی بەروبوومی شاری "مەدینە" لەبەرامبەر ئەوەوە کە بگەڕێنەوە و نەیەنە سەر موسڵمانەکان و شەڕیان پیٚ نەفرۆشن.

پرسی پێکردن کە ئایا چی بکەن باشە، بەروبوومەکە بدەن، وەیا جەنگیان لەگەڵدا بکەن؟ !. ئەمە مانای وایە دروستە پرس و ڕا بە گەورە و سەرکردەی تیرەو هۆز بۆ وەرگرتنی ڕاو ڕاوێژی بۆ هەر شتێك بێتە کایەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) پرسی پێکردن، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری (ﷺ) ئەمە کارێکە تۆ خۆت پێت خۆشە، وەیا خوا فەرمانی پێکردووی ئەم ئیشە ئاوا بکەیت؟ فەرمووی شتێکەهەر خۆم ئەیکەم بۆتان، لەبەرئەمەیشە ئەبینم عەرەبەکان هەموویان یەکدەنگن لەسەرتان، منیش ئەمەوێت "بەهۆی ئەم بەروبوومەوە" تا ماوەیەك دەسەڵاتیان دوور خەمەوە لێتان و پارێزراو بن لێیان، (سەعدی کوڕی معاذ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە و ئەوان کاتی خۆی هەموومان هاوەڵمان بۆ خوا دائەنا و خوامان نەئەپەرست و نەیشمان ئەهێشت لەماڵ و سامانمان بخۆن بە میوانداری نەبێت... جا ئێستا کەخوا کردووینە موسڵمان و پلە و ڕێزیشی پێداوین، ئیٚتر مایەی نەنگی نییە بۆ ئێمە بەروبوومیان بدەینیٚ لە کاتێکدا بڕوامان

[1] ) ارشاد الساري كتاب التمني/ ،( ص278 ) .

هێناوه؟. نهء سوێندم بهخوا ئێمه ئهمه ناکهین، وه سوێند بهخوا تهنها شمشێریان ئهدهمێ تا بڕیاری خوای گهوره دهرئهچێ... ئینجا پێغهمبهریش فهرمووی دهی ئهوه خۆت و کاروبار چی ئهکهی بیکه "[1].

ئهمه بوو به بهڵگهی ئهوه که دروسته بۆ پێشهوا پرس وڕای خۆی بکات به پێشهوایان و سهرکردهی تیرهو هۆزو گهل، وه دوایش به گوێیان بکات.

دوای پێغهمبهریش (ﷺ) جێ نشینهکانیش پرس و ڕایان بهسهرکردهو فهرماندهکانی گهل ئهکرد: "ئهبوو بهکری صدیق ــ خوا لێی ڕازی بێت ــ ئهگهر ڕووداوێکی لێ ڕوو بدایه و بیویستایه ڕاوێژ به ئههلی "حهلل و عهقد" بکات کۆمهڵه پیاوێکی بانگ ئهکرد له کۆچکهرهکان و یارمهتیدهرهکان، بانگی عومهر و، عوسمان و، عهلی و، عهبدول ڕهحمان و، مهعازو، ئوبهی کوڕی کهعب و، زهیدی کوڕی ثابت" ی ئهکردو پرس وڕای لێ وهرئهگرتن" [2].

بهڵێ، ئهمهیش دوای ئهوه ئهیانکرد کهحوکمی ئهوڕووداوهیان بهرچاونهکهوتایه نه له قورئاندا، نه له فهرموودهدا.

دووهم: ڕاستهوخۆ ڕای گهل وهرگیراوه :

ئهم جۆرهشیان پێغهمبهری خوا (ﷺ) له چهندهها جێگهدا کردوویهتی و کارهکهی نواندووه و داوای ڕای له ههموو تیره و هۆزهکان کردووه، بۆ نموونه:

لهگهڵ هۆزی "ههوازین" دا بهجهنگ هاتن سهرئهنجام موسڵمانهکان شهش ههزار کهسیان لێ دیل کردن، ئینجا خاوهنهکانیان هاتن بڕوایان هێنا به ئایینی پیرۆزی ئیسلام و داوای ماڵ و خێزان و سامانهکهیان ئهکردهوه، پێغهمبهر (ﷺ) ڕای دایه دهستیان بۆ ئهوهی: یا منداڵ و خێزانهکانیان بدهنهوه، سامانهکهیان بهجێ بهێڵن بۆ موسڵمانهکان، یاخود به پێچهوانهوه.

پێغهمبهر (ﷺ) باسهکهیشی خسته پێش چاو جهماوهری موسڵمانان تا بزانێ ڕایان چۆنه بۆ ئهم کاره. ههر لهم بابهتهیه پرس و ڕای پێغهمبهر (ﷺ) به جهماوهری موسڵمانان له جهنگی "خهندهقدا" دا سهبارهت بهوهی که ئایا ههر لهناو شاری "مهدینه" دا بمێنێتهوه بۆ جهنگ، یا بڕۆنه دهرهوهی شار؟.

یا له پهیمانهکهی "حودهیبییه" دا پێغهمبهر (ﷺ) عوسمانی ناردو کردی به نوێنهری خۆی بۆ ڕێکخستنی نێوان موسڵمانهکان و بێ باوهڕهکان، وه لهو ماوهیهی بۆی دیاری کرابوو بۆ گهڕانهوهی دواکهوت، ئینجا دهنگو باس وا بڵاو بوویهوه که "قوڕهیش" عوسمانیان کوشتووه، ئیتر پێغهمبهر (ﷺ) خستیه پێش چاوی کۆمهڵ که جهنگیان لهگهڵ بکات، ئهمهیش به شێوهی "بهیعهت" و پهیمان بهستن بوو له خزمهت پێغهمبهردا (ﷺ) ئهوانیش ههر ههموویان ــ جیدی کوڕی قهیس نهبێت ــ ئامادهیی خۆیانیان دهربڕی بۆ جهنگ و بۆ پیادهکردنی فرمانهکهی.

کاتێ پێغهمبهر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد ئیمامی ئهبوو بهکر فهرمووی: ((... بێگومان موحومهد چوو به ڕێگهی خۆیدا (واته گهڕایهوه بۆ لای خوای خۆی) وه پێویسته بۆئهم کاره چاودێری کهرێك دابنرێ، کهوابوو چاو بگێڕن و بزانن و ڕای خۆتان دهربڕن" [3].

کهوابوو شێوازی ڕاوێژ زۆره، وه له ئیسلامدا شێوهیهکی دیاریی کراوی نییه و موسڵمانان بۆیان ههیه بنهمای ڕاوێژکردن چۆن باری بهرژهوهندییه وا جێبهجێی بکهن.

---

[1] ) ابن هشام : السیرة النبویة ( ب3 / ص707 ) . موقریزی ئهڵێت : ههردوو سهعد وتیان به پێغهمبهر ــ ﷺ ــ ئهگهرئهمه بڕیاری ئاسمان بێت ئهوا مل کهچین ، وه ئهگهر تۆ خۆت پێت خۆشه ، ئهوا ههر گوێ ڕایهڵین .. خۆ ئهگهر پرس و ڕایش بێت ئهوه ئێمه تهنها شیرمان ههیه . ئیتر پێغهمبهر ــ ص ــ ڕاکهی وهرگرتن و ڕێکهوتنهکهشی نهکرد لهگهڵ (( غهطه فان )) دا ، ص 236 .

[2] ) الطبقات الکبری( ب2 ص350) .

[3] ) الشهرستانی / نهایة الاقدام( ص 479 ) .

## کەڵکەکانی ڕاوێژکردن و بەرهەمەکانی:

شوورا لە یاسای سیاسی ئیسلامدا گەلێ کەڵك و سوودی هەیە ئەمانە هەندێکیانن :

یەکەم: گەل هاویەش ئەبێت ـ کاتێ کە ئەنجوومەنی ڕاوێژ ئەکات بە نوێنەر ـ لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات و بیرکردنەوە بۆ پیادە و پێشخستنی لەگەڵ "ئەمیر" ە کەیاندا.

دووەم: حاکم و فەرماندە ئەپارێزێ لە "ئیستبداد" و خودڕەئی و دیکتاتۆری.

سێهەم: خۆشەویستی وئاشتی و تێکەڵی ئەکەوێتە نێوان گەل و دەسەڵاتدارانەوە، چونکە پێشەواکان هەڵبژێراوی کۆمەڵن و خۆیان ـ بەزۆر ـ سواری "کورسی حوکم" نەبوون.

چوارەم: هەڵە ڕوونادات لە بڕیارەکاندا، چونکە گەلی موسالّمانان ـ کاتێ کۆبوونەوە ـ پارێزراو ئەبن لە هەڵە و گومڕایی: "إن امتی لا تجتمع علی ضلالة" .

کەوابوو پێکهێنانی ئەنجومەنی ڕاوێژ واجیب و پێویستە، هەروەك لە پێشەوە هەندێ ئایەتمان هێنایەوە... پێغەمبەریشمان (ﷺ) ئەفەرمووێ: "استعینوا علی امورکم بالمشاورة" واتە: کاروبارتان بچەسپێنن بە "موشاوەرە" و ڕاوێژ.. وە ئەفەرموێ: "ما تشاور قوم قط إلا هدوا لآرشد امرهم" واتە: هەرتیرەیەك ڕاوێژیان بەکار هێنا بێت باشترین باریان نیشان دراوە.

### چ کارێ ڕاوێژی بۆ ئەکرێ..؟

ئەو کارانەی "وەحی" و سرووشی لەسەر نەهاتبێ شایەنی تەگبیرو ڕاوێژە و ئەنجوومەن بۆی کۆئەبێتەوە و بڕیاری بۆ ئەدۆزێتەوە لە قورئان و فەرموودەدا.. بەڵام ئەوکارانەی کە قورئان، یا فەرموودە حوکمەکەی باس کردبن ئەوە بەهیچ شێوەیەك ڕاوێژی تێدا ناکرێ ـ بەڵگە بۆ ئەمەیش ئەوەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاوێژی کرد بە هاوەڵەکانی سەبارەت بۆ پێشەوە چوون بۆ ڕووداوی "تەبووك"، ئینجا "عومەر" فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەگەر فرمانت پێ کراوە بە ڕۆیشتن فەرموو برۆ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر فرمانم پێبکرایە ڕاوێژو پرسم پێ نەئەکردن" .

خاوەنی "لحکام القرآن" ئەڵێ: "ئەبێ ڕاوێژی پێغەمبەر بە هاوەڵەکانی لە شتێکدا بوو بێ کە (نەص)ی بۆ نەهاتبێ..." .

کەوابوو ڕاوێژلە کاروباری دەوڵەتدا ـ وەك دانانی جێنشین و پێکهێنانی وەزارەت و ئاگاداری بۆ جەنگ و پەیمان بەستن لەگەڵ دەوڵەتێکی تردا، وە لە کاروباری ئابووریی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و هەرشتێکی تریش کە سرووشی لەسەر نەهاتبێ ـ ئەکرێ.

### جیاوازی نێوان جێنشین "خەلیفە" و ئەنجوومەنی ڕاوێژ:

ئەنجوومەنی ڕاوێژ ـ وەك وتمان ـ پێکدێت لە دەستەی زانایان و "موجتەهید"ەکان و سەرکردەو پسپۆڕەکانی گەل، و ئەمانەیش بە هیچ جۆرێك دروست نییە حەزی خۆیان بخەنە پێش چاو، واتە دوای هەواو ئارەزووی خۆیان بکەون... نەخێر بەڵکو ئەبێ وردە وردە هەنگاو هەڵگرن بەدوای بەرنامەکەی خوادا و وە هەریەکە بەڵگەی خۆی بێنێ.

---

2 ) لە پێشەوە ماناکراوە .

1) موقریزی ( ب1 / ص 463 ) .

2) هەندێ لە نوسەرەکان ئەڵێن : (( پێویست نییە شووراو ڕاوێژ لە هەموو کاروبارێکی دەوڵەتدا لە بچووك و پارچەکانی ... چونکە ئەمە ناگونجێ و پێویستیش نییە و کەڵکیشی نییە ، بێجگە لەمەیش هیچ بەڵگەیەکی تێدا نەهاتووە)) / اصول الدعوة / عبدالکریم زیدان (ص 170 ).

جا كه ئه‌نجوومه‌ن له‌وانه‌ پێك بێت دیاره‌ وائه‌بێت له‌ "مه‌سئه‌له‌" كاندا ڕایان یه‌ك ناگرێ و هه‌ریه‌كه‌ به‌شێوه‌یه‌ك بۆی ئه‌ڕوا، ئیتر مه‌سئه‌له‌كه‌ یاسایی بێت، یا ئابووریی، یا سیاسی... هتد چونكه‌ _ له‌ ئیسلامدا مرۆڤ سه‌ربه‌ستی بیرو هۆشی دراوه‌تێ _ چ بیرێ ئه‌كاته‌وه‌؟ چ شتێ دائه‌هێنێ؟ ئاشكرایشه‌ سروشتی مرۆڤه‌كان و وریایی و زیره‌كییان جیاوازی هه‌یه‌:

ئه‌م موجته‌هیده‌یان به‌ شێوه‌یه‌ك بۆی ده‌رئه‌كه‌وێ، ئه‌وی تریان به‌ جۆرێكی تر هه‌ر به‌و شێوه‌یه‌... وایش ئه‌بێت زۆربه‌یان قسه‌یان یه‌كه‌ له‌ "مه‌سئه‌له‌كه‌" دا، كه‌مێكشیان هاوده‌نگن له‌ بۆچوونه‌كه‌یاندا له‌و لایشه‌وه‌ (حاكم = سه‌رۆكی ده‌وڵه‌ت) وا ئه‌بێ ڕاكه‌ی له‌گه‌ڵ زۆرینه‌دا گونجاوه‌، وایش ئه‌بێت له‌گه‌ڵ كه‌مینه‌دا بێت، هه‌ڵیشس ئه‌گرێ خۆی سه‌ربه‌خۆ بێت و ڕای جیاوازی ببێت" ئایا له‌م كاتانه‌دا حوكم چۆن ئه‌درێ و ڕای كام لایان هه‌ڵئه‌بژێرێ؟ !.

سه‌ره‌تا ئه‌وه‌ بڵێین هه‌ركات كێشه‌ له‌ ڕاوێژكردندا دروست بوو ئه‌بێ بگێڕرێته‌وه‌ بۆ قورئان و فه‌رمووده‌، وه‌ك له‌قورئاندا هه‌ندێ ئایه‌ت هه‌یه‌:

"وما اختلفتم فیه من شیء فحكمه الی الله.." (شوری: 10). "فان تنازعتم فی شیء فردوه الی الله والرسول ان كنتم تؤمنون بالله والیوم الآخر.." (النساء: 59). "فلا وربك لایؤمنون حتی یحكموك فیما شجر بینهم..." (النساء: 65).

جا ئه‌گه‌ر یاسای ئه‌و كاره‌ له‌ قورئاندا هه‌بوو، وه‌یان له‌ فه‌رمووده‌دا، وه‌یا "ئیجماع" دا ئه‌وه‌ پێویسته‌ گوێ ڕایه‌ڵی بكرێ و، بكرێ به‌ پرۆگرام... سه‌باره‌ت به‌مه‌ مامۆستای موجاهید و تێكۆشه‌ر "ئیبنی ته‌یمیه‌"ئه‌فه‌رموێ "ئه‌گه‌ر موسڵمانه‌كان جیاوازی ڕایان هه‌بوو له‌ شتێكدا ئه‌وه‌ ئه‌بێ هه‌ریه‌كه‌یان ڕای خۆی و به‌ڵگه‌كه‌ی باس بكات و بكێشرێ به‌ قورئان و فه‌رمووده‌دا كامیان گونجاوه‌ له‌گه‌ڵ قورئان و فه‌رمووده‌دا ئه‌وه‌یان هه‌ڵئه‌بژێرێ" خۆ ئه‌گه‌ر ڕۆشن نه‌بوویه‌وه‌ كامیان گونجاوه‌ له‌گه‌ڵیاندا و ناكۆكی و جیاوازییه‌كه‌یش هه‌ربه‌رده‌وام بوو له‌ نێوان سه‌رۆك ده‌وڵه‌ت و ئه‌نجوومه‌نی ڕاوێژدا ئایا له‌م كاته‌دا چار چییه‌؟.

قسه‌ قسه‌ی سه‌رۆك كۆماره‌، یا ئه‌نجوومه‌نی ڕاوێژ، وه‌یا ناوبژێكه‌ر (حه‌كه‌م) بڕیار ئه‌دا؟. بۆ ئه‌مه‌ چه‌ند ڕایه‌ك هه‌یه‌:

یه‌كه‌م: ڕای زۆربه‌ی ئه‌نجوومه‌نی ڕاوێژ په‌سه‌ند ئه‌كرێ و "ئه‌میر)) یش ئه‌بێ بڕواته‌ سه‌رڕاكه‌ی ئه‌وان _ به‌ڵگه‌ بۆ ئه‌مه‌یش وته‌ی هه‌ندێ له‌ زاناكانه‌. بۆ نموونه‌:

پێشه‌وا "غه‌زالی" ئه‌فه‌رموێ: "ئه‌گه‌ر زانایان جیاوازی و ناكۆكیان بو له‌ كارێكدا، ئه‌وه‌ پێویسته‌ ڕای ده‌سته‌ی زۆره‌كه‌یان هه‌ڵبژێرێ" . وه‌ ئه‌فه‌رموێ: "ئه‌گه‌ر كۆمه‌ڵێك سیفه‌تی سه‌ركردایه‌تیان تیا بوو ئه‌وه‌یان هه‌ڵئه‌بژێرێ ڕای زۆربه‌ی خه‌ڵكه‌كه‌ی له‌گه‌ڵه‌..." .. وه‌نه‌بێ ته‌نها غه‌زالی ڕای وابێت، به‌ڵكو له‌لای زانایانی "اصول" یشدا "زۆرینه‌" ئه‌كه‌ن به‌ به‌ڵگه‌ بۆ هه‌ڵبژاردن.

---

3) ئه‌بێ ئه‌وه‌یش بزانرێت كه‌ ئه‌م زۆرینه‌وكه‌مینه‌ نابێ له‌سه‌ر شێوه‌یه‌كی ڕه‌گه‌ز په‌رستی و پارتایه‌تی دروست ببێت ، چونكه‌ ئه‌نجوومه‌نی ڕاوێژ له‌ بته‌ڕه‌تدا : (( نابێ ببن به‌چه‌ند به‌شێكی جیاوازه‌وه‌ و (( هه‌ریه‌كه‌ به‌ لایه‌كدا بڕوا )) به‌ڵكو ئه‌بێ ڕای خۆی ده‌بڕێ به‌ سیفه‌تی ئه‌وه‌ كه‌ ئه‌ندامێكه‌ له‌ موسڵمانان ، چونكه‌ ئیسلام به‌رگری ئه‌كات له‌وه‌ كه‌ ئه‌نجوومه‌نی ڕاوێژ له‌گه‌ڵ پارته‌كه‌یدا بن ئیتر له‌سه‌ر هه‌ق بێت یا نه‌ ؟ به‌ڵكو ئه‌بێ له‌گه‌ڵ هه‌قدا بن ، وه‌نابێ به‌ئه‌ندازه‌ی تاڵه‌ موویه‌ك لێی جیاببنه‌وه‌ ، ئه‌گه‌ر ئه‌مڕۆ ڕای یه‌كێكیان ڕاست و په‌سه‌ند بوو دوای كه‌ون ، خۆ ئه‌گه‌ر سبه‌ینێ ناڕاست بوو به‌ربه‌ره‌كانی له‌گه‌ڵ بكه‌ن )) نظریة الاسلام السیاسة/ للاستاذ ابی الاعلی المودودی ، ص 56 .

[2] ) ابن تیمیة : السیاسة الشرعیة ، ص136 .

[3] ) الامام الغزالی : الرد علی الباطنیة ، ص 62 .

[4] )( رشید رضا ) ئه‌یهێنێ له‌ ئیمامی غه‌زالی یه‌وه‌ له‌ كتێبی (( الخلافة )) ص 48 .

سەرەڕای ئەمانە هەمووی پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێ: "اتبعوا السواد الاعظم" [1] واتە ڕای زۆریەی خەڵکی هەڵبژێرن.. وە ئەفەرموێ: "عليكم بالجماعة والعامة" [2] واتە لە کۆمەڵ و گشتی جیا مەبنەوە.

"ابن سعد" ئەڵێ: پێشەوا عومەر وەسیەتی کرد کە ڕای زۆریەی موسڵمانەکان بگرن بەدەستەوە، "..لەکاروبارتاندا ڕاوێژ بکەن، جا ئەگەر دوو کەس دوو کەس بوون بڕۆنەوە سەر ئەنجوومەنی ڕاوێژ.. وە ئەگەر دەستەیەکیان چوار کەس بوون و دەستەیەکی تریان دوو کەس بوون ئەوا ڕای زۆرینە هەڵبژێرن" [3] .. ئەم هەواڵە وائەگەیەنێ کە ئیمامی عومەر ڕای زۆرینە هەڵئەبژێرێ. دیسان ئەمەیش ئەکەن بە بەڵگە کە: پێغەمبەر (ﷺ) لە جەنگی (ئوحود) دا ڕای زۆریەی هاوەڵەکانی پەسەند کرد. ئەمە بەڵگەی ڕای یەکەم.

دووەم: پەسەند کردنی ڕای "حاکم = سەرۆك وڵات" نەك ڕای ئەنجوومەنی ڕاوێژ: بۆ ئەم ڕایەش دەستەیەك لە زانایان ڕایان داوە، خاوەنی تفسیری (طەبەری)لە تەفسیری ئایەتی "فأذا عزمت فتوكل على الله.." دا ئەفەرموێ: "جا کە ڕاکەت جێگیر بوو و ثابتمان کردی لەسەری، ئەوە لەسەری بڕۆ دوودڵ مەبە، ئیتر بگونجێ لەگەڵ ڕای هاوەڵەکانتا، یا جیاوازی ببێت.. " [4].

پێشەوا "ئیبن تەیمیە" یش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە.." [5] واتە، ئەگەر لە قورئان و فەرموودەدا حوکمەکەڕۆشن بوویەوە ئەوە چاك و پەسەندە، خۆ ئەگەر هەر بەئاڵۆزی مایەوە ئەوە "ئەمیر" خۆی بۆی هەیە ڕایەك هەڵبژێرێ و پیادەی بکات.

دەستەیەکی تر لە زانایان: دوای ئەوەی قسە ئەکەن لە ناکۆکی و کێشەی سەرۆك دەوڵەت و ئەنجوومەنی ڕاوێژ، ئەڵێن: "ئەگەر ڕایەك بەرنەکەوت کە بگونجێت لەگەڵ قورئان فەرموودەدا، وە کێشەی نێوان ئەنجوومەنی ڕاوێژو سەرۆك دەوڵەت هەر بەردەوام بوو ئایا بڕیار چییە، وە چۆن ئەم ناکۆکی یە کۆتایی پێ بهێنین..؟ ئەم دەستەیە ئەڵێن: ئەوەی پەسەندی بکەین و هەڵیبژێرین قسەی "ئەمیر = سەرۆك دەوڵەت" ە. واتە ئەو ئارەزووی خۆیەتی ڕای زۆرینە، یا ڕای کەمەینە هەڵبژێرێ" [6].

".. پێشەوا ئەبوو بەکر (خوای لێ ڕازی بێت) لە دوو مەسئەلەدا ڕای کۆمەڵەکەی ڕەت کردەوە و بە ڕای خۆی جوڵایەوە: یەکەمیان: جەنگ کردن بوو لەگەڵ پاشگەزبووەکان لە ئیسلام... هیچ کەسێکیش ڕەخنەی لێ نەگرت ونەیان وت تۆ چۆن سەرپێچی ڕای "ئیجماع" ی موسڵمانان ئەکەیت..؟ ! دووەم: سەبارەت بە پیادەکردنی سوپاکەی "ئوسامەی کوڕی زید" ە.. دەی ئەم یەك دوو ڕووداوە ــ هەرچەند کەمیش بن ــ بەڵگەن بۆ ئەوە کە "حاکم = سەرۆك دەوڵەت" پێویست نی یە بچێتە سەر ڕای ئەنجومەنی ڕاوێژ ئەگەر باری بەرژەوەندی ڕاکەیانی بۆ دەرنەکەوێ" [7].

مامۆستای خزمەتگوزاری ئیسلام "ئەبو ئەعلای مەودودی" ئەڵێت: "زانایان لە ڕەوشتی هاوەڵەکانەوە ــ لەسەردەمی خیلافەتی ئیسلامیدا ــ وەریان گرتووە کە: لە پلەی یەکەمدا سەرۆك دەوڵەتە لێپرسراوی ڕاستەوخۆ سەبارەت بە کاروباری وڵات، وە پێویستیشە لەسەری کە بەپێی تەکبیرو ڕاوێژی ئەهلی "حەلل و عەقد" بڕوا بە ڕێوە.. لەگەڵ ئەمەیشدا

---

[1] ) رواه الترمذی وابن ماجه بلفظ (( عليكم بالسواد الاعظم )) .

[2] ) اخرجه الترمذی وابن ماجه بلفظ (( عليكم بالجماعة فأن يدالله مع الجماعة )).

[3] ) تفسير الطبرى/ ( ب7 / ل346) .

[4] ) تفسير الطبرى .

[5] ) ابن تيمية / السياسة الشرعية ، ص 136 .

[6] ) دكتۆر عبدالكريم زيدان : اصول الدعوة ، ص 172 .

[7] ) د. عبدالحميد متوالى: مبادي نظام الحكم في الاسلام ، ص 667 .

نەبەستراوە بەوەوە کە ئەبێ هەر بەگوێرەی ڕاکەی ئەوان ــ هەموویان یا هەندێکیان ــ ڕەفتار بکات، وەیا بە لێکدانەوەیەکی تر بلێین: سەرۆك دەوڵەت بۆی هەیە مافی ڤیتۆ(vito) بەکار بهێنێت"[1]. بەڵێ مەودودی یەکێکە لەو زانایانە کە زۆر پێشکەوتوو و باڵا دەستن لە ــ (فیقهی دەستوری ئیسلامیدا) بەڵام ــ هەرچەند ڕای ئەوە بوو باسمان کرد ــ ئەو چارەیەکی تری داناوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان سەرۆك دەوڵەت و ئەنجوومەنی ڕاوێژ لەم چەرخەدا، ئەویش ئەوەیە کە: پێویستە سەرۆك دەوڵەت بڕواتە سەر ڕای زۆربەی ئەندامەکانی ڕاوێژ کە کاری یاسادانان لە ئەستۆ دەگرن.

(مەودودی) نموونە دێنێتەوە بۆ ڕاکەی بەو دوو بەسەرهاتە کە لەسەردەمی ئەبوو بەکردا ــ ڕەزای خوای لێ بێت ــ ڕوویاندا، ئینجا دوای ئەوە ئەفەرموێ: "هاوەڵەکان کە دابەزین لە ڕاکەی خۆیان: "لەبەر ئەوە نەبوو کە یاساکە مافی دابێ پێی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ڕاکەیان و ناچار بن بۆ وەرگرتنی ڕاکەی ئەو، با پێیشیان ناخۆش بێت، هۆکە ئەمە نەبوو، بەڵکو ئەوان متمانەی تەواویان بوو بە ئەبوو بەکر و پێشتر ناسیبوویان بە دەم ڕاست و ڕەوشت پاك.. جا لەدوایدا کە بینییان ڕاکەی تەواو پەسەندە و بەرژەوەندی یەکی گەورەی تێدایە بۆ ئاین لە ڕاکەی خۆیان دابەزین و زۆریش سوپاسیان کرد سەبارەت بە ڕاکەی و وتیان: ئەگەر ئەبوو بەکر نەبوایە بەو هەموو خۆگرتن و ئارامی یەوە بەتەواوی ئیسلام ڕیشەکەن ئەکرا.."[2].

## ڕای هەڵبژێراو:

ڕای پەسەند کراو ــ بەپێی بەڵگە و شایەتی مێژوو ــ ئەمەیە کە: سەرۆك دەوڵەت خۆی هەڵستێ بڕیار دەربکات بۆ وتەی لایەك و لایەکیان پەسەند بکات، ئیتر ڕای زۆرینە بێت، یان کەمینە بێت، وەیا هەر ڕای خۆی بێت بە تەنیا؟.. با ئەوەیشمان لەبیر نەچێت کە مەبەست بەم (سەرۆك دەوڵەتە) ئەو پیاوەیە کە پەسەنکراوی (ئیمامەت) و خیلافەت بێت بەپێی شەریعەتی خوا، وە هەڵبژێراوی ئەهلی (حەل و عەقد) بێت، واتە خاوەن بڕوا و دامەزراو و دوور لە هەواو ئارەزووی گیانی و دوور لە حیزبایەتی و چینایەتی بێت لە فیکری ئیسلامیدا دوو ڕا هەیە لەسەر ئەوەی ئایا (شورا) سەرۆکی دەوڵەت ئیلزام ئەکات، یان سەرۆکی دەوڵەت (شورا) ئیلزام ئەکات، هەرچەندە مامۆستا ئەحمەد ڕای دووهەمیانی هێناوە، بەڵام ڕاست ئەوەیە کە (شورا) سەرۆکی دەوڵەت و حکومەت ئیلزام ئەکات و مەودودیش بەڕەحمەت بێت لە نوسینە کۆتاییەکانیدا هاتەوە سەر ئەم ڕایە و فەرموی: ئەم ڕای یەکەمە باشترین گرنتی یە بۆ ئەوەی سەرۆکەکان تاکڕەوی ودیکتاتۆرییەت دەست نەدەنێ، لە فکری ئیسلامیدا (حەکەم) یان بەزاراوەی تازە (مەحکەمەی دەستوری) بڕیار لەم حاڵەتانەدا ئەدات.. (تیشك).

### بەڵگەش بۆ ئەم هەڵبژاردنە:

یەکەم: فەرموودەی زانایان و پیاوە هەڵکەوتووەکانی تفسیری قورئان کە ئەڵێن: خوا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ) "وشاور هم في الامرفإذا عزمت فتوكل على الله" واتە کە لایەنەکەت هەڵبژارد ــ دوای تەکبیرو ڕاوێژ پێیان ــ ئیتر پشت بە خوا ببەستە.

جا زانایان ئەڵێن خوا پێغەمبەری ناچار نەکردووە بەوەی کە ڕای لایەکیان ــ زۆرینە یا کەمینە ــ هەڵبژێرێ، بەڵکو ئارەزووی خۆیەتی ڕایەك پەسەند بکات و لەسەری بڕوات.

دووەم: کۆمەڵە فەرموودەیەك هاتوون داوا ئەکەن گوێ بۆ ڕاو بۆچوونەکانی (ئیمام) بگیرێ بە مەرجی ئەوە لانەدات لە فەرمانی خوای گەورە وەك:

أ ــ السمع والطاعة على المرء المسلم فيما احب وكره مالم يؤمر بمعصية، فاذا أمر بمعصية فلا سمع ولا طاعة

ب ــ اسمعوا وأطيعوا وان استعمل عليكم عبد حبشي كأن راسه زبيبتة.

ج ــ من رأى من أميره شيئا فكرهه فليصبر فأنه ليس أحد يفارق الجماعة شبرا فيموت الامات ميتة جاهلية. (البخاري)

---

[1] ) ابوالاعلاى المودودى: نحو الدستور الاسلامي ، ص 63 .

[2] ) ابو اعلى المودودى : نحو الدستور الاسلامى ص 65 .

سێهەم: پێشەوایان (ئیجماع) یان بەستووە لەسەر ئەوە کە باسە ئیجتیهادییەکان کاتێ ئەبن بە حوکمی شەرعی و یاسا کە "حاکم = سەرۆك دەوڵەت) پەسەندیان بکات و ڕایان لەسەر بدات. ئیمامی قورافی ئەفەرموێ: ((...... دەستەی زانایان بە تێکڕا لەسەر ئەوەن کە ئیجماعیان دا لەسەر باسێکی ئیجتیهادی ئەوە ئەبێت بە فەرمانی شەریعەت و پێویستە گوێڕایەڵیش بکرێ و هیچ کەسێکیش بۆی نییە هەڵیوەشێنێتەوە".

چوارەم: مێژووی پێشووی ئیسلام _ لە چەرخی جێ نشینەکانا _ وانیشان ئەدا کە ئەگەر کێشەو جیاوازی پەیدا بوو لە نێوان سەرۆك دەوڵەت و ئەنجوومەنی ڕاوێژدا ئەبێ بە قسەی سەرۆك بکرێ.

پێنجەم: شەریعەتی ئیسلامی بەتەواوی سەرۆك دەوڵەت لێپرسراو ئەکات لە پلەی یەکەمدا لە هەموو هەڵسووکەوتێکیدا.. لەگەڵ ئەمەیشدا پێویستە سەربەستی بدرێتێ بۆ هەڵبژاردنی بارێك "پێویست نی یە لەسەر سەرۆك دەوڵەت بکەوێتە دوای ڕای ئەم و ئەو ئەگەر قەناعەتی پێ نەبوو، چونکە مرۆڤ کە ئەڵێین بەرپرسیارە لە هەڵسووکەوتیدا.. ئەمە مانای وایە بە ئارەزووی خۆی ئیش ئەکات و ڕای خۆی دەربەبڕێ، نەك کار بکات و ڕای ئەم و ئەو پیادە بکات لەگەڵ ئەمەیشدا پێی ناخۆش بێت" [1] ... ئەمانە و هەندێ بەڵگەی تریشمان بەدەستەوەیە بۆ ئەم ڕایە، ئیتر بە هیوام سوود بەخش و بەکەڵك بێت.

بەڵێ ئەمە _ کە ڕای سەرۆك دەوڵەت بخوات _ کاتێ ولیە کە زۆربەی ئەندامەکانی کۆڕی ئەنجوومەنی ڕاوێژ سوور نەبن لەسەر وتەکەی خۆیان، خۆ ئەگەر لە ڕاکەیان دانە ئەبەزین و بەلایانەوە وابوو کە ڕای سەرۆك دەوڵەت ڕاست نییەو ناگونجێ لەگەڵ قورئاندا، ئەوە دروست نییە ڕەفتاری پێ بکرێ و بکرێ بە یاسا، بەڵکو ئەبێ ناوبژیکەرێك (حەکەم) دابنرێت.

ئەمەیش ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەبێ لەناو دەوڵەتدا ئەندامەکانی ڕاوێژ، ئەم دادگایەش ئەبێ سەرۆك دەوڵەت و ئەندامەکان پێی ڕازی بن. وە ئەبێ دوای ئەوەی بڕیاریان دەرکرد ئیتر سەرۆك دەوڵەت و ئەنجوومەنەکە بچنە سەر ڕایان و بەگوێیان بکەن.

وە ئەبێ ئەو دادگایە لەژێر تیشکی قورئان و فەرمودەدا ئەو گرێیە شیتاڵ بکەن... وە ئەگەر کێشە و ناکۆکیان کەوتە ناوەوە ئەبێ ڕای زۆربەیان هەڵبژێرن.

بەڵگە بۆ ئەوە ڕەوا بێت کە (حەکەم) بکەوێتە نێوان سەرۆك دەوڵەت و ئەنجوومەنی ڕاوێژەوە ئەوە بوو کە: لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەتتابدا) ڕوویدا: ئیمامی عومەر ڕای وابوو ئەو زەوییەی کە لە (عێراق) و (شام) دا کەوتۆتە دەستی موسڵمانەکان دابەش نەکرێ لە نێوان (موجاهیدەکان) دا بەڵکو (وەقف) بێت لەسەر موسڵمانانی ئەو کاتە و دواتریش، وە ڕای زۆربەی ئەهلی (حەل و عەقد) وابوو کە دابەش بکرێ بەسەر موجاهیدەکانا" [2] کاتێ خەلیفە لەسەر ڕاکەی دانەبەزیی، وە ئەوانیش لە ڕاکەی خۆیان دانەبەزین چونکە بەلایانەوە وابوو کە لەگەڵ دەقی قورئاندا ڕاکەی ئیمام ناگونجێ...

ئینجا لەم کاتەدا (عومەر) ڕاوێژی کرد بە دەستەی (حەل وعەقد)، سەرئەنجام هەندێکیان هاتنە سەر ڕاکەی و هەندێکیشیان ڕایان پێچەوانە بوو، بەتایبەت موجاهیدەکان، وە ئەم کۆمەڵە زیاتر بوون لەوانی تر... کاتێ هەردوولایان هەر سوور بوون لەسەر ڕاکەیان، وە نەگەیشتنە ئەنجام، ئینجا ئیمامیش و ئەوانیش (دە) کەسیان لە یارمەتی دەرەکان _ پێنجی ئەوس و پێنجی خەزرەج _ کرد بە حەکەم و داوایان لێکردن کە ئیمامی عومەر وادابنێ کەتەنیا موسڵمانێکە و هیچی تر، واتە بە چاوی جێ نشینیەوە سەیری نەکەن، جا ئەو کاتە ئیتر بەپێی قورئان و فەرموودە حوکم بکەن.

ئینجا بڕیاری ئەم دەستەیە دەرچوو کە ڕاکەی (ئیمام) لەگەڵ قورئانا گونجاوترە... ئیتر عومەر بێ دوودڵی بڕیارەکەی خۆی پیادە کرد.

---

[1] ) د. عبدالكريم زيدان : اصول الدعوة ،ص 174 .

[2] ) خوێنەری ئازیز ئەم باسی (( شوورا )) یە کە خرایەپێش چاوت کەمێك بوو لە یاسا قەشەنگەکەی ئیسلامی پیرۆز . و زۆربەی ئەم باسەم لە کتێبی (( الدولة القانونية والنظام السياسى الاسلامى )) وەرگرتووە . لە نووسینی / د. منيرحميد البياتى .

لێرەدا شتێك ماوە كە بیخەینە پێش چاوی خوێنەرە ئازیزەكان، ئەویش ئەمەیە: ئەگەر كۆڕی ئەنجوومەنی ڕاوێژ پێویستیان كردلە سەر سەرۆك دەوڵەت كە هەركات كێشە لە نێوانیاندا پەیدا بوو، وە زۆربەی ئەندامەكان ڕایان جیاواز بوو لەگەڵیا ئەبێ لە ڕاكەی خۆی دابەزێ و بێتە سەر ڕاكەی ئەمان، ئینجا لەسەر ئەم بناغەیە پەیمانیان دایە، ئایا ئەم مەرجە دروستە، یا نەء؟ وە ئایا ڕەفتاری پێ ئەكرێ، یا نەء..؟.

بەڵێ، ئەم مەرجە ڕەوایە و ڕەفتاری پێ ئەكرێ چونكە پەیمان و بەیعەت لە نێوان "ئەمیر" و نوێنەری گەلدا دروستە هەندێ مەرجی بخرێتە پاڵ، بەڵام ئەویش بەومەرجەیە كە نەڕوا بە گژ دەقێكی قورئاندا، یا فەرموودەدا، چونكە (عبدولڕەحمان) كاتێ پەیمانیدا بە ئیمامی عوسمان داوای لێكرد كە بەپێی قورئان و فەرموودە بجوولێتەوە، وە لەسەر نەخشە و سیاسەتی خەلیفە پێشووەكان بڕوا. ئیمامیش بڕیاری دا وابێت. كەچی ئیمامی (عەلی) ئەم مەرجەی ڕەفز كردو پێش چاوی نەگرت فەرمووی ئەگەر بتوانم. دەی ئەگەر (بەیعەت) مەرجی تری هەڵنەگرتایە نە (عەبدولڕەحمان) باسی ئەكردو نە ئیمامی عوسمانیش وەری ئەگرت . خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

ئەمە شێوەی هەڵبژاردنی سەردەمی یەكەمی موسڵمانان بوو، سەبارەت بە دەست نیشان كردنی ئەنجوومەنی ڕاوێژ.. ئینجا بۆ ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامیی ئەبێ "كۆمەڵ" هەڵسێ بە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنەكە، وە ئەبێ سەربەستیان بدرێتێ لە هەڵبژاردنەكەدا، تا پتر هەق و ڕاستی وە دەركەوێ و بتوانن مرۆڤی چاك بدۆزنەوە ئینجا پێویستە ئەم سەربەستیشە لە چوار چێوەی فیقهی ئیسلام دەرنەچێ، واتە لە پێش هەموو شتێكەوە "ئایین" پێش چاو بگیرێت، وە مەبەست لەو هەڵبژاردنەیە دەركەوتنی هەق بێت،... نەك بكرێت بە پەیژە بۆ توانج و تەشەر لە زانایانی ئیسلام، نابێ تۆوی (گەندەڵی) و خراپەكاری ــ بەناوی دەربڕینی ڕای خۆیەوە ــ بڵاوبكاتەوە.

لەڕاستیدا تەنها ئازادكردنی گەل بۆ دەربڕینی ڕای خۆی بەس نییە، بەڵكو ئەبێ ــلەگەڵ ئەوەیشدا ــ ئیسلامێكی پاك و ڕاست و ڕەوان بڵاوبكرێتەوە و بخرێتە مێشكی گەلەوە، ترسی خوای گەورە بخرێتە دڵیانەوە، تا نەتوانن گزی و ناپاكی بكەن[1]. (بەپارە ڕای خەڵكی بكڕن، خزمایەتی و حیزبایەتی ڕۆڵ ببینێ) چونكە ئەگەر مرۆڤەكان ترسی خوایان لەدڵدا نەبێت وەك ئێستامان لێ دێت.

لە كۆتاییدا:

بەپێی تۆماركردنی ئەو ڕووداوە مێژووییانە ڕوون بوویەوە كە: ئەوانەی سەرۆك دەوڵەت ڕاوێژیان پێ ئەكات جیاوازییان هەیە بە گوێرەی بابەتی "شوورا" كە، ئەگەر بابەتی شووراكە لەكاروبارە گشتییەكان بوو، ئەوە ئەگەر ــ بگونجێ ــ پێویستە ڕای گشتی كۆمەڵەكە وەربگرێ، ئەگەر ئەمەیش نەگونجا، دەستەی "حەلل و عەقد" یان. وە ئەگەر بابەتی شووراكە پێویستی بە هەندێ وردەكاری و بیر تیژییەوە بوو، ئەوە ئەبێ سەرۆك دەوڵەت تەگبیرو ڕاوێژ بەوانە بكات كە پسپۆڕن لەو ئیشەدا.

ئیمامی قورطبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە تەفسیرەكەیدا ئەمەی ڕۆشن كردۆتەوە: "واجب على الولاة مشاورة العلماء مما لايعلمون وما اشكل عليهم من امور الدين، ووجوه الجيش فيما يتعلق بالحرب، ووجوه الناس فيما يتعلق بالمصالح. ووجوه الكتاب والوزراء والعمال فيما يتعلق بمصالح العباد و عمارتها... الى ان قال".. "قال العلماء صفة المستشار ان كان في الاحكام ان يكون عالما ودينا / و صفة المستشار إن كان في الامور الدنيا ان يكون عاقلا مجربا".

[1]) اصول الدعوة، ص177 .

## دووەم: دەسەڵاتی پیادەکردن لە ڕژێمی ئیسلامیدا

ئیسلامی پیرۆز لە ڕێگەی بەیعەت وەرگرتنەوە دەسەلآت دەداتە حاکم "ئەمیر" تا لەجیاتی گەل و کۆمەڵ کاروبار ببات بەڕێوە و مافی بیٚ دەستەڵاتان جێبەجیٚ بکریٚ.

"ئیبن خەلدوون" (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) ئەڵێت "بەیعەت بریتیە لە پەیمان دان بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری، واتە بەیعەتدەر پەیمان ئەدات بە "ئەمیر" کە ئەو کاروباری خۆی و موسڵمانان ببات بەڕێوە، بیٚ ئەوەی سەرپێچی بکات، ئینجا ئەمیش ئامادە بێت بۆ گوێڕایەڵی لە هەموو کاتدا، لەو سەردەمەدا شێوەی بەیعەت وابوو هەرکات بەیعەتیان بکردایە بە ئەمیر دەستیان ئەخستە ناودەستیەوە بۆ زیادە متمانە بوون بەبەیعەتەکە"[1] شێوە و شێوازی بەیعەتەکەیش بەم جۆرەیە: "ئەوا بەیعەتمان دایتیٚ، بەیعەتی ڕەزامەندیی، بۆ بەرقەرارکردنی دادگەری و هەڵسان بە کاروباری پێشەوایەتی.."[2].

هەندیٚ کاتیش لەلایەن تاقمی "حەل و عەقد"ەوە، وە لەلایەن جەماوەری موسڵمانانەوە سەرۆك دائەنریٚ. بۆ ئەمەیش "ئەبوول حەسەنی ئەشعەری" ئەڵێت: "بەڵگەی پێشەوایەتی ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) ئەوەبوو موسڵمانەکان بەتێکرا ملکەچی بوون و شوێنی کەوتن و وتیان "یاخلیفة رسول الله".

ئەو کەسەی موسڵمانەکان هێزی ئەدەنە دەست و ئەیکەن بەسەرۆك دروستە ـ لە فەرهەنگی ئیسلامدا ـ پێی بگوتریٚ "ولی الامر" چونکە خوا ئەفەرمویٚ: "…. وأولى الأمر…" وە دروستە پێی بگوتریٚ "خەلیفە" لەبەر ئەو فەرموودە کە ئەفەرمویٚ : "… وأنه لانبى بعدى وسيكون خلفاء…" پێی بگوتریٚ "ئەمیر" لەبەرئەو فەرموودەیە کەئەفەرمویٚ: "من بايع اميرا…" وە پێی بگوتریٚ: "أمير المؤمنين" چونکە ئیمامی عومەریان ناونا "ئەمیرلمؤنین" و هاوەڵەکان هەموویان پێی ڕازیی بوون. وە هەروەها دروستە پێی بڵێن: "ئیمام" لەبەر ئەم ئایەتە: "ونريد ان نمن على الذين استضعفوا في الارض ونجعلهم أئمة"[3]. وە ئایەتی: "إنى جاعلك للناس إماما"[4]، یا پێی بڵێن "حاکم" لەبەر ئەم ئایەتە: "يا داود إنا جعلناك خليفه فى الارض فاحكم بين الناس بالحق.."[5]. واتە پێشەوای موسڵمانان بەهەر ناوێکەوە لەمانە ناوبنریٚ دروست و ڕەوایە….

### بەڵگە بۆ ڕەوایی بەیعەت:

1ـ لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: "إن الذين يبايعونك انما يبايعون الله يدالله فوق ايديهم.." الفتح / 10..

"يأيها النبى إذا جاءك المؤمنات يبايعنك على ان لايشركن باالله شيئا…" الممتحنة / 12…

"لقد رضى الله عن المؤمنين إذ يبايعونك تحت الشجرة…" الفتح / 18.

2ـ لە فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەردا هاتووە: "من بايع أميرا فأطاه صفقة يده وثمرة قلبه فليطعه إن استطاع..))[6] هەرکەسێك بەیعەت بکات بە "ئەمیر" یێك وە دەستی نایە ناو دەستی و دڵی دایە… با بەپێی دەسەلآت گویٚ ڕایەڵی بکات. "ومن مات وليس في عنقه بيعة مات ميتة جاهلية"[7].. "تبايعوننى على أن تشهدوا ان لا اله الا الله وانى رسول الله…"[8]. دیارە لەم دەقانەوە دەرئەکەویٚ کە "بەیعەت" عەهد و پەیمانێکە ئەبیٚ بایەخی بدرێتیٚ و ببریٚ بەڕێوە. بێجگە لەوەی کە

---

[1] ) ابن خلدون: المقدمة ،ص 209 .
[2] ) الاحكام السلطانية ، ص9 ( ابو يعلى الفراء ) .
[3] ) القصص /5 .
[4] ) البقرة / 26 .
[5] ) ص / 26 .
[6] ) ابن حزم : المحلى ، (ب9 ل439 ) .
[7] ) لەپێشەوە ماناکراوە .
[8] ) الطبقات الكبرى ب3 ل609 .

قورئان و فەرمووده بەیعەت ئەسەلمێنن ئیجماعیشی لەسەرە، وەك لەسەردەمی "ئەبوبەکر"دا (خوا لێی ڕازی بێت) موسڵمانەکان بڕیاریان دا کە بە بەیعەت دەسەڵات و هێزی پیادەکردنی کاروباریخەن ئەستۆی "ئەمیر" .

### نوێنەرایەتی لە پەیماندان "بەیعەت" دا

بەڵێ لە یاسای ئیسلامدا دروستە ئەنجوومەنی ڕاوێژ لە جیاتی "گەل" بەیعەت بدەن بە ئیمام... پاشان خەڵکەکە، تاکە، تاکە دێن بەیعەت ئەدەن بۆ پتەوکردنی زیاتری بەیعەتەکە.

بەڵگەی ئەمەش ڕەوشتی پێغەمبەری ئازیزمانە (ﷺ) ئەوە بوو لە "حودەیبییە" دا خۆی لە باتی ئیمامی عوسمان بەیعەتی کرد.

### پایەکانی بەیعەت

### یەکەم: "ئەمیر یا خەلیفە"

دیارە ئەمە هەموو مرۆڤێك بەکەڵکی ئەم کارە نایەت، بەڵکو ئیسلامی پیرۆز هەندێ مەرجی بۆ دەست نیشان کردووە تاهەموو کەسێك، چاك و خراپ، دەست نەکێشێتە کارەکەوە، چونکە "خیلافەت" ئەرکێکی قورسە، کارو باری کۆمەڵ هەمووی ئەکەوێتە سەرشانی ئەمیر.

ماوەردی ئەفەرموێ: "ئەو کەسەی ئەبێ بە "ئیمام" پێویستە ئەم حەوت مەرجەی تێدا بێتە دی:

1- داد گەری بەمەرجەکانیەوە.

2- زانیارییەکی وای هەبێت کەڕووداوێك ڕویدا بتوانی "ئیجتهادی" بۆ بکات.

3- کەڕو کوێرو لاڵ نەبێت تابتوانێ هەڵسێ بە ئەرکی سەرشانی خۆی.[3]

4 - ئەندامەکانی سەلامەت بن لەهەرناتەواەییەك کەبەرگری بکات لەجم و جووڵ و چوستی و چالاکی .[2]

5- خاوەنی ڕاو بیرێکی وابێت کەبتوانێ بەشێوەیەکی سیاسیانە چاودێری بەرژەوەندی یەکانی گەل و کۆمەڵ بکات.

6- وریاو چالاك بێت، بەسێوەیەك کەبتوانێ سنورەکانی بپارێزێت و بڕوا بەگژ دوژمنانی ئیسلامدا.

7 - بەنەژادو ڕشتە "قورەیشی" بێت، چونکە ئیجماعی "ئوممەت"ی ئیسلامی لەسەرەو فەرموودەی پێغەمبەریشی دەربارەی بۆ هاتووە.." .[3]

بێجگە لەمانیش دوو مەرجی ترمان هەیە بۆ دانانی "خەلیفە":

یەکەم: موسڵمان بێت.. چونکە خوا ئەفەرمووێ: "... اطیعوا الله واطیعوا الرسول وأولی الامر منکم.." واتە: موسڵمانەکان گوێڕایەڵی فرمانی "ئەمیر"ێ بن کە لەخۆتان بێت. کەوابوو "والی" هەرئەبێ موسڵمان بێت. بێجگە لەمەیش خوا ئەفەرمووێ: "ولن یجعل الله للکافرین علی المؤمنین سبیلا". (النساء: 141). خوا بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی نەداوە کافر دەسەڵاتی هەبێ بەسەر موسڵماندا.

دووەم: ئەبێ نێرینە بێت: "الرجال قوامون علی النساء..". (النساء: 24). پیاوان زۆر شایەن و زۆر بەدەسەڵاتن بۆ ڕاگرتنی ئافرەتان. هەم فەرموودەیەکی پێغەمبەریش (ﷺ) هەیە ئەفەرمووێ: "لن یفلح قوم ولوا امرهم امرأه"[3] هەرگیز سەرکەوتوو نابێت ئەوگەلەی کاروباریان بسپێرن بەئافرەت.

---

3 ) ئەم مەرجە دەقێکی ئەو تۆی لەسەرنییە .

[2] ) ئەم مەرجەش دەقێکی ئەو تۆی لەسەرنییە .

[3] ) ئەم مەرجە جێگەی مشت و مڕی زانایانە و لافی " ئیجماع " لەمەدا ڕاست نی یە و فەرموودەی زۆر هەیە کە خەلیفە هەرکەس بێت پێویستە بەیعەتی پێ بدرێ ئەگەر عەبدێکی حەبەشیش بێت ، ئیمامی عومەریش ( رض ) ئەفەرموێ (( لو کان سالم مولی حذیفة حیا لولیتە )) ، لە مێژوی ئیسلامیشدا تەنیا لەکاتی بەهێزی قورەویشداکار بەو مەرجە کراوە وەك " ئیبن خلدون " لە (( المقدمة )) دا ئەم ڕایەی پشت ڕاست کردوەتەوە .. (( تیشك ))

3 ) الشوکانی ، نیل الاوطار( 8 /219 ) .

بەڵێ، ئەمە ڕای ئیسلامە سەبارەت بەوەی ئافرەت دروست نییە بکرێ بە "خەلیفە". دیارە بۆ مرۆڤی موسڵمان هیچ بەڵگەیەکی تر پێویست نییە، دوای ئەوەی کە فەرموودەی خوا و پێغەمبەری لەسەرە... بەڵام ئەو کەسە بڕوای وانییە، بابڕوا چاوی بگێڕێ بەوڵاتانا و ئینجا قەڵەمێك بگرێ بەدەستییەوە بۆ نووسینی سەرۆك دەوڵەتەکان ـ لەو وڵاتە پێشکەوتووانەدا ـ تابزانێ چەندیان ئافرەت بوون و، چەندیشییان پیاو بوون، جا بەراوردێکیان بکات بزانێ کامیان زۆرن؟ ئینجا ئەو کاتە بۆی دەرئەکەوێ کەڕێژەی ئافرەتان زۆر زۆر کەم بوە لەچاو پیاواندا... دیارە ئەمە مانەی وایەکە ئافرەت زۆر کەم گونجاوە وە بەپێی تاقییکردنەوە بۆسەرۆکایەتی وەئەو تاکە تاکەش هەلومەرجی تایبەتیان هەیەو...، ئاشکرایشە "ئاین" ڕۆڵی نەبووە لەمەدا[1].

**لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی مەرجی نەژاد "نەسەب":**

ئیبن حەزمی ئەندەلووسی ئەلێت: "خیلافەت ڕەوانییە بۆ کەسێ نەبێت کە لە قوڕەیش بێت.." چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: "لایزال هذا الامر في قريش مابقي في الناس اثنان"[2]. واتە: ئەم کاروبارە هەر ئەبێ بەدەست قوڕەیشەوە بێت تا دوو کەس بمێنێ، دیسانەوە هاتووە: "عن معاوية انه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ان هذا الامر في قريش لايعاديهم احد الا اكبه الله على وجهه ما أقاموا الدين"[3] واتە: بێ گومان ئەم فرمانە "خەلیفە" لە قوڕەیش دەبێت، وە هەرکەسێك دوژمنایەتیان لەگەڵ بکات خوا ئەیخات بەڕوودا بەناو دۆزەخدا بەو مەرجەی کە کاروباری ئاین بەبەن بەڕێوە، ئەم ڕیوایەتە وای گەیاندووە کە کاتێ "ئیمامەت" لە قوڕەیشدا ئەبێت کە بەپێی فرمانی ئەم ئایینی پرۆزی ئیسلامە بجووڵێتەوە، خۆ ئەگەر لایاندا ئەوە هەموو کەس، قوڕەیش و ناقوڕەیش، یەکسانن لە خیلافەتدا و هیچ کەسێکیش پێی گوناهبار نابێت.

"بەغدادی"یش ئەلێت: "بەڵگەی ئەهلی "سوننەت" بۆ ئەوەی کە "ئیمامەت" هەر ئەبێ لە قوڕەیشدا بێت ئەم فەرموودەیە: "الأئمة من قريش" بۆیە لە ڕۆژی "سەقیفە" دا ئەنصارییەکان خیلافەتیان دایە دەست قوڕەیشەکان.

کۆمەڵە فەرموودەیەکی تر هاتوون بۆ ئەم مەرجە: "الأئمة من قريش ما اذا حكموا عدلوا"... "الأئمة من قريش، ان لى عليكم حقا ولهم عليكم مثل ذلك ما ان استرح وا رحموا، وان عاهدوا وفوا، وان حكموا عدلوا فمن لم يفعل ذلك منهم فعليه لعنة الله والملائكة والناس اجمعين"...

"وان هذا الأمر في قريش ما أطاعوا الله واستقاموا على امره"..

"ئەبویەعلا" لە کتێبی "الاحكام السلطانية" دا لاپەڕە (4) ئەلێت: "مەرجەکانی ئەو کەسەی ئەبێ بە ئیمام چوارن: یەکێکیان ئەوەیە لە قوڕەیشیەکان بێت... ئیمامی ئەحمەدیش لە ڕیوایەتێکدا ئەلێت: خەلیفە لە قوڕەیش نەبێت نابێت".

"باقلانی" کاتێ باسی سیفەتەکانی پێشەوا ئەکات ئەلێت: "پێویستە پێشەوا خاوەنی چەند سیفەتێك بێت، یەکێکیان ئەوەیە کە لە قوڕەیشیەکان بێت"[4].

د. محمد ضياء الدين خاوەنی کتێبی "النظريات السياسية الاسلامية" ئەلێت: باقلانی یەکەم کەسێك بووە کە مەرجی "قوڕەیشیەت"ی پشتگوێخستووە.

**تێبینییەك لە وتەی زاناکان و هەڵبژاردنی ڕای پەسەند:**

1) اصول الدعوة ، عبدالرحمن زيدان ، ( ل163 – 164 ) .

2) رواه البخاري ومسلم .

3) رواه البخاري .

4) الباقلانی: التمهيد ل181 .

زانایان [1] بەتێکرا لە مەرجەکانی پێشەوا دواون، وتوویانە "قورەیشیەت" یەکێکە لەمەرجەکانی، بەڵام هیچ کەسێکیان باسی حیکمەتەکەیان نەکردووە. تەنها مێژوو نوس و "فەقیە"ی ئیسلام ـ ئیبن خەلدوون ـ نەبێت، ئەوئەڵێت: وە نەبێت مەرج گرتنی ((قورەیشیەت" داخلی مەرجەکان بێت بێ هۆو حیکمەت؟ !. نەخێر.. بەڵکو بۆیە بە مەرج گیراوە قورەیشی بێت، چونکە قورەیشی خاوەنی هێزو پێز بوون لەو سەردەمەدا، و دەسەلاتیان بووە ـ کە ئەمەیش خاڵی سەرەکی پێشەوایەتییە ـ "ئەگەر چاك بکەین بەلادا و توێژینەوە بکەین لە حیکمەت و فەلسەفەی ئەوە کە پێشەوا بۆ ئەبێ بە ڕشتە قورەیشی بێت... دەرئەکەوێ کە نیازو مەبەستی "شارع" تەنها ئەوە نییە کە پیرۆز ببین بەهۆی ئەوەوە کە قورەیش ئەگاتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ).. هەرچەندە ئەم ئەم پەیوەندییەش ببێت، چونکە مەبەست و نیازی خوای گەورە "تەبەرەکی و پیرۆز بوون نییە" کەوابوو پێویستە حیکمەت و بەرژەوەندییەکی بێ لەم مەرج گرتنەی "قورەیشیەت"دا.

جا هەرچەندە چاو بگێڕین حیکمەتەکەی ئەمەیە کە: قورەیشی کاتی خۆی دەسەلات و هێزوپێزیان هەبووە... دیارە کە ئەمیر لەوان بێت ئیتر پارێزراو ئەبێت لە پەلاماردان و ناکۆکی و شتی وا... کەوابوو ئەو کەسەی کاروباری موسڵمانان ئەگێڕێتە ئەستۆ و ئەبێ بە خەلیفەیان ئەبێ لە هۆزێکی بەهێزو خاوەن دەسەلات بێت، وە هیچ کەسێکی تر نەتوانێ بەرامبەری بکات بۆ ئەوەی خەڵکەکەی تر ملی بۆدانەوێنن..." [2].

جا زانیمان فەلسەفەی ئەوە کە پێشەوا بۆیە ئەبێ قورەیشی بێت چونکە قورەیش دەمارگیری و ڕەگەزپەرستیی تێدایە، دیارە ئەم سیفەتانەش ئەبن بەهۆی پاراستنی ئەمیرو هەڵمەتی ئەمو ئەوو هیچ کەسی تر ناتوانێ بەربەرەکانێی بکات.. وە ئێستایش ئاشکرایە پەیوەندی بەهۆی "ڕشتە، نەسەبە"وە تواوەتەوە لەناو کۆمەڵگە تازەکانی ئەمڕۆدا و نەماوە. لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە هەرکەسێك مەبەستی ئەو مەرجەی تێدا بێت ـ کە ئەویش ئەوەیە زۆربەی جەماوەری لەگەڵ بێت ـ تا خۆشەویستی دەرکەوێ و ناکۆکیشی نەمێنێ لەناو کۆمەڵەکەدا ئەوە دروستە بکرێ بەسەرۆك کۆمار با قورەیشیش نەبێت.

بۆ ئەوەی دەرکەوێ کە زۆربەی خەڵك کێیان خۆشی ئەوێ وەك لە پێشەوە باسمان کرد هەڵبژاردن باشترین ڕێگەیە بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندی کۆمەڵ.

کەوابوو سەرئەنجام هاتینە سەر ئەمە کە: هەرکەسێك جەماوەری موسڵمانان خۆشیان بوێ، ئەوە ئەو کەسە شایەنی ئەوەیە بکرێ بە پێشەوا و خەلیفەی موسڵمانان بەو مەرجانەی باسمان کردن.

خوێنەری بەڕێز:

ئەمانەی باسمان کردن کۆمەڵە مەرجێك بوون پێویستە لە "ئیمام = سەرۆك دەوڵەت" دابێنە جێ، ئەگینا سەرۆکایەتیەکەی دانامەزرێ و هەر حوکمێکیش بکات ناڕەوایە. خۆ ئەگەر ـ بێجگە لەوان ـ هەندێکی تریش پێش چاو بگیررێن، بەپێی شوێن و کات، و بەپێی بەرژەوەندی گشتیی ناوچەو وڵات ئەوە هەر پیرۆزە و قەیناکات، بۆ نموونە:

دروستە ساڵ دیاری بکرێ "واتە ئەو کەسەی ئەکرێ بە "خەلیفە" پێویستە تەمەنی بگاتە ئەوەندە ساڵ ئەوجا بکرێ بەجێنشین" وە دروستە پلەی زانیاریی بۆ دیاری بکرێ، وەیا بڕوانامەی فلان جۆرە زانیاریی بێت، وە هەروەها..." [3].

**کردنی باش( مفضول ) بە خەلیفە لەگەڵ بوونی باشترین( افضل ) دا**

---

[1] ) بێجگە لە (خەواریج) و هەندێ لە ( موعتەزیلە)کان کە بەلایانەوەوایە ئیمامەت بۆ کەسێك ئەبێت حوکم بکات بە قورئان و فەرموودە) ئیتر قورەیشی بێت، یا بڵێین (عەرەب بێت، یان عەجەم) وە فەرموودەی: (الأئمة من قريش) ڕەت ئەکەنەوە و ئەڵێن (ئاحاد)ە ... تەنانەت (زەراری کوڕی عومەر) لەناویاندا و پشتیوانی وای نییە تا یاخی بێت یان ئەڵێت: ئیمامەت لە قورەیش نەبێت باشترە، چونکە ئەوخەلیفە بنەماڵە و تیرەی کەمە، وە هەرکات لای دا لە فەرمانی خوا ئاسانتر بۆمان لائەبرێت.

[2] ) ابن خلدون : المقدمة، ص 195 .

[3] ) الاسلام وأوضاعنا السياسية ص145.

پێویسته پێشەوا بەرزترین خەڵکی ئەو سەردەمەی خۆی بێت لەڕووی مەرجەکانی پێشەوایەتییەوە، بەڵام ئەگەر ئەنجوومەنی ڕاوێژ "بەیعەت"یان کرد بەکەسێك خوارتر (مەفضوول) بوو لە چاو کەسێکی تردا... واتە (ئەفضەل) دەست ئەکەوێ کەچی بەیعەت بە (مەفضوول) کرا ئایا ئەم بەیعەتە دائەمەزرێ یانەء...؟

"ماوەردیی" ئەم وەڵامەمان ئەداتەوە: ئەگەر ئەم "مەفضوول"ە لەناو خەڵکەکەدا ناو و شۆرەت و ڕێزی زیاتر بوو، وە زیاتر گوێڕایەڵی ئەکرا لە ئەفضەلەکە، ئەوە دروستە و ئەو بەیعەتە دائەمەزرێ، خۆ ئەگەر وانەبوو، ئەوە زانایان دوو دەستەن سەبارەت بە دامەزراندنی ئەو بەیعەتە.. "جاحیظ" ئەڵێ: دانامەزرێ و نارەوایە، بەڵام زۆربەی زانایانی "فیقە" و "کەلام" لەسەر ئەوەن کە ئەو بەیعەتە دروستە و دائەمەزرێ ئەگەر مەرجەکانی ئیمامەتی تێدا بێت، چونکە زیادە "فەضل" مەرجی ئەوە نییە کە زیاتر شایەنی هەڵبژاردن بێت" [1].

دیارە لەم کاتەدا کە کێشە هەیە لەنێوان زاناکاندا قسەی جەماوەری زانایان هەڵئەبژێرێ ئەویش بریتییە لەوە: دروستە "مەفضوول" بکرێ بە جێنشین، با "ئەفضەل" یش ببێت، بەڵام باشوایە هەوڵ بدرێ بەیعەت بە (ئەفضەل)ەکە بکرێ.

بۆ پشتگیری ئەم ڕایە زانای وەك "ئیبن حەزمی ئەندەلووسی، ئیمامی غەزالی، ئیمامولحەرەمین". لەگەڵ ئەوەدان کە ئەڵێن: دروستە "مەفضوول" بکرێ بە پێشەوا با "ئەفضەل" یش دەست بکەوێ.

**دووەم: کۆمەڵ و گەل**

پایەی دووەم [2] بۆ پیادەکردنی حوکم لە ئیسلامدا "گەلە" کە ئەویش لە دیمەنی ئەنجوومەنی ڕاوێژدا دەردەکەوێت، واتە ئەنجوومەنی ڕاوێژ ـ وەك باسمان کرد ـ نوێنەری گەلە، کەوابوو "پێشەوا" با (ئەفضەل)ی ئەو سەردەمەیش بێت نابێ لەخۆیەوە بەیعەت بۆ خۆی وەربگرێت، بەڵکو ئەبێ لەلایەن ئەنجوومەنی ڕاوێژەوە بەیعەتی پێ بکرێ و پەسەند بکرێ.

بەڵگەی ئەمەیش وتەی هەندێ لە زاناکانمانە:

بەغدادی ئەفەرموێ: "دەستەی زۆری ئەهلی سوننەت و "موعتەزیلە و خەواریج و نەجارییە" کان لەسەر ئەوەن کە هەڵبژاردنی پێشەوا هەقی گەل و کۆمەڵە" [3].

"ئیبن خەلدوون" یش ئەفەرموێ: کاتێ قسە ئەکات لە دانانی پێشەوا "هەڵبژاردنی ئیمام فەرزی کیفایەیە و بەدەست ئەهلی حەل وعەقدیشە" [4].

"ماوەردی"ی ئەفەرموێ: "پێغەمبەر (ﷺ) زەیدی کوڕی حاریسەی کردە پێشەوای سوپاکەی (مؤتة) فەرموی: ئەگەر ئەو پێوە بوو "جەعفەری کوڕی ئەبوو تالیب" وە ئەگەر ئەویش پێوە بوو "عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە"، ئەگەر عەبدوڵڵایش

---

[1]) الماوردی : الاحکام السلطانیة، ص8 .

[2]) پایەی یەکەم لە پایەکانی بەیعەت بریتی بوو لە خەلیفە و پێشتر باسکراوە .

1) شیعە جەعفەریەکان دان نانێن بەوەدا کە پێشەوا گەل هەڵی ئەبژێرێ، بەڵکو ئەڵێن: پێشەوایەتی لە پێغەمبەرەوە براوەتەوە بۆ (ئیمامی عەلی) و کوڕەکانی دوای خۆی، وە خوا بە خوریە (ئیلهام) هەڵی بژاردوون و تایبەتی کردوون بە (خیلافە تە)وە، وە لەهەموو هەڵەو (زەللە) یەك پاراستوونی ... ئەگەر (ئیمام) یان بۆ نەگونجا ئەوە هەر خۆیان ئیمام دائەنێن، جا با (حاکم) یش ببێ و کاروبار ببات بەڕێوە، جا لەم کاتەدا کە (ئیمام) یان خۆی حەشارداوە و نادیارە (جێگر) ی بۆ دائەنێن تا چاو دێری و سەرپەرشتی کاروباری کۆمەڵە ودەستەکەیان بکات .. ئیتر دەوڵەتی سەرحوکم هەر جۆر ببێت. ئینجا دەستەی ئەهلی (سوننەت)یش لێکۆڵینەوە (موناقەشە) یان لەگەڵ ئەکەن، (ئیمامولحەرەمین) ئەفەرموێ: (ئیمامییە) کان ڕایان وایە کە پێغەمبەر (ﷺ) ددانی ناوە بە پێشەوایەتی ئیمامی عەلی دا هەرکەسێك وەری گرێ بۆ خۆی ئەوە ستەمی لێکردووە .. ئینجا پێیان ئەڵێن: ئایا (عیلم) تان بەم مەسئەلەیە هەیە ، یا خۆتان بە ڕەوای دائەنێن ؟ ئەگەرعیلمتان هەیە ، ڕێگەی سەلماندنی چۆنە ..؟ ئەگەر ئەڵێن فەرمودەمان بەدەستەوەیە، ئەڵێین : فەرموودە ئەبێ بەدوو بەشەوە: (موتەواتر)، (ئاحاد) دیارە دەقی (موتەواتیر) تان بەدەستەوە نییە، (ئاحاد) یش عیلم ناگەیەنێ، .. کەوابوو چۆن لافی عیلم لێ ئەدەن ؟ بێجگە لەمەیش (ئیمامییە)کان هەموویان قسەیان یەکە بۆ ئەوە کە: (خەبەری ئاحاد) پێویست نییە عەمەلی پێ بکرێ چ جای ئەوە (عیلم بگەیەنی) ؟ .

[4]) الارشاد الی قواگع الآدله فی اصول الاعتقاد) ل419

پێوە بوو ئینجا با موسڵمانەکان خۆیان پیاوێ هەڵبژێرن... دوای ئەوموسڵمانەکان " خالیدی کوڕی وەلید" یان هەڵبژارد... ئاشکرایە پێغەمبەر (ﷺ) لە "ئیمارەتا" ئەمە بکات مانای وایە لە "خەلیفە" تیشدا دروستە" [1] ئەم فەرموودەیە وا ئەگەیەنێ کەڕەوایە بۆ گەل "حاکم" هەڵبژێرێ" [2].

"ئیمامی غەزالی"یش ڕای وەك ماوەردی وایە.

"ئیبن قدامەی مەقدیسی"ی ئەڵێ: "ئەوکەسەی موسڵمانەکان بڕیاری بۆبدەن بۆ ئیمامەت، وە بەیعەتی پێ بکەن، ئەوە پێویستە لەسەر موسڵمانان یارمەتی بدەن" [3].

ئەمەیش ـ پایەی دووەم ـ چونکە بەپێی قورئانی پیرۆز "ئوممەت" لێپرسراوە بۆ پیادەکردنی بەرنامەی خوای گەورە لە مامەڵە و تۆڵە و شتی وادا، بەپێی ئەم ئایەتانە:

(والمؤمنين والمؤمنات بعضهم اولياء بعض يأمرون باالمعروف وينهون عن المنكر) [4]. وئایەتی: (والسارق والسارقه فاقطعوا أيديهما...) [5]... (الزانية والزاني فاجلدوا كل واحدة منهما مائة جلدة..) [6]..ئەم ئایەتانە و چەندەهای تریش "گەل" ئەکەن بە بەرپرسیار بۆ پیادەکردنی حوکمی خوا، ئاشکرایشە گەل هەمووی پێی ناکرێ هەڵسێ بەم ئیشە کەوابوو پێویستە لەسەری جێنشینێك بۆ خۆی دابنێ.

لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هاتووە کە:لەسەر "گەل " پێویستە دانانی ئیمام و پێشەوا. ئیتر بێجگە لەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کردوو بە هیچ شێوەیەك جێ نشینی دیاری نەکرد... بەڵکو دڵیە دەست "گەل" تائەوان بەئارەزووی خۆیان پێشەوا هەڵبژێرن. سەرەڕای ئەمانە، هاوەڵەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) ئیجماعیان لەسەر ئەوەیە کە هەڵبژاردنی "پێشەوا" هەقی "گەلە".

**سێیەم: دەستەبەرکردنی هێزە بۆ پیادەکردنی شەریعەتی خوا:**

گەل ـ کە ئەنجوومەنی ڕاوێژ نوێنەرایەتی دەکات ـ لەسەرەتاوە "دەسەلآت" بەدەست ئەوە، وەدەسەلآتی ئەوەیشی هەیە ماف هەر کەسێکی تر پسپێرێ.

زانایان لە "بەیعەت" ئەدوێن و باسی ئەوە ئەکەن کە: "حاکم" هەڵسێ بە پیادەی شەریعەت بەم شێوەیە:

ئەبویەعلا ـ کە باسی بەیعەت ئەکات ـ ئەڵێ: "شێوەی "عەقد" مکە بەم جۆرە ئەبێ: ئەوا پەیمانی ڕەزامەندیمان پێدایت بۆ پیادەکردنی دادگەریی وە بەجێهێنانی فرمانەکانی "ئیمامەت و... هتد" [7].

"ئیبنی خەلدوون" ئەڵێ: "ئیمامەت دانراوە بەجێ نشینی پێغەمبەرایەتی، بۆ پاراستنی ئاین و "سیاسەتی" دنیا بە ئاین" [8]. پاراستنی ئاین واتە پیادەکردنی و بڵاوکردنەوەی لە نێوان موسڵماناندا و ڕاگەیاندنیەتی بەو شێوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) گەیاندویەتی [9].

---

[1] ) المقدمة ل193 .

[2] ) الماوردی : الاحكام السلطانية ل13 .

[3] ) المغني ب8 ل107 .

[4] ) النساء /135 .

[5] ) المائدة / 38 .

[6] ) النور / 2 .

[7] ) الاحكام السلطانية، لەم دەقەی (ئیبنی خلدون )دا، سیاسەت بەمانای (( بەڕێوبردن )) دێت ل9.

[8] ) المقدمة /ل145.

[9] ) عبدالكريم زيدان: اصول الدعوة ل183.

پێویستە لەسەر شانی ئیمام بە شێوەیەکی تێرو تەواو چاودێری بەرنامەی خوا بکاو هەوڵ بدا بۆ پیادەی بەرنامەکەی لەعەقیدەو باوەڕو ڕەوشت "خوا پەرستی و مامەڵەی تاك لەگەڵ تاکدا، تاك لەگەڵ دەوڵەتا، دەوڵەت لەگەڵ دەوڵەتی تردا لەلایەنی ڕەوشتی و، کۆمەڵایەتی و، داوەریی و، سیاسی‌ یاسایی و، ئابوورییەوە، بەکورتیی: پیادەکردنی ئیسلام لەهەموو ڕووداوێکدا لەژیانی تاك و دەوڵەتدا: (ثم جعلناك على شريعة من الامر فاتبعها...)[1]

ئەبێ دونیا تێکەڵ بکرێ بە ئایینەوە بەو مانایە کە: دەوڵەت چاودێری کۆمەڵ بکات بەشێوەیەك کە بەرژەوەندی تێدا بێتە جێگە و "زیانی" لێ دوور بخرێتەوە... دیارە ئەمە کاتێك ئەبێت کە ژیان سەد لەسەد بەپێی بەرنامەی خوا ببرێ بەڕێوە، وە بەو نەخشەیە بێت کە ئیسلامی پیرۆز دیاری کردووە"[2].

هەروەها "سیاسەت" ی شەرعیی وا داوا ئەکات بۆ پیادەکردنی کاروباری دنیا ئەبێت ترازووی عەدالەت دابنرێت و ستەم قەڵاچۆ بکرێ لەهەموو لایەنەکانی ژیاندا، گەورە تا بچووك"[3].

تەرازووی دادگەری کاتێ ئەبێت هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی بۆ دیاری بکرێ.

"ئیبن خەلدوون" ئەڵێت: "وا نەزانن ستەم هەر ئەوەیە کە سامان و دارایی لە خەڵکی بسێنرێ بێ بەرانبەر "عیوەض" وەك وابڵاوە لەناو کۆمەڵدا... نەخێر، بەڵکو ستەم زۆر فراوانترە لەوە. هەرکەسێك سامانی هەرکەسێك داگیر بکات، وە یا مافی خۆی نەداتێ، وەیا شتێك بسەپێنێ بەسەریاکە ئیسلام دای نەنابێ... ئەوە بێگومان ستەمی لێکردووە و بە ستەمکار دائەنرێ، کەوابوو ئەوانەی سامان کۆئەکەنەوە بە ناحەق بە ستەمکار دائەنرێ کەوابوو ئەوانەی ماڵی خەڵکی ئەفرێنن ستەمکارن، ئەوانەی مافی مرۆڤ نادەن ستەمکارن... و ئۆباڵی ئەوانە ـ هەر هەموویان ـ لەسەر بەڕێوەبەری دەوڵەتە"[4].

دیسانەوە "سیاسەتی" ئیسلام وا داوا ئەکات کە ئەبێ ئیشوکار بەپێی "کەفائەت" و لێهاتن دابەش بکرێ، وە پێویستە لەلایەن دەوڵەتەوە چاودێری ئەو کار بەدەستانە بکرێ: ئاخۆ چۆن ڕەفتار ئەکەن لەگەڵ ئەو کارەی پێیان سپێراوە... بەڵگەی ئەمەیشمان ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: (إن خير من اسأجرت القوي الامين). واتە: ئەوی بەکرێی ئەگرێت بەڕاستی خاوەن هێزوو دەست پاکە. کەوابوو ئەبێ هەر کەسێك بەپێی دەسەڵات و زانیاری یەکەی کاری بدرێتێ، وە لەچیدا بڕوانامەی هێناوە لەوەدا بخرێتە سەرکار.

ئاشکرایە پێشەوا بەتەنها وڵاتی بۆ ناڕوا بەڕێوە، بەڵکو ئەبێ بە یارمەتی دەستەیەك لە لێپرسراوان بێت، وە تەرازووی دادگەریشی کاتێ هەڵئەواسرێ لەناو وڵاتدا کە ئەوانەی لە دەوروویەری پێشەوادان شایەنی ئەو کارە بن و دادگەریش بن، بێجگە لەمەیش "واقیع" ئەیسەلمێنێ کە هەرکات کاربەدەست لێهاتوو و وریا و چالاك و زیرەك بێت خۆشی و کامەرانی پەلوپۆ بڵاو ئەکاتەوە.. خۆ ئەگەر تەممەڵ بوو نرخی نیشتمانی لەلانەبوو، وەیا چاوچنۆك و پارەخۆر بوو دیسانەوە ئاسەواری لەوڵاتدا دەرئەکەوێ چونکە ئەبێ بەهۆی دواکەوتنی گەل و کۆمەڵگە لەو ڕووەوە.

جا کە هەموو پیاوەکانی دەوڵەت پێکهاتن لە کۆمەڵێکی بە "کەفائەت" و دەستپاك و داوێن پاك لە خواترسن، ئەوجا دادگەری بەتەواوەتی سێبەر ئەکات بەسەر وڵاتدا، وە ستەم نامێنێ، وە دەرگای ستەم و تەماح بازی و زیان گەیاندن بەیەکتر دائەخرێن، لەو لایشەوە ئادەمیزادەکانی ـ هەموویان ـ دەست ئەگرن بە دەوڵەتەکەیانەوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خۆشەویستیان بۆی زیاد ئەکات و نزای بۆ ئەکەن تا خوا بیپارێزێ... ئاشکرایشە تا خەڵك لەگەڵ دەوڵتدا بێت، بەڵام بەڕاستی ئەوە وڵات لە پێشکەوتن و بەختیاریدا ئەبێت، و زێتر ئەمێنێتەوە لە ناوچەکەدا. دەڵێ ئەگەر کاربەدەستەکانی بێ "کەفائەت" وبێ توانا بوون لەکارەکەیاندا ئەو کاتە دادگەری ئەپێچرێتەوە ستەم دێتە جێگەکەیەوە، هەق و ڕاستی پێشێل

---

[1] ) الجاثية / 18.

[2] ) د. عبدالكريم زيدان : اصول الدعوه ل85 بەدەستکارییەوە .

[3] ) ابو يعلى، الاحكام السلطانية ل9 .

[4] ) المقدمة ل223 .

ئەبێ، مۆری بەدبەختی ئەدرێ لەناو چاوی کۆمەڵگەکە... لە هەمووی خراپتر خەڵکەکە خۆشەویستیان نامێنێ بەرامبەر دەوڵەت، وە هەریەکەیان حەز بەڕوخانی و نەمانی ئەکات، وەئیتر هەوڵ ئەدەن بۆ تیاچونی و بەرگریشی لێ ناکەن لەکاتی تەنگانەدا... و "ئۆباڵی ئەمەیش ـ هەمووی ـ لەسەرشانی دەوڵەتە" .

کاتێ کۆمەڵگە بەرەو خراپە ملی نا، ئەوە تاوانەکەی لەسەر "پێشەوا" یە، باپێشی ناخۆش بێت، چونکە ئەم شوانیانەو بەرپرسیاریشە لەهەڵسوو کەوتیان.

بۆیە دەستەی زانایان زۆر "ئیحتیاط" یان کردووە لەم باسەدا ئەوەتە ئەڵێت: پێویستە لەسەرشانی "ئیمام" چاودێری نوێنەران و کاربەدەستەکانی وڵات بکات: "پێویستی سەرشانی سەرەك دەوڵەتە خۆی بۆ خۆی چاودێری کاروبار بکات، چونکە "سیاسەت" ئەوەیە کە گرنگی و بایەخ بدات بەکۆمەڵگە و پاسەوانییان بکات... وەنابێ چاودێریەکە بسپێرێت بەخەڵکی وخۆیشی خەریکی ڕابواردن بێت، یان خەریکی خوا پەرستی بێت ! ! واتە چاودێری ڕەعیەت و ژێر دەستە بکات ئەوە گرنگترە لە خواپەرستی بێجگە لە "فەرزەکان": "یاداود اناجعلناك خليفة في الارض فاحكم بين الناس بالحق ولا تتبع الهوى.." کەوابوو خەلیفە هەرئەبێ خۆی بگەڕێ و هەوڵ بدات ستەم لە هەژاران دوور بخاتەوە، ئەگینە هەرکەسێ ستەمی لێ بکرێ تاوانەکەی دێتە ئەستۆی ئەو، بۆیە خەلیفە کانی ئیسلام هەر خۆیان ئەگەڕان بەناو کۆمەڵ و بازاڕەکاندا.

هەروەها پێویستە لەسەرشانی ئیمام "بڵاوکردنەوەی هێمنی و ئاسایشی لە خاکی ئیسلامدا، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان ترسیان لەگیان و شەرەف و سامانیان نەبێت، ئاشکرایە ئەگەر یاسای تۆڵە وەرگرتن "القانون الجنائيه" لە ئیسلامدا پیادە بکرێ ئەم مەبەستە دێتە جێگە" واتە: هێمنی و ئاسایشی بڵاو ئەبێتەوە.

"ماوەردی" ئەڵێت: "خەلیفە ئەبێ هەڵسێ بەجێبەجێ کردنی "حدود"ەکانی خوا، تا ئەو شتانەی قەدەغەی کردوون بەستیان نەشکێ، وە بۆ ئەوەی ماڤی ئادەمیزادەکان تیدا نەچێت" .

پێویستە لەسەر سەرەك دەوڵەت ئەو شتانەی کۆمەڵگە پێویستی پێی ئەبێ ـ وە پیشەسازی و هەموو جۆرە زانیارییەك ـ بیهێنێتە ڕوو، چونکە ئەو جۆرە شتانە هەموویان "فەرزی کیفایە"ن، وەبە پێی فیقهی ئیسلامی هەرشتێك پێویستی کۆمەڵ بێت ئەبێ دەوڵەت فەراهەمی بهێنێ بۆیان، ئەگەینە بە تاوانبار ئەژمێرێ لای خواو تۆڵەیشی لێ ئەسێنێ، زانای بەرێز "ئیبن عابدین" ئەڵێت: "ئەو پیشەسازیانەی کۆمەلگە پێیان ئاتاجە فەرزی کیفایەن" ئەبێ فەراهەم بهێنرێن بۆ و ڵات و گەل.

ئاشکرایشە پیشەسازی بەپێی کات و شوێن ئەگۆڕێن، جاکە فەراهەمهێنانی هەموو پیشەسازییەکان و جۆراو جۆری زانیارییەکان ـ کە جیهان بەمانەوە ئەڕوات بەرێوە ـ فەرزی کیفایە بن لەمەوە دوو بەرهەممان دەست دەکەوێ:

یەکەم: ئەمە کە پێویستە فەراهەمهێنانیان لە کۆمەڵگەدا، بۆئەوەیە فەرزە کیفایەکە بێتە جێ، جا ئەگەر فەراهەم نەهێنران ئەوە هەم "حاکم"، وەهەم کۆمەڵ گوناحبار ئەبن لای خوای گەورە.

دووەم: خاوەن پیشەسازییەکان بۆیان نییە دەست لەو کارانە هەڵبگرن.. خۆ ئەگەر نەچوونە سەر ئیشەکانیان ئەوە "حاکم" ەکان بۆیان هەیە زۆریان لێ بکەن بەزۆر ئیشەکەیان پێ بکەن... تا فەرزە کیفاییەکان جێبەجێ بن... بۆیە پێشەوا "ئیبنی قەییمی جەوزی" ئەفەرموێت: "والی بۆی هەیە زۆر بکات لە خاوەن پیشەکان بۆ کارکردن بەمافی هاو وێنەیی "أجرة المثل" ئەگەر مانیان گرت لە ئیشەکەیان، لە کاتێکدا ناوچەکە پێویستیان بەو پیشەسازییە هەبوو" .

---

1 ) ابن خلدون / االمقدمة، ل 223

1 ) د. عبدالكريم زيدان : اصول الدعوة ل 188

2 ) الماوردى : الاحكام السطانية ل14

3 ) حاشية ابن عابدين ( ردالمختار ) على ( الدرالمختار ) ب3 ل32

[5] ) ابن قيم الجوزية : الطرق الحكمية ل222 .

هەروەها پێویستە لەسەر سەرەك دەوڵەت هەوڵ بدات بۆ "بەرهەم" وەدەستهێنان لە خێرو بێری وڵات، چونکە ئەوە یەکێکە لە پێویستیەکانی "ئیمامەت"، واتە ئەبێ دامودەزگای حوکم تێ بکۆشن بۆ فەراهەمهێنانی بەروبووم لەوناوچە و وڵاتەکەدا، تا دانیشتوان و هاو وڵاتیان بەرەفاهییەت ژیان بەرنە سەرو بۆ هیچ شتێك دانەمێنن، ئەگینا بێگانەکان دەست ئەخەنە ناو وڵاتمانەوە بەناوی پیشەسازییەوە وە جاسووسی و سیخوڕی ئەکەن بەسەر هاو وڵاتیانەوە زۆربەی هاونیشتمانیەکان ـ بێ ئەوەی کەس پێیان بزانێ ـ دەبنە سیخوڕ بۆیان.

کەولبو ئەبێ دەوڵەت هەوڵ بدات چەندەها کارگەو پیشەسازیی دروست بکات بۆ وڵات، تا مرۆڤەکان پێی بژین و ئیش زۆر ببێ و قات و قڕی دروست نەبێ لەناویاندا...

پێویستە چاوبگێڕێ ـ بەهۆی پسپۆڕی تایبەتییەوە ـ بۆ دەرهێنانی ئەو خێرو بێرانەی لە کانگا "مەعادن"ەکانا هەن. واتە ئەبێ دەستەیەك لە زانایانی "جیولوجیا" بێنێ تا نهێنیەکانی ژێر زەوی ببشکنن، ئەمەیش بەوە ئەبێت لەگەڵ هەندێ وڵاتدا دەست تێکەڵ بکات تا کۆمەڵە قوتابییەك فێری ئەو زانیارییە ئەبن ئەگەر خۆی نەییوو...

پێویستە لە ڕووی کشتوکاڵ و مەزراوە تێ بکۆشێ بۆ چاککردنی زەوی و نەهێڵێ هیچ سەرمایەیەکی بە بۆشی و بێ دەرامەت بمێنێتەوە، چونکە زەوی و ئاو گەورەترین هۆن بۆ بەدەستهێنانی دەرامەت و زۆر بوونی گەنم و دانەوێڵە و هەموو جۆرەکانی تری پێداویستەکانی ناوچە و وڵات.

پێویستە دەستەی کرێکاران بخاتە سەر ئیشوکار تا بەرهەم زۆر ببێ بۆ هاوڵاتیان، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە بێکارە زۆر نەبێ لەمەیشەوە سەر بکێشێ بۆ "بشێوی" و خۆ پیشاندان "مظاهرة" و مان گرتن "اضراب" لە پێشخستنی ناوچە و وڵات.

بەکورتیی: پێویستە "حاکم" تێ بکۆشێ بۆ فەراهەمهێنانی هەموو پێداویستییەکان وڵات لە دروست کردنی دەرزییەکەوەتا ئەگاتە مەکینە وسەیارەو یەخچاڵ وتانك و زرێپۆش و ڕۆکێت و.... هتد.

ئەم قسەیەش وەنەبێ لە گیرفانی خۆماندا دەری بهێنین، نەخێر بەڵکو لەکۆنەوە "کتێبە پەڕە زەردەکان" و مامۆستا گۆش کراوەکانی وڵاتمان پەنجەیان بۆ ڕاکێشاوە و بیریان لێ کردۆتەوە، بەڵام ئیتر بەدلخەوە دەستەی حوکمڕانی پشتگوێیان خستووە و بە گوێیان نەکردوون تا ئەوەیە کە ئەیبینین بارودۆخی ناوچە و وڵات بەکوێ گەیشتوە!!.

زانای داناو بیر تیژ "ئەبویوسف" لەو نوسراوو پەیامەیدا نووسی بۆ هارونە ڕەشید، باسی بیر هەڵکەندن و جۆگە وڕووبار و چاککردنیان ئەکات بەمشێوەیە: "ئەگەر کۆڕی ـ ئەنجوومەنی ڕاوێژ ـ ڕایان وابوو کە لە دەسکاری ئەوەدا ـ بیر هەڵکەندن وجۆگەو شتی وادا ـ خێروبێر زیاد بوونی بەرووبوومی وڵاتی تێدایە ئەوە خێرا ئەنجامی بدە و ئەرکەکەیش لەسەر خەزێنەی موسڵمانان "بیت المال" و هیچیان لێ مەسێنە... وە هەرچی خاوەن زەوییە (خەراج) دەرەکان ناوای ئەکەن وەك چاککردنی زەوی و مەزراکانیان ئەوە بە خێرایی بۆیان جێبەجێ بکەو وەڵامیان بدەرەوە بەمەرجێ ئەوە زیانی خەڵکەکەی تری تێدا نەبێت" [1].

بەڵێ: ئایینی پیرۆزی ئیسلام هیچ کات ڕازیی نابێت لە فەرماندە و کۆمەڵگە دانیشن بێ دەرامەت و بەروبووم، وە ئەگەر وڵات گرانی و نەبوونی تێکەوت گوناح و تاوان ڕوو ئەکاتە فەرماندەو کار بەدەستەکان... کەوابوو موسڵمانان ئەبێ وریا و زیرەك و ئیشکەر بن، وە بێ وچان بەرووبوم بەدەست بهێنن بە شێوەیەك بۆ هیچ شتێك پێویستیان بە بێگانە نەبێت. وە ئەبێ ئەوەندە زانا و دانا فەراهەم بهێنرێ ـ لەهەمەجۆر ـ کە بۆ هیچ شتێك دانەمێنن.

ئەمەیە "سیاسەت" ئیسلام لە گرێدانی "دین و دنیا" بەیەکەوە، وە لە ئیسلامدا ئایینی بێ دنیا قەت سەرکەوتوو نەبوویەوە و نایشبێت، هەروەك دنیای بێ ئایین هۆی نەنگی و ئابڕوو چوونی هەردوو جیهانە.

---

[1]) ابو يوسف : الخراج ل110 .

## سنووری دەسەڵاتی سەرەك دەوڵەت

لە پێشەوە وتمان "خەلیفە" جێگرو جێ نشینی گەلە، وە ئەم خەلیفەیە وەکیلی ئەو کۆمەڵەیە، کەواببوو ئەبێ بەپێی "وەکالە" تەکەی بجووڵێتەوە، واتە لەسنوری ئەو دەرنەچێ، وە ئەبێ ئەو خەلیفەیە بەپێی دەسەڵاتی کۆمەڵەکە بجووڵێتەوە، وە ئەو لەچییدا بۆی هەیە کار بکات ئەمیش _ خەلیفە _ هەرئەوەندە بۆی هەیە.

ئاشکرایە "گەل" ئەبێ بە گوێرەی بەرنامەی خوا بجووڵێتەوە، دەی خۆ ئەمیش (پێشەوا) وەکیلی ئەوە (گەلە) کەواببوو ئەبێ تەنها دوای بەرنامەی خوا بکەوێ.. بۆی نییە لابدات لەو بەرنامەیە، ئەگینا ئەم ناوانەی پێوە ئەنرێ: "کافر، فاسق، زالم" وە نابێ خۆی قسە بتاشێ و ـ نەیشگونجێ لەگەڵ ئەودا ـ ناوی بنێ یاسا، چونکە پێغەمبەران بۆیان نییە، ئیتر ئەمان چۆن بۆیان هەیە؟! (قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ)[1].

پێشەوا "سەرەك دەوڵەت" بۆی نییە شتێك بخاتە ناو بەرنامەی خواوە، "شەریعەت" پەسەندی نەکا، پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: "من احدث في امرنا هذا ماليس منه فهو رد"[2] هەرکەسێك شتێك دابێنێ لە کاروباری ئاییندا و لەم ئایینەیش بە دوور بێت ئەوە ڕەت ئەکرێتەوە.

سەرەك دەوڵەت بۆی نییە قت و گوڵ لە "شەرع" دا بکات، واتە بگەڕێ هەرشتێك نووسا بەدڵیەوە بڵاوی بکاتەوە و بیکاتە یاسا، هەرچیشی بەدڵ نەبوو لەگەڵ دەوڵەتەکەیدا نەگونجا بیخاتە پشتگوێیەوە، سەبارەت بەم مانەیە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەفەرموێ: (أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاء مَن يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنكُمْ إِلاَّ خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ)[3].

پێشەوا لەبەردەم یاسای ئیسلامدا جیا ناکرێتەوە لەهاوڵاتیان، واتە هەرکات کارێکی کرد ئەبێ دادوەریی بکرێ هەرچۆن هاوڵاتییەك دادوەری ئەکرێ.

"ئیبن حەزمی ئەندەلۆسی" ئەڵێت: "پێشەوا تا پەیرەوی قورئان و فەرموودە بکات ئەبێ گوێڕایەڵی بکرێ... خۆ ئەگەر لایدا ئەبێ دادوەریی بکرێ، ئەگەر سەرپێچی کرد ئەبێ لابرێ و کەسێکی تر بخرێتە جێگەکەیەوە"[4].

ئەمەیە سیاسەتی ئیسلام لەدانانی "کاربەدەست" دا.. جیا ناکرێتەوە لەبەردەم یاسادا لەهاووڵاتیان، ئەگەر ویستی لابدا لەدادگاو داوەری نەکرێ لەپلەو پایەکەی دادەماڵرێ و دوور ئەخرێتەوە.

### ئەرکی کاربەدەست چییە؟

بەڵێ خاڵی یەکەم لەیاسای ئیسلامدا بۆ دانانی سەرەك (جێنشین) پیادەکردنی بەرنامەی خوایە.

"ئیبن تەیمییە" ئەفەرموێ: "مەبەست لەهەموو "ویلایەتەکان" لە ئیسلامدا ئەمەیە کە: فرمان و کاروباری ئایین هەر هەمووی بۆ خوا بێت، وە بۆ ئەوەیە کە تەنها وشەو بەرنامەی خوا گەشەدار بێت، چونکە خوای گەورە تەنها بۆ ئەمە خەڵکی دروست کردووە، وە بەو نیازەوە پەڕاوەکان و پێغەمبەرەکانی ناردووە، وە هەر بۆ ئەوەیش بوو پێغەمبەر و موسڵمانەکان جیهادیان ئەکرد"[5].

---

[1] ) یونس / 15 .

[2] ) ، متفق علیه .

[3] ) سورەی بقرة / 85 .

4 ) الفصل في الملل والاهواء والنحل ، 102 بـ4

[5] ) ابن تیمیة : الحسبة في الاسلام، ل4 و السیاسة الشرعیة ، ل12 .

"ئیبن قەیمیی جەوزی"ش ئەفەرموێ: "مەبەست لە هەموو "ولایەتە" ئیسلامییەکان فەرمان کردنە بە چاکە و بەرگری کردنە لە تاوان و خراپەکاری" [1]. کەوابوو ڕۆشن و ئاشکرایە کە ئیشی سەرەکی "خەلیفە" ئەمەیە کە بڕیار تەنها هی خوا بێت و، تەنها هەربەرنامەی ئەویش پیادە بکرێ.

خاوەنی "العقائد النسفية"ش ئەلێت: "موسڵمانان پێویستە پێشەوایەکیان ببێ تا هەستێ بەجێ بە جێ کردنی کاروباریان و سنوری خواییان بەسەرا جێبەجێ بکات و لە هاشاولی دوژمن بیان پارێزێ و، لەشکر و سوپایان بۆ ڕێك بخا، زەکات و خێرو بێری ولاتیان بۆکۆبکاتەوە، ئەوانەی ڕوویەڕووی "حاکم" ئەوەستن دایان مرکێنێتەوە و یاسا بەسەر ڕێگرو جەردەدا پیادە بکات، جومعە و یاسای جەژنیان بۆ ببات بەرێوە، وە کێشەیان بۆ ببڕێتەوە، شایەتیان ـ بۆ چەسپاندنی مافەکان ـ لێ وەرگرێ..." [2].

بەکورتیی: دەستەی زانایان هەموویان هاودەنگن لەمەدا کە: کاروباری پێشەوا پیادەکردنی بەرنامەی خوایە لەم بوونەوەرەدا بەو شێوەیەی خوا خۆی مەبەستی یەتی.

* ئەگەر چەند ڕایەك کۆبوویەوە بۆ هەڵبژاردنی بارێك لەسیاسەت ئەوە بۆ پێشەوا ڕەوایە و ئەتوانێ بەئارەزووی خۆی بارێکیان هەڵبژێرێ و پیادەی بکات، وە ئەبێ گەل و کۆمەڵ گوێڕایەڵی بکەن ودروستیش نییە سەرپێچی ڕاکەی بکەن، چونکە بەپێی "ئیجتهاد"ی خۆی ئەو ڕایە هەڵئەبژێرێ.

ئیسلامیش بۆیە تا ئەم پلە سەربەستیی داوەتێ، تا نەهێڵێ کێشە و دووبەرەکی لە ناو موسڵمانەکاندا ڕووبدات، سەرەنجام چەندەها دەستە و تاقم و چین بەرپا ببن لە ولاتا، کە سەرەنجامی ئەمەیش زۆر مەترسی لێ ئەکرێ بۆ باری ئاسایشی ولات. جا وا بەگوێرەی دەسەلات هەندێ نموونە بۆ ئەم ڕاستییە دەخەینە پێش چاو:

1ـ بۆ دابەشکردنی دەستکەوتە جەنگییەکان دوو ڕا هەیە، کە هەردووکیان خاوەنەکەی بەپێی "ئیجتیهاد" بارێکیان هەڵئەبژێرێ: یەکەم: ئەبێ بەیەکسانی لەناویاندا دابەش بکرێ بێ ئەوەی هیچ ئیعتیبارێك بکرێ. دووەم: ئەڵێ نەخێر بەیەکسانی نا.. بەڵکو هەندێ سیفەت پێش چاو ئەگرین، ئەو کاتە بەپێی ئەو سیفەتانە دەستکەوتەکەیان بەسەردا دابەش ئەکرێ، وەك ئەو موسڵمانانەی کە هەر لەسەرەتاوە بڕوایان هێناو کۆچیان کرد بۆ "مەدینە" و گیان و سامانی خۆیان کرد بە قوربانی بانگەوازەکەی ئیسلام.

حەزرەتی ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) بەپێی ئیجتیهادی خۆی ڕای یەکەمی هەڵبژارد، بە بەڵگەی ئەمە کە گوایا ئەو موسڵمانانە لە بەر خاتری خوا بڕوایان هێناوە، هەموو وەك یەك وان، وە هاوەڵەکانیشی ملکەچی ئەم ڕایە کرد.

حەزرەتی "عومەر"یش (خوای لێ ڕازی بێت) باری دووەمی هەڵبژارد، هەندێکیان زیاتریان بدرێتێ لە وانی تریان، بە بەڵگەی ئەوە کە کەسێك بە ئارەزووی خۆی و بێ زۆر و زۆرکاری باوەڕی هێنا بێت و نیشتمانی و سامانی خۆی بەخت کردبێت و دوای دروست بوونی دەوڵەتی ئیسلامی و پێغەمبەر کەوتبێت نابێ وەك ئەو کەسە تەماشا بکرێ کە لەم دوا دواییەدا بڕوای هێنا بێت.

"ئەبویوسف" لە کتێبی "الخراج"دا ئەفەرموێ: "کۆمەڵێك لە موسڵمانەکان هاتن وتیان: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ): تۆ ئەم سامانەت دابەش کرد بە یەکسانی لەناو موسڵمانەکاندا، لە کاتێکیشدا هەندێکیان زیادە ڕێزێکیان هەیە و پێش تر هاتوونەتە ژێر ئالای ئیسلامەوە !! ئەویش فەرمووی: ئەوەی ئێوە ئەیڵێن ـ زیادە ڕێز و... ـ من ئەمانە نازانم، چونکە ئەوانە پاداشتیان لای خوای گەورەیە ئەمەیش ژیان و ژیوارە "لەگەڵ ئەوەدا جیاوازیان هەیە"، کە وا بوو یەکسانی باشترە لە جیاوازی و نا یەکسانی.

---

[1] ) الطرق الحكمية في السياسة الشرعية ،ل238 .

[2] ) العقائد النسفية، ل478 .

جا كه سەردەمی "عومەری كوڕی خەتتاب" هات ورزگار كردنی ولآتان "فتوحات" دەستی پێكرد، هەڵسا پلەبەندی كرد و فەرمووی: ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەردا جەنگی كردووە واتە دژی وەستاوە یەكسانی ناكەم لەگەڵ ئەو كەسەدا كە یارمەتی پێغەمبەری داوە و جیهادی لەگەڵ كردووە"[1].

عومەری كوڕی خەتتاب دابەزی لە ڕاكەی خۆیی و چووە سەر ڕاكەی ئەبوبەكر (خوا لێیان ڕازی بێت) لە سەردەمی جێنشینییەكەی ئەبوبەكردا، چونكە ئەیزانی ئەو پێشەوایە و بۆی هەیە بە ئیجتیهادی خۆی ڕایەكیان هەڵبژێرێ و باوی بدا بەسەر ئەوی تریاندا و ئەمیش ئەبێ فەرمان بەرداری بكات.. ئینجا دوایی كە سەردەمی خۆی هات و بۆی دەركەوت كە مافی ئەوەی هەیە ڕاكەی خۆی ـ بە پێی ئیجتیهاد ـ هەڵبژێرێ و، سەرپێچیشی تێدا نییە بۆ هیچ كەسێك یەكسەر ڕەوای كرد و هاوەڵەكانیش هاتنە سەر ڕاكەی و سەرپێچیشیان نەكرد، چونكە ئەم پێشەوایە بۆی هەیە ئاوا بكات و ئەوانیش ئەبێ گوێڕایەڵی بكەن.

2ـ دەست گرتن بەسەر پیاوە ناودارەكانی قوڕەیشدا تا لە "مەدینە" دەرنەچن[2]. جا ئەمەیش دوو ڕای ئیجتهادیی تێدایە: یەكەم: نابێ دەرچن، مەگەر بە ئیجازە و ماوەیشی بۆ دیاری بكرێ، تا تێكەڵاوی ئەم و ئەو نەكەن ـ ئەوانەی لەگەڵ دنیادا دەستیان تێكەڵ كردووە ـ و بە پاكی لەسەر ئایینەكەیان بمێننەوە"[3]. دووەم: ئەوەیە كە بۆیان هەیە بە ئارەزووی خۆیان بۆ كوێ ئەڕۆن بڕۆن، ئازاد بن.

ئینجا پێشەوا "عومەر" یەكەمیانی هەڵبژاردوو هاوەڵەكانیش هاتنە سەر ڕاكەی، وە لە دوایشدا ئیمامی "عوسمان" (خوای لێ ڕازی بێت) ڕای دووەمی هەڵبژاردوو هاوەڵانیش سەرچێیان نەكرد.

دیارە بەپێی "فیقهی ئیسلامی" هەردوو ڕاكە پەسەندە و هەردوو پێشەواكەیش بۆیان هەیە بەپێی سیاسەتی ڕۆژو كات و پێویست ڕەفتار بكەن لەگەڵ هاو ولآتیاندا، سەردەمی پێشەوا "عومەر" ئەوەی هەڵئەگرت، سەردەمی جێ نشینی سێهەمیش ئەمەی هەڵئەگرت.

زانایانیش ئەم بیرو بۆچوونەیان پیادە كردووە و قسەیان لەسەر كردووە:

"جێنشین داوای لە پێشەوا "مالیك" كرد كە كتێبێكی "فیقهی" دابنێت سەبارەت بەو كارو بارانەی كە مامناوەندی بن "لە نێوان توند و ئاساندا، وە دەربارەی ئەو كارانەی كە پێشەواكان و هاوەڵان لەسەری كۆبوونەتەوە، دوور بێت لە توندو تیژی عەبدوڵای كوڕی عومەر، لەمۆڵەت و ئاسانگرتنی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس و تارنانی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود، تا خەڵك هەڵنێین بەتێكڕا بۆ ئەوەی ڕەفتاری پێ بكەن و ئێمەیش بە شارەكاندا بڵاوی بكەینەوە و پەیمانیشیان لێ وەرگرین كە سەرپێچی لێ نەكەن"[4]. ئیمامی مالیك وەڵامی خەلیفەی نەدایەوە، بە بەڵگەی ئەوەی كەزاناكانی تریش ڕاو ئیجتهادیان هەیە، چۆن ئەبێ فیقهی ئەوان پشت گوێ بخرێ.

### تا چ ئەندازەیەك گوێ ڕایەڵی حاكم ئەكرێ؟

دوای ئەوە كە (جێنشین) بەپێی فەرمانی بەرنامەی خوا جووڵایەوە پێویستە لەسەر "گەل" فەرمانبەرداری بكات و یارمەتی بدات بۆ پیادەكردنی بەرنامەكە.

---

1 ) ابو یوسف : الخراج ل 42 . و ابن سعد: الطبقات الكبری ب 3 ل 294 .

2 ) مەبەست ئەوەیە نەهێڵرێ هاوچۆی هەندێ شوێن بكەن تا ئەو تەبیعەت و ئایین دارییەی وەریان گرتووە لە مەدینەدا لێیان تێك نەچێ .

3 الاستاذ محمد سلام مدكور : الاباحە عند الاصولین والفقهاء ل315 . دكتۆر منیز ــ خاوەنی كتێبی الدولة القانونیة والنظام السیاسی الاسلامي ــ ئەڵێت: وا دەرئەكەوێ هۆی سەرەكی بۆ ئەمە ــ نەهێشتنی دەرچوونی ناودارەكانی قورەیش بۆ دەرەوەی مەدینە ــ ئەمەیە كە هەمووكات لە مەدینەدا ئامادە بن بۆ ئەوەی پێشەوا لە كاتی پێویست بوون بە ڕاوێژ سوودیان لێ وەرگرێ .

4 ) الاستاذ محمد سلام مدكور: الاباحة عند الاصولیین والفقهاء ل312 .

"ماوەردی" ئەفەرموێ: "هەرکات ئیمام مافی کۆمەڵی جێبەجێکرد مانای وایە هەر مافێك خوا بۆی دانا بن، وەیا لەسەری دانا بن بۆی جێبەجێ کردوون... ئینجا ئەوانیش دووشت پێویستە لەسەریان بۆ ئیمام: گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری، و یارمەتیدانی لەکاتی پێویستدا، بەو مەرجە بەردەوام بمێنێتەوە لەسەر بەرنامەکەی خوا"[1].

بناغەی ئەمەیش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئاً وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ).[2] زانایان ئەڵێن: کە خوا ئەفەرموێ: (ولايعصينك في معروف) لە شتی پەسەند وگونجاو لەگەڵ ئاییندا نابێ سەرپێچیت بکەن، ئەڵێن بۆیە ئەفەرموێ لەشتی پەسەند و "معروف" دا.... لەگەڵ ئەوەیشدا هەرگیز فەرمان ناکات بەبێ شەرعی... ئەمە مانای ئەوەیە کە نابێ گوێڕایەڵی فەرماندەو شتی وا بکرێ لەو شتانەدا سەرپێچیین لە فەرمانی خوای گەورەدا، بێجگە لەمەیش ئەم مانایە ـ بەگوێ نەکردنی فەرماندە لەکاری ناپەسەندا ـ لەهەندێ ئایەتی تردا پێش چاو ئەکەوێ: (وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ * الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ)[3]، (وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا ..)[4].

هەروەها لە فەرمودەیشدا هاتووە: "السمع والطاعة حق مالم يؤمر بالمعصية فاذا امر بمعصية فلا سمع ولا طاعة".[5] واتە: فەرمانبەرداری پێشەوا مافێکی ڕەوایە تا لەسەر نەخشەی خوا هەنگاو هەڵگرێ، جا کە پشتی هەڵگرد لە بەرنامەی خوا ئەوە مافی گوێڕایەڵی نامێنێ بەسەر خەڵکەوە. وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە ئەم مەبەستە ڕوون ئەکاتەوە: "انما الطاعة في المعروف"[6].. وە هەروەها ئەفەرموێ: "لاطاعة لمخلوق فى معصيه الخالق".[7] بەپێی ئەم ئایەت و فەرموودانە، بەهیچ شێوەیەك ڕەوا نییە گوێڕایەڵی هیچ حاکمێك لەکاری ناڕەوا حەرامدا... وە ئەو فەرموودانەیش هاتوون فەرمان ئەدەن بەگوێڕایەڵی "ئەمیر = سەرەك" بێ چەند و چوون، ئەوانە "موطلەق"ن، ئەمانەی بەردەستیشمان "موقەییەد"ن.. دەی هەرکات "موطلەق" و "موقەیەد" کۆبوونەوە لە باسێکدا و نەساز (متعارض) بوون، ئەبێ "موطلەق"ەکە حوکمی "موقەییەد"ەکەی بدرێتێ. وەك لە "ئوصول" دا باسکراوە.[8]

هەروەك زاناکانیش لەم بارەیەوە وتەیان هەیە... ئیمامی ڕازی ئەفەرموێ: "کۆمەڵی موسڵمانان هەر هەموویان یەك دەنگن لەوەدا کە کاتێ ڕەوایە گوێڕایەڵی پێشەوا و فەرماندەکان بکرێ کە وتە و کردارەکانیان ڕێك و ڕەوان بێت"[9].

زەمەخشەریش ئەفەرموێ: "خواو پێغەمبەرەکەی بەخەشم و قینن لە فەرماندە ستەمکارەکان وە نابێ فەرمانیان پیادە بکرێ".[10]

خاوەنی تەفسیری (البيضاوى) دەفەرموێ: "یەکەم جار خوای گەورە فەرمان ئەدات بە دادگەریی پێشەواکان، ئینجا فەرمان ئەدات بەخەڵکی بۆ گوێڕایەڵییان، ئەمە مانای وایە کاتێ گوێڕاڵیان ڕەولیە کە لەسەر حەق و ڕاستیی بن، مەبەستی

---

[1] ) الماوردى: الاحكام السلطانية، ل17 .

[2] (الممتحنة : 12 )

[3] ) الشعراء / 151 _ 152 .

[4] الكهف / 28 .

[5] البخارى: صحيح البخارى (ب4، ل126).

[6] البخارى، (ب9، ل113).

[7] البيهقى ( السنن ب3، ل122).

[8] سەيرى (( ارشاد الساري)) بەرگی 10 ل 220بكە.

[9] الرازى : التفسير الكبير، ب10 ل145

[10] الزمخشرى : الكشاف، ب1، ل405

"مامۆستا عومەر بەیضاوی" ئەم ئایەتانەی سورەی "النساء"ە: (وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ)[1]. (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ...)[2].

بێجگە لەمانەیش پێشەوا "ئەبوو بەکر" ئەفەرموێ: "تا من گوێڕایەڵی فرمانی خواو پێغەمبەربم ئێوەیش گوێ ڕایەڵم بن.. خۆ ئەگەر سەرپێچیم کرد ئەوە گوێ ڕایەڵیم بەسەرتانەوە نامێنێ"[3].

## تاك بەرپرسیارە ئەگەر گوێڕایەڵیی بكات لەتاواندا

بەڵێ، بەپێی ئەو بڕیارەی وەرگیراوە لە "فیقهی" ئیسلامییدا، تاك نابێ گوێڕایەڵی پێشەوایەك بكات سەرپێچی فەرمانەكانی خوای گەورە بكات.. خۆ ئەگەر كردی ئەوە شایەنی سزاو تۆڵە ئەبێت لەلایەنی خوای گەورەوە... خوا (جل جلاله) دەستەیەكی خستە ناو ئاگرەوە بە تاوانی ئەوەوە كە گوێڕایەڵی گەورەكانیان كرد بوو لەكاری تاوان و دژ بە ئاینی خوادا: (وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا)[4]. ئایەت زۆر زۆرە بۆ ئەوەی هەركات تاك مل ڕابكێشێ بۆ فەرماندەی ستەمكار خوای گەورە سزای ئەدات.

هەروەها فەرموودەی زۆریشمان بەدەستەوە هەیە، یەكێ لەوانە:

"لو دخلتموها ماخرجتم منها أبدا، انما الطاعة في المعروف"[5].

ئەم فەرموودەیە لە "بخاری"یشدا هاتووە، بەڵام بەم دەستەواژەیە: "لو دخلوها ماخرجوا منها أبدا انما الطاعة في المعروف"[6].

هۆی وتنی ئەم فەرموودەیە ئەمە بوو: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەشكرێكی "300 ـ 400" كەسیی ناردو "عەبدوڵلای كوڕی حوزەیفە" ی كرد بە ئەمیریان، داوای لێ كردن كە گوێڕایەڵی عەبدوڵلا بكەن، بەڵێ لەسەر شتێك ڕقی عەبدوڵلایان هەستان، عەبدوڵلایش وتی ئایا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی نەدا ئێوە گوێڕایەڵیم بكەن؟ وتیان بەڵێ. وتی دەی هەر ئێستا ئەمەوێ هەندێ دارو چیلكە كۆبكەنەوە و ئاگریان تێبەردەن و بڕۆنە ناویەوە، ئەوانیش فەرمانەكەیان جێبەجێ كرد، ئاگرەكەیان كردەوە، كاتێ ویستیان بڕۆنە ناویەوە هەندێكیان وتیان: ئێمە بۆیە دوای پێغەمبەركەوتووین نەڕۆینە ناو ئاگر، دەی ئێستا بڕۆینە ناوییەوە؟! بەڵێ نەڕۆیشتن، دوایی بۆ پێغەمبەریان گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: "لو دخلوها..." ئەگەر بەگوێتان بكردلیە و بڕۆیشتنایە ناویەوە هەرگیز ڕزگاریان "یا ڕزگارتان" نەئەبوو لێی. گوێڕایەڵی پێشەواو سەركردە تەنها لەكاری پەسەندایە.

## گەل تووشی سزا ئەبێت ئەگەر گوێڕایەڵی سەركردەی خراپ بكات:

هەركات كۆمەڵ و گەل بەڵێی ناهەقی كرد بۆ پێشەوا، ئەوە نزیكە خوای گەورە بەڵاو سزایان بۆ بنێرێ ـ چاك وخراپ ـ چونكە ئەگەر چاكەكانیان هەوڵ و تێكۆشانیان ببولیە ئابەو شێوەیە كەسە خراپەكانیان دەستیان نەئەگرت بەسەر وڵاتتدا، سەبارەت بەم مانایە ئەم ئایەتە پیرۆزەی بەردەستمانە: (وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ)[7]

---

[1] (النساء : 58)

[2] (النساء : 59)

[3] ابن هشام : السيرة النبوية ب4 ل341.

[4] الاحزاب / 67.

[5] ) الجامع الاحكام القرآن ب7 ل391 .

[6] ) ارشاد و السارى بەرگی 10 ل221

[7] (الأنفال : 25)

قورتوبی له ئیبنی عەبباسەوه ئەیهێنێ و ئەڵێ: "خوای گەورە فرمانیدا بە بڕوادارەکان کە هیچ کات دان نەنێن بەکاری ناپاسەند "مونکەر" دا لەنێوان خۆیاندا، ئەگینا خوا سزایان بۆ ئەنێرێ و هەر هەموویشیان ئەگرێتەوە"[1].

پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێ: "بترسن و خۆتان دوور بگرن لە بەڵاو سزایەك کەلە ستەمکارە کانەوه ئەگاتە "چاك و خراپ".

"ئیبن کەثیر"یش ئەفەرموێ: هەر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: "خوا ئەیەوێ بەندەکانی خۆی ڕاچڵەکێنێ و تاقییان بکاتەوە، بە تاقیکردنەوەیەك هەر هەموویان ـ چاك و خراپ ـ بگرێتەوە نە تەنها تاوانکەرەکە و ئەو کەسەی خۆی کارەکەی کردووە".

ئینجا لە چەندەها فەرموودەیشدا ئەم بناغەیە ـ گەل بەهۆی تاوانی خراپەکارانەوە تووشی سزاو تاقیکردنەوە ئەبێت ـ هاتووە: ﴿... والله لتأمرن بالمعروف والتنهون عن المنکر، و لتأخذن علی یدي الظالم، ولتأطرنه علی الحق أطرا، ولتقصرنه علی الحق قصرا او لیضربن الله بقلوب بعضکم علی بعض ثم لیلعنکم کما لعنهم).[2]

لە فەرمودەیەکی تردا هاتووە: (... ان الناس اذا رأوا الظالم فلم یأخذوا علی یدیه أوشك ان یعمهم الله بعقاب منه"[3] مرۆڤەکان هەرکات ستەمکاریان بینی و "خەریکی ستەم کردن بوون" دەستیان نەگرتن، نزیکە خوای گەورە هەموویان بەسزا بگرێتەوە، ئاشکرایە ئەم فەرموودەیە بێ پێچ و پەنا گەل و کۆمەڵ ئەکاتە بەرپرسیار لەکاری ستەمکارەکان ئەگەر لێیان بێ دەنگ بن و دەستیان نەگرن لە ستەمەکەیاندا.

### پێشەوا بەرپرسیارە لەلای خوای گەورە:

حاکم وسەرکردە و پێشەوا بەپێی یاسای ئیسلام بەرپرسیارە لەلای خوای گەورە لە هەموو هەڵسووکەوتێکدا، گەورە تا بچوك، چونکە ئاینی ئیسلام سیاسەتی خۆی لەسەر بناغەی بڕوا بوون بەخوای گەورە دائەڕێژێ جا کە بڕوای وا لە دڵیدا جێگیر بوو ئینجا ناتوانێ هەڵە و کاری ناپەسەند بکات، چونکە ئەزانێ خوا لە هەموو کاتێکدا ئامادەیە، کەوابوو هەموو شتێکی بە پارێزەوەیە، نەوەك هەڵەیەك بکات و بەهۆیەوە بەرەو دۆزەخ بچێت.

ئاشکرایە دروستکردنی هێزێکی ئاوا لەدڵ و دەروونی سەرەك دەوڵەتدا تەنها لە ئیسلامدا هەیە، چونکە تەنها ئەم بڕوای بە ڕۆژی دادگەری و دادوەریی خوای گەورە هەیە.

بەڵگەیش بۆ ئەمە: کە سەرەك دەوڵەت بە پارێزەوە کار دەکات نەوەك تووشی خەشم و قینی خوا بێت لە قورئان و فەرموودەدا زۆر زۆرە، لە قورئاندا وەك:

أ ـ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَخُونُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ).[4]

ب ـ (وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يُنصَرُونَ * وَأَتْبَعْنَاهُمْ فِي هَذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ هُم مِّنَ الْمَقْبُوحِينَ)[5]. واتە: ئێمە فیرعەون و سەربازەکانمان گێڕرا بە پێشەوا و سەرکردەی "دەستەی بەدبەختان" چونکە خەڵکی

---

[1] ) ابن کثیر ب2 ل298 .

[2] واتە: سوێندم بەخوا ئەبێ فرمان بدەن بە چاکەو بەرگری بکەن لە خراپە و دەستی ستەمکار بگرن، (لەناهەقی دووری بخەنەوە) وە لەسەرهەق و ڕاستیی دای مرکێنن... یاخۆ(ئەگەر وانەکەن) بێگومان هەندێکتان بەر ئەداتە ئەوانی ترتان، ئینجا دوورتان ئەخاتەوە لە سۆزو میهرەبانی خۆی، وەك گاورو جولەکەکانی وا لێ کرد. (رواه ابو داود والترمذي).

[3] البیهقی: (السنن : ب7، ل91).

[4] (الأنفال : 27 ).

[5] (القصص: 41ـ 42).

بانگ ئەکەن بۆلای ئاگری دۆزەخ وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا یارمەتی نادرێن، وە لەم جیهانەیشدا دوورمان خستنەوە لە بەزەیی و سۆزمان، وە لە دوا ڕۆژیشدا هەر دەرکراون لە دەرگای بەسۆزی خوای گەورە.

لە فەرمودەیشدا وەك:

أ ـ "كلكم راع و كلكم مسئول عن رعيته، الامام الذى على الناس راع ومسئوول عن رعيته".[1] واتە: هەمووتان چاودێریکەرو نیگابانن، وە هەمووتان بەرپرسیارن لەوەی لەبەردەستانایە، پێشەوا شوان و چاودێریکەری مرۆڤەکانی ژێر دەستیەتی.

ب ـ "مامن عبد يسترعيه الله رعية يموت يوم يموت وهو غاش لرعيته الاحرم الله عليه الجنة".[2] واتە: هەربەندەیەك خوا بیکات بە چاودێریکەری کۆمەڵ، کاتێ مرد گزیکارو خیانەتکار بێت لەگەڵ کۆمەڵەکەیدا، ئەوە خوا بەهەشتی لەسەر یاساغ و حەرام دەکات.

ج ـ "من ولاه الله من امر الناس شيئا فاحتجب عن حاجتهم وخلقتهم وفاقتهم احتجب الله عن حاجته يوم القيامة".[3]

د ـ پێغەمبەر (ﷺ) بە "ئەبوزەڕ" ئەفەرموێ: "انها امانة وانها يوم القيامة خزي وندامة الا من اخذها بحقها وادى الذي عليه منها".[4] واتە: سەرەك دەوڵەتی و هەر کارێکی تر پەیوەندی بە دەوڵەتەوە بێت ئەمانەت و سپاردەیە وە بۆ ڕۆژی قیامەتیش سووك و ڕیسواییە وە پەشیمانی بە دواوەیە، سامەگەر یەکێك مافی خۆی بدات بەو کارە:.

## کاربەدەست لەبەردەم یاساو کۆمەڵدا بەرپرسیارە:

لە ڕژێم و یاسای ئیسلامدا حاکم بەرپرسیارە لەبەردەم کۆمەڵدا، بە سیفەتی ئەوە کە پێشەوایە لە کاروباری سیاسیدا.. وە لەو لایشەوە لەبەردەم دادگای ئیسلامدا هەر بەرپرسیارە، ئەگەر کارێکی بێ شەرعی بکات و هۆی "حەد" بێت، بۆی جێبەجێ ئەکرێ وە ئەگەر پەیوەندی بە سامان و دارایی و خەڵکەوە بێت دادوەریی ئەکرێ و ئەبێ بە "ضامن"ی.

کۆمەڵ "چاودێری سەر" پێشەوایە، حیسابی لەگەڵدا ئەکات، ئامۆژگاری ئەکات، لەبەردەم هەقدا ڕای ئەوەستێنێ، لە هەڵە ئەیگێڕێتەوە... نابێ هیچ کات پێشەوا تاوان بکات و بێدەنگ دانیشێ بەڵکو ئەبێ پێی بڵێین و بەرامبەری بووەستن.

یاسای ئیسلامی پیرۆز سەربەستیی داوە بە "گەل" بۆ ڕاستکردنەوەی سەرەك دەوڵەت، ئەبێ ئامۆژگاری بکات پێش هەمووشتێك... جا ئەگەر کەڵکی نەبوو و ڕاست نەبووە و ئەبێ لەسەر حوکم لایبەن... بۆ ئەوەی مرۆڤەکان ڕزگاریان بێ لێی.

گەل بۆی هەیە لەگەڵ حاکمدا بکۆڵێتەوە دەربارەی حوکم و هەڵسووکەوتی لەبەرئەم هۆیانە:

یەکەم: چونکە سەرەك دەوڵەت وەکیلی گەلە و جێگریەتی وەك لە پێشەوە باسمان کرد، ئاشکرایە وەکیل گر بۆی هەیە سەرپەرشتی وەکیلەکەی بکات، بۆی هەیە لە ئیشی بخات و "عەزل" ی بکات.

دووەم: لە بناغەدا گەل خۆی بەرپرسیارە بۆ پیادەکردنی بەرنامەی خوا، وەك لە پێشەوە لەمە دواین.. ئەوەبوو وتمان گەل نابێ هەمووی بەسەرکردایەتییەوە خەریك بێت، کەوابوو لەجیاتی خۆی "ئیمام" هەڵئەبژێرێ و کاروباری وڵاتی ئەداتە دەست... هەرکات ئیمام بوو بەگرێ لەبەردەم پیادەکردنی بەرنامەی خوادا کۆمەڵ "موحاسەبە"ی ئەکات.

سێهەم: خوا داوای لە سەرکردەکان کردووە کە ڕاوێژ بکەن بە خەڵکی: ﴿ وشاورهم فى الامر.. ﴾.

چوارەم: کۆمەڵ لەلای خوا بەرپرسیارە سەبارەت بەوەی کە پێویستە هەستێ بە ئامۆژگاری پێشەوا بە چاکە و بەرگری کردن لە خراپە بۆ ئەمەیش ئایەتمان زۆر زۆرە.

---

[1] صحيحى موسليم.

[2] موسليم.

[3] البيهقى

[4] موسليم.

پێنجەم: حاکم لە ڕژێم ویاسای ئیسلامدا ئەندامێکە وەك ئەندامەکانی تری کۆمەڵەکە، وە ئەم ئیشەی ـ حوکم کردن ـ باوی نادات بەسەر مرۆڤەکانی تردا، ئەوەتە لەلایەکەوە موحاسەبەی خەڵك ئەکات... لەلایەکی تریشەوە ـ لەلایەنی گەلەوە ـ موحاسەبەی ئەکرێ... بەرنامەی ئیسلام لە فرمانەکانییدا جیاوازی ناخاتە نێوان کاربەدەست و ژێر دەستەکان، ئەوەتە هەردوو لایان موحاسەبە ئەکرێن و سزایش ئەدرێن لە کاتی خۆیدا ئەگەر لایاندا. لەبەرنامەی ئیسلامدا تەنها شتێك بناغەی ڕێزە، ئەویش "تەقوا"یە، ئیتر حوکم و پلەو پایە نابێتە هۆی بەرزبوونەوەی هیچ کەسێك بەسەر مرۆڤەکانی تردا، بەڵام ئیسلام داوا ئەکات بە چاوی ڕێزەوە تەماشا بکرێ ئەگەر دادگەر بوو.

پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم کەسێکە یاسای بەرپرسیاری حاکمی داناوە لەبەردەم یاساو کۆمەڵدا:

بۆ نموونە: "فەضلی کوڕی عەبباس چووبۆ لای پێغەمبەر لە نەخۆشییەکەیدا، ئەویش فەرمووی: فەضل: ئەومەندیلەیە شەتەك بدە لەسەرم ئەویش شەتەکی دا، دوای ئەوە پێغەمبەر فەرمووی: دەستت بێنە، فەضل ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) هەردوو دەستی گرتم و هەڵسایە سەرپێی و بەرەو مزگەوت ڕۆیشت، دوای ئەوە کە ڕۆیشتە مزگەوتەوە سەناو سوپاسی خوای کردوو فەرمووی: مردنم نزیك بۆتەوە، "وەك ئێوەش ئەزانن" منیش مرۆڤم وەك ئێوە، جا هەرکەسێك هەستی بریندار بووبێ ئەوەتام ئامادەم مافم لێوەرگرێتەوە، وەیا گەردنم ئازاد بکەن...".[1] لەم ڕووداوەوە ڕوون بوویەوە کە سەرەك دەوڵەت بەرپرسیارە لەبەردەم گەلدا، ئەگینا پێغەمبەر (ﷺ) داوا ناکات لە مرۆڤەکان کە چ مافێکیان بەسەریەوە هەبێت یا لێی وەرگرنەوە، وە یا گەردنی ئازاد بکەن.

ڕوونیش بوویەوە کە تەنها کەسێك پێشبڕکێی کردبێت بۆ ئەم مەسەلەیە پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ) تەنها ئەو بووە مافی گەل دیاری بکات، وە ڕوونیش بوویەوە کە سەرەك دەوڵەت و ژێردەستە "رعییەت" لەبەردەم یاسادا یەکسانن، وە یاسا بەسەر هەردوولایاندا پیادە ئەکرێ.

## وتەی هەندێك لە زانایان بۆ پاڵپشتی ئەم باسەمان:

1ـ ئیبن حەزم ئەفەرموێ: "گوێڕایەڵی ئیمام و پێشەوا پێویستە بەپێی قورئان و فەرموودە بجووڵێتەوە، جا ئەگەر لایدا ئەوا سەرپێچی لێ ئەکرێ و "حەد" ی بەسەرا ئەدرێ، خۆ ئەگەر ئەمین نەبووین لێی و مەترسی لێ ئەکرا، ئەوا لەسەر کار لای ئەبەین و یەکێکی تر ئەخەینە جێگەکەی".[2]

2ـ بەغدادی ئەفەرموێ: "هەرکات پێشەوا لابدات ئەبێ کۆمەڵ ڕاستی بکاتەوە، وەیا یەکێکی تر بخەنە جێگەکەی".[3]

3ـ ماوەردی ـ قسە لە گۆڕانی ڕەوشتی پێشەوا ئەکات ـ ئەفەرموێ: "ئەو شتەی پێشەوای پێ لائەچێ لە سەرکردایەتی دوو شتە، یەکەم: برینداربوونی دادگەریەتی. دووەم: ناتەواوییە لە لاشەیدا".[4]

بەکورتیی: کۆمەڵگە هەرچەندە هەموویان مەرجی ئیمامەتیان تیاکۆنابێتەوە، بەڵام هەموویان یەکسانن بۆ ڕاست کردنەوەی پێشەوا لە هەڵەکانیدا.

پێشەوایانی پێشوی ئیسلام ئەوەیان سەلماندووە بە موسڵمانەکان کە پێشەوا بەرپرسیارە لەبەردەم کۆمەڵدا.

ئەوەتە "ئەبوو بەکر" (خوای لێ ڕازی بێت) ئەفەرموێ: "ئەگەر نارێك ڕۆیشتم ڕاستم بکەنەوە" ئیمامی عومەر توند تر ئەڕوات، تەنانەت ئەفەرموێ: کۆمەڵ بۆی هەیە جێ نشینی ستەمکار بکوژێ... دوای فەرموودەکەی ئەو "طه لحه"

---

[1] ابن سعد الطبقات الكبرى ، ب2 ل255 و التشريع الجنائى الاسلامي ، ب1 ل318.

[2] ) ابن حزم : الفصل في الملل والاهواء والنحل ، ب4 ل175 .

[3] ) البغدادى : اصول الدين ، ل287 .

[4] ) الاحكام السلطانية ، ل17 .

فەرمووی: ئەی بۆ ناڵێی ئەگەر لایدا لە ئیشەکەی لای ببەن؟ لەباتی کوشتنەکەی عومەر فەرمووی: نەء کوشتنەکەی ئەبێ بە پەند بۆ ئەوەی نێت بە دوایدا" [1].

ئیمامی عومەر ـ لەسەردەمی خۆیدا ـ دای لە پیاوێك، پیاوەکەیش پێی وت: تۆ یەکێکی لەمدوو جۆرە پیاوانە: پیاوێك نەیزانیوە و شارەزا کراوە، وەیا هەڵەی کردووە و چاو پۆشی و عەفوو کراوە، عومەریش فەرمووی ڕاست دەکەیت فرمانەکە بەجێ بهێنە" [2]. واتە مافی خۆت وەرگرەوە. ئەمە لەم ڕووەوە، زیاد لەمەیش ئەگەر دادگابانگی کردبن سەرپێچیان نەکردووەو یەکسەر ئامادەی بوون، ئەوەتا ئیمامی عەلی ـ لەوکاتەدا ـ کە سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامییە داوا ئەنوسێ بۆ دادگا بۆ ئەوەی داوەری بکرێت لەگەڵ کابرایەکی جوولەکەدا، ئەویش ئەوەبوو کڵاوخوودەیەکی ون کردبوو و جوولەکەیەك دۆزیبوویەوە. پاشان دادگاکە بڕیاری خۆی دەرکرد بە قازانجی جووەکە تەواوبوو، چونکە دادگاکە داوای شایەتی لە ئیمام عەلی کرد ئەویش نەیبوو !! ئینجا ئیمامیش بێ سەرپێچی و بێ ناخۆش بوون ملی دا بۆ دادگاکە، چونکە شایەتی نەبوو.

جەماوەری زانایان ـ وەك شافیعی و مالیکی و حەنبەلی وظاهیری و بێجگە لەوانیش ـ یەکدەنگن لەوەدا کە: "پێشەوا بەرپرسیارە لە هەر تاوانێك ئەیکات، ئیتر پەیوەندی بە مافی خواوە بێت، یان بە مافی تاکەوە، چونکە دەقەکان گشتین و تاوانەکانیش یاساغن بە تێکرا لەسەر هەموو ئادەمیزاد بە ئیمامیشەوە..." [3]. تەنانەت هەندێك لەزاناکان ئەڵێن: هەرکات ئیمام تاوانێکی یاساغی کرد... ئەوە بەو هۆیەوە لەسەرکردایەتی لائەبرێ..." [4].

بەم وتووێژەی سەرەوە ڕۆشن بوویەوە کە هیچ یاسایەکی ڕامیاریی ئابەو شێوەیە پێشەوا ناخاتە بەردەم موناقەشەو لێکۆڵینەوە وەك ئیسلام لەگەڵیدا ئەکەوێتە وتووێژو لێکۆڵینەوە،. بەم وتووێژەی سەرەوەدا دەرکەوت کە یاسای ئیسلام پیادە ئەکرێ بەسەر هەموو کەسێکدا، بە شێوەیەك کەس چاوپۆشی لێ ناکرێ، ئیتر دەوڵەمەند بێت، یان هەژار، ناودار بێت، یان بێ ناو، سەرەك بێت، یان نەء، دەستەی یاسا دانەران بن، یان نەء، پیاوانی سوپا و لەشکر بن یان نەء.

کەچی ڕۆژهەڵاتناسەکان وناڵێن!

دوای ئەم هەموو موحاسەبەو لێپرسینەوەی ئیسلامە لە پێشەوایان کەچی هێشتا بێ شەرمانە هەندێ لە ڕۆژ هەڵاتناسەکان ئەڵێن: ڕژێمی ئیسلام خۆدرەئی و "ئیستیبداد"ەو حاکمەکان هەرچی بێت بە خەیاڵیاندا ئەیکەن !! جا فەرموو تۆو هەندێ لە وتەکانیان:

"ئەرنۆڵد" ئەڵێت: بینشی سیاسی ئیسلامیی وا دەرئەکەوێ لەلایەن خواوەیە و خوا دیاریی کردووە، بۆیە پێویستە لەسەر ڕەعیەت گوێڕایەڵی هەموو فەرماندەکان بکەن، ئیتر ئەو حاکمە دادگەر بێت، یان ستەمکار، چونکە تەنها لە بەردەم خوادا بەرپرسیارە".

"مویر" ئەڵێت: "حاکمیی ئیسلامیی، حاکمێکی خودڕەئی و سەربەخۆیە" چی ئەکات ئەیکات.

"ماکونالد" ئەڵێت: "لەگەڵ پێش چاو گرتنی هەندێ مەرجدا ئەبێ حاکم وەك حاکمێکی بێ سنوور و سەربەست حوکم بکات".

ئەمانە و هەندێکی تریشیان ڕایان وایە !!! بەڵام ـــ خوێنەری بەڕێز ـــ خۆت و ویژدانت دوای ڕۆشن کردنەوەی بەرپرسیار بوون "پێشەوا" لەبەردەم خواو کۆمەڵدا ئایا وتەی ئەوانە تاچ ئەندازەیەك لەگەڵ هەق و ڕاستیدا گونجاوە؟.

**ئایا سەرەك دەوڵەت لەسەر حوکم لائەبرێ؟**

---

[1] ) تأريخ ابن الاثير ، ب3 ل30 .

[2] ) التشريع الجنائى الاسلامى ، ب1 ل323 .

[3] ) التشريع الجنائى الاسلامى، ب1 ل322 .

[4] ) التشريع الجنائى الاسلامى، ب1 ل323 .

ئەگەر یادمان بێت لەپێشەوە وتمان گەل و کۆمەڵ ئەبێ هەمووکات لەگەڵ پێشەوادابێت، ئەگەر لایدا بەند و ئامۆژگاری بکا و هەوڵ بدات بۆ ڕاست کردنەوەی، خۆ ئەگەر بێ کەڵك بوو و نەهاتەوە سەر ڕێ، ئەوە لەسەرکارەکەی دووربخرێتەوە و جل و بەرگی جێ نشینی لەبەر داماڵرێ، چونکە گەل کاتی خۆی ئەوەیان هەڵبژاردوە بۆ پیادەکردنی بەرنامەکەی خوا.. جا هەرکات پیادەی نەکرد، وەیان خۆی بوویە گرێ و بەربەست بۆ کارەکە ئەوە ئەبێ لەکارەکەی لابرێ و یەکێکی تر بخرێتە جێگەکەیەوە.

دەستەی زاناکانیش هەموویان یەك دەنگن لەسەر بنەمای "لابردنی خەلیفە ـ عزل الخلیفة ـ ئەگەر کارێکی کرد لەگەڵ بەرنامەی خوادا نەگونجا... ئەمەیش چەپکێکە لەوتەکانیان:

1ـ ماوەردی ئەڵێت: دووشت ئەبێتە هۆی لابردنی پێشەوا یەکەم: بریندار بوونی دادگەریی، واتە فاسیق بوونیەتی بەم شێوەیە دوای حەزوئارەزووەکانی خۆی بکەوێ و گوێ بە بەرنامەی خوا نەدا، دووەم: ناتەواوبوونی لاشەیەتی بە جۆرێك نەتوانێ ئیشەکەی جێ بەجێ بکات.

ئیمامی شافیعی (خوای لێ ڕازی بێت) ئەفەرموێ: پێشەوا بەهۆی "فسق" و ستەمییەوە لە پێشەوایەتی ئەکەوێ هەروەك هەموو قازی و سەرکردەیەکیش لائەبرێ بەو هۆیەوە" [1].

2ـ ئیمامی جووەینی نیسابووریی ئەڵێت: "بێ هۆو تاوان دروست نییە ئیمام لابرێ، بەڵام هەرکات لایدا و تاوانی کرد لە سیفەتی ئیمامەت لایدا، ئەوە لاچوونی لەسەر حوکم ـ لابردنی ـ گونجاوە باکۆمەڵیش حوکم نەکات...".

3ـ باقلانی ئەڵێت: "ئەگەرکەسێك بڵێت هۆی لابردنی ئیمام ـ لای ئێوە ـ چییە؟ ئەڵێین: هۆی لابردنی پێشەوا زۆرە وەك: لە بازنەی ئیسلام دەرچێت. نوێژ نەکات. سامانی خەڵکی داگیر بکات، "حودوود"ی خوا وەك حەددی زیناو دزی و پیاو کوشتن و... هتد جێ بەجێ نەکات" [2].

4ـ شەهرستانی ئەڵێت: ئەگەر پێشەوا ـ دوای ئەوەی کراوە بە پێشەوا ـ نەفامی و ستەم و گومرایی و کوفری لێوە دەرکەوێ، ئەوە لە ئیمامەت ئەکەوێ "بێ ئەوەی هیچ کەسێك لای ببا"، وەیان خۆمان لای ئەبەین" [3].

5ـ ئیمامی غەزالی ئەفەرموێ: "سەرەك دەوڵەتی ستەمکار ئەبێ دەست لە "ویلایەتەکەی" هەڵگرێ... چونکە ستەمکارە، یا خۆی شەرعیەتی نامێنێ و بە کەڵکی حوکم کردن نایەت، وەیان پێویستە لابردنی... وە ئەو جۆرە پێشەوایە بێگومان سوڵطان و پێشەوا نییە" [4].

ئەمانە و هەندێکی تر لەزانایانی وریاو تێگەیشتوو هەموو ڕایان وایە هەرکات سەرەك دەوڵەت بەپێی نەخشەی ئیسلام نەجووڵایەوە ئەوە بێ ئەوەی موسڵمانان لای ببەن خۆی لەسەر حوکم لائەچێ و هەرچیش بکات ناپەسەندە، وەیا پێویستە لەسەریان هەوڵ بدەن بۆ لابردنی و "عەزل"ی بکەن.

ئەڵێن: ئەگەر ڕێك و پێك بوو بەڵام نەی ئەزانی بەگوێرەی کات حکومەتەکەی ببات بەرێوە لەوکاتەیشدا هەر لائەبرێ.

خوێنەری بەڕێز: بەپێی ئەو خاڵانەی سەرەوە ڕۆشن بوویەوە کەسەرەك دەوڵەت هەرکات لایدا پێویست کۆمەڵ لای ببات.. بەڵام بابزانین چۆنی لاییبات وکەی لای ببات..؟

ئاشکرایە ئەمەیش بەشێکە لە فرماندان بە چاکە و بەرگری کردن لە خراپە... بۆ ئەمەیش زانایان یاسایان داناوە: "نابێ لە لابردنی ئەوکارە ناپەسەندە "مونکەر" مکەدا خراپتر لەو پەیدا بێت" [5].

---

[1]) العقائد النسفية ل145 .

[2]) التمهيد ل164 .

[3]) نهاية الاقدام ل296 .

[4]) احياء علوم الدين ب2 ل111 .

[5]) فتاوى ابن تيمية ب28 ل129 وة اصول الدعوة ل167 .

هەركات سەرەك دەوڵەت لایدا ئەوە ماناى ئەوە نییە کە لابردنەکەی واجیب و پێویستە موسڵمانان شیرى بۆ هەڵگرن... بەڵکو ئەبێ تەماشای سەرئەنجامەکەی بکرێ: ئەگەر لابرێ لەمەوە موسڵمانان تووشی زیانێکی گەورەتر نابن لەوەی کە بمێنێتەوە، ئەگەر لە لابردنەکەدا زیان گەورەتر نەبوو لە مانەوەکەی ئەوە ئەبێ لابرێ.

خۆ ئەگەر لابردنەکەی نەگونجاو بوو، وەیا ئەگونجا بەڵام موسڵمانەکان تووشی زیانێکی گەورە و قورستر ئەبوون لە مانەوەکەی ئەوە ـ لەم کاتەدا ـ لانەبردنەکەی باشترە"[1].

واتە ئەگەر لابردنەکەی ئەبوو بەهۆی تیاچوونی کۆمەڵە موسڵمانێك، وەیا خوێنێکی زۆری تێدا ئەڕژا ئەوا باش وایە شۆڕش نەکرێ و هەروا بمێنێتەوە تا هەلێك وەدەستئەخرێ.

بەڕێز مامۆستا "عبدالقادر عودە" ئەفەرموێ: بۆ لابردنی خەلیفە لە حوکم ـ لە کاتێکدا فیتنەی لێ پەیدا ببێ ـ سێ ڕا هەیە:

یەکەم: هەرکات سەرەك کارێکی ناپەسەندی کرد لەگەڵ بەرنامەی ئیسلامدا نەگونجا وەك مەی خواردنەوە و بەرتیل وەرگرتن پێ شێل کردنی مافی چینێك...، ئەوە پێویستە "لەلایەن موسڵمانانەوە، هەوڵ بدرێ بۆ لابردنی و لەکورسی "حوکم" دووربخرێتەوە، با سەریش بکێشێ بۆ فیتنەو ئازاری موسڵمانان. دوای ئەمە ڕای دووەم و سێهەمیش باس ئەکات ئینجا ئەفەرموێ: "ئێمە بەلامانەوە ولیە ڕای یەکەم ڕاسترو گونجاو ترە لەگەڵ "ڕۆح"ی ئیسلامیدا لەچاو ڕای دووەم و سێهەم کە ئەڵێن: ئەگەر لە لابردنی "جێنشین"دا فیتنەی لێ ئەکەوتەوە بێ دەنگ بین باشترە، چونکە لابردنی "سەرەك"ی خراپکارو خوێن ڕێژ لە ڕاستیدا "ئیصلاح" و ڕاست کردنەوەی باری چەوتی کۆمەڵە، نەك فیتنە "وەك ڕاکانی تر ئەڵێن"... وە ئەگەر ڕاستیت ئەوێ ملکەچکردن بۆ حوکم و دەسەڵاتی پیاوی خراپ ئەوە "فیتنە" یە.

بەڵگەی دەستەی دووەم و سێهەم ئەو فەرموودانەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) داوا ئەکات لە موسڵمانان تەنها "بستێك" یش لە کۆمەڵی خۆیان دوور نەکەونەوە و نەڕۆن بەگژ پێشەوا و خەلیفەکانیاندا، وەك:

أ ـ "من رأى من أميره شيئا يكرهه فليصبر فان من فارق الجماعة شبرا فميتته جاهلية".

ب ـ "بايعنا رسول الله (ﷺ) على السمع والطاعة في منشطنا ومكرهنا وعسرنا ويسرنا وأثرة علينااوان لاتنازع الامر اهله الا أن تروااكفرا بواحا عندكم فيه من الله برهان".

"ئیبن حەزم" ئەفەرموێ : زۆربەی زاناکان لە مانای ئەم فەرموودانە ـ وەك خۆیان تێنە گەیشتوون ـ لە ڕاستیدا پێویستە لەسەر موسڵمانان قسە لەگەڵ ئیمام و پێشەوا بکەن هەرکات ستەمی لێوەشایەوە، وە ئەبێ بەرگری بکەن... جا ئەگەر گەڕایەوە ئەوا باشە ئەگینا ئەبێ لابرێ"[2].

### ئایا حاکم ئەتوانێ دەست لە کارەکەی بکێشێتەوە؟

بەڵێ، لە سیستەمی سیاسی ئیسلامیدا جێ نشین بۆی هەیە "ئیستعفا" بنوسێ و دەست لە حوکمەکەی هەڵگرێ و بیسپێرێتەوە بە کۆمەڵ، وەك دەستەی زاناکان ئاماژە ئەکەن بەم مەبەستە:

1ـ ماوەردی ئەفەرموێ: "پێشەوا بۆی هەیە داوای خۆداماڵین بکات لە ئیمامەت"[3].

2ـ جووەینی نیسا بووری ئەفەرموێ: پێشەوا ڕەوایە بی هۆ خۆی دارنێ لە حوکم"[4].

لەسەردەمی پێشەوا "ئەبوبەکر" دا ئەمە ڕوویدا: "کاتێ بەیعەت کرا بە ئەبوو بەکر سێ ڕۆژ مایەوە لەو ماوەیەدا داوای لە خەڵك ئەکرد جگە لەم کەسێکی تر هەڵبژێرن وئەی وت: "داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەم پەیمانەتان لێ ئەکەم، ئایا کەسێك

---

[1]) د. عبدالكريم زيدان: اصول الدعوة، ل167 .

[2]) الاسلام واوضاعنا السياسية ، ل 187 _ 189 .

[3]) الماوردى : الاحكام السلطانية ، ل25 .

[4]) الارشاد الى قواطع الادلة في لصول الدعوة .

هەیە پێی ناخۆش بێت؟ ڕق و حەشمی ببێ لەم کارەی من؟ ئیمامی عەلی لە پێش هەموو کەسێکەوە هەڵسایەوە سەرپێ و فەرمووی: سوێند بەخوا نەئەهێڵین دەست لەکارەکەت هەڵبگری، و نە بە هیچ شێوەیەك داوایشت لێ ئەکەین... تۆ پێغەمبەری خوا پێشی خستوی بۆ کاروباری ئایینمان... کێ بێ تۆ بخاتە دواوە لە کاروباری دنیاماندا...؟"[1].

ئەبوبەکر داوای کرد لە کۆمەڵ بۆ لابردنی خۆی و هیچ کەسێکیش موناقەشەی نەکرد.. ئەوانیش ئەوە بوو داواکەی ئەویان "ڕەفض" کرد.

دەی ئەگەر "ئیستعفا" دروست نەبولیە ئەبوو بەکر داوای نەئەکردو هاوەڵانیش موناقەشەیان ئەکرد، بێجگە لەمەش ئیمامی "حەسەن" ی کوڕی ئیمامی "عەلی" لە "خیلافە" خۆی دارنی لەسەردەمی"معاویە)) دا[2].

## ئایا سەرۆکایەتی ماوەی بۆ دائەنرێت؟

بەڵێ، کاتێ کۆمەڵ جێنشینیان هەڵبژارد و ئەویش بەپێی بەرنامەی ئیسلام ئەجوولایەوە ئەوە هیچ هۆیەك نییە بۆ لابردنی، چونکە کاتی خۆی بۆ ئەوە هێنراوە بەپێی قورئان و فەرموودە حوکم بکات، جا کە ئێستا وا بێت، ئەبێ بێ هۆ بۆچی لابرێ؟ بەلام لەگەڵ ئەمەیشدا لەکاتی "بەیعەت"ەکەدا ڕەوایە کۆمەڵ لەگەڵ حاکم دا یەك کەون لەسەر دیاری کردنی ماوەیەك بۆ "ئیمامەت"... لەو لایشەوە جێنشین "وەکیل"ی کۆمەڵە کەوابوو کۆمەڵ "ئەصیل" ە.. دەی "ئەصیل" بۆی هەیە ماوەی وەکالەت دیاری بکات بێجگە لەمەیش زانایان بەلایانەوە ڕەوایە پێشەوا ـ هەرکات ئارەزووی بوو ـ دەست لەکار ئەکێشێتەوە... کەوابوو بۆیشی هەیە هەر لەسەرەتاوە لەکاتی "بەیعەت" ەکەدا ڕێککەون لەسەر دیاری کردنی ماوەیەك.

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هاتووە: "المؤمنون على شروطهم الا شرطا حرم حلالا او احل حراما".[3] موسڵمانان بەپێی مەرجەکانیان ئەجوولێنەوە.... سامەگەر مەرجێك بێت "حەرام" ێك حەلاڵ بکات وەیان حەلاڵێك حەرام بکات.

خوێنەری بەڕێز: پێش ئەوەی کۆتایی بەم باسە بهێنین پێمان باشە تیشکێك بخەینە سەر پەیوەندی دەوڵەتان و مافی هاووڵاتیان و بێگانەکان "الاجانب" لە ئیسلامدا.

## مافی هاووڵاتیان و بێگانەکان پێش ئیسلام

پێش ئیسلام دەوڵەتان زۆربەیان لەگەڵ یەکرتدا بەشێوەی دوژمنایەتی و ناحەزانە ئەژیان و یاسای دڕندانە و نامەردانەیان بەکارئەهێنا بۆ ناوخۆو دەرەوەیان !! هێزدار بێ هێزی ئەخواردو مافی زەوت ئەکرد، لە گۆڕەپاندا تەنها "هێز" ڕۆڵی ئەبینی، کە ئیسلامی پیرۆز هاتە گۆڕەپانەوە تەرازووی دادگەری داناو لە بری زۆرو زەنگ.

ئیسلام هات و یاسای ڕێزو قەدرگرتنی ئادەمی هێنا، یاسای دادگەریی، یەکسانی، ئازادیی، وەفا بە پەیمان، مامەڵەی چوون یەك، لێبوردن، یارمەتیدانی یەکتر، چاك کردنەوەی زەوی لە تۆوی "گەندەڵی" و خراپەکاریی.

لە لایەکی تریشەوە، لە ئیسلامدا ئاشتیی بناغەیە نەك جەنگ بۆ پەیوەندی نێوان دەوڵەتان، خوای گەورە ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ ..)[4]. (.. فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً)[5].

---

[1]) الامامة والسياسية ب1 ل16 .

[2]) بۆ ئەم باسە سەری (( الاسلام واوضاعنا السياسية ، ل184 بکە .

[3]) ترمزی هێناویەتی و ئەفەرموێ فەرموودەیەکی ڕاست و صەحیحە .

3) البقرة / 208 .

4) النساء /90 .

کەولبوو بەم چەند ڕێگایانەی خوارەوە چەواشەکاری دوژمنانی ئیسلام ڕۆشن ئەبێتەوە لژی بەرنامەی خوا کاتێ ئەڵێن: ئیسلام بەزۆرو زۆرکاری و شیر بەرنامەی خۆی بڵاوکردۆتەوە، چونکە بە شایەتی قورئان و فەرموودە و مێژوو: هۆی جەنگەکانی ئیسلام سێ خاڵە، وەك لە هەندێ شوێنی تردا ڕوونمان کردۆتەوە:

1ـ وەستان لە ڕووی ئەو هێزانەدا کە هێرش دێنن بۆ ئیسلام و ئەیانەوێ قەڵاچۆی بکەن (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ). [1] ئاشکرایە هەر گەلێك جەنگی لەگەڵ بکرێ و شەڕی پێ بفرۆشرێ هەموو یاساو ڕژێمەکانی جیهان ـ نەك هەر ئیسلام کە بەرنامەی خوایە ـ ڕێگە بە ئەو گەلە ئەدەن بجەنگێن دژی ئەو ستەمکارە.

2ـ ئەگەر بەڵگەو نیشانە ڕوون بوویەوە کە هێزێکی دڕندە خۆی ئامادە کردووە بۆ هێرش هێنانە سەریان، دیارە لەم کاتەیشدا هیچ ڕەوا نییە بۆ بڕواداران چاو دابخەن بەرامبەریان و سەردابخەن، بەڵکو ئەبێ هێز ئامادە بکەن بۆ ئەو دوژمنە خوێن خۆرە، ئەگینا هەر لە دەرگاکەی خۆیاندا سەریان ئەبڕن و لە ناویان ئەبەن.

3ـ ئیسلام ئەیەوێ ڕاڤەی بەرنامەکەی بکات بۆ خەڵك، ئیتر بێ ئەوەی زۆر لە هیچ کەسێك بکات بۆ موسڵمان بوون، لەو لایشەوە مرۆڤە ناموسڵمانەکان سەربەست ئەکات بۆ بەجێ هێنانی جۆری خوا پەرستیان بەپێی بەرنامەکەی خۆیان ! ! دەی کە موسڵمانان بەرگری لە خەڵك ناکەن بۆ خواپەرستیان، هەق وایە ئەوانیش بەرگری موسڵمانەکان نەکەن بۆ ئاییندارى و بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیان، بەڵام ئەگەر دژیان وەستان ئەوە پێویستە لەسەر موسڵمانەکان لە ڕووی ئەو دەستە ناپاکەدا بوەستن، تا "عەقیدەو بیرو باوەڕیان" بمێنێتەوە، یا بشگەنە پلەی "چەك" بەکارهێنان، چونکە موسڵمان بەرنامەیەکی ئەوتۆی هێناوە بەختیاری و ئاسوودەیی هەموو گەل و تاك و نەتەوە و چینێکی تێدایە، کەولبوو ـ هەرکات ـ هەوڵدرا بۆ کوژانەوەی ئەو چرایە ئەبێ ئەم بڕواتە گۆڕەپانەوە بۆیان.

دوژمنەکەی بەهەموو جۆرە چەکێك لێی ئەدات و ئەویش هەر ئەڵێ: "انا لله وانا اليه راجعون...." خۆ ئەگەر خێرخواهێك باسی چەکیان بۆ بکات ئەڵێن پیاوی ئەم و ئەوە ! ! موسڵمان چۆن چەك هەڵئەگرێ [2] ؟ !.

### مافی هاووڵاتیان و بێگانەکان لە ئیسلامدا

لەپێش سەردەمی ئیسلامدا ئەو مرۆڤەی هاوزمان، وەیا هاوپەیمان نەبولیە لەگەڵ ئەو دەوڵەتەدا کەحوکم ئەکات هیچ مافێکی بۆ دانەئەنا، نەك هەرئەمە، بەڵکو بە دوژمنیشی دائەنا...!! ئیسلام هات چەندین ڕێبازی ناوازەی هێناو مافی هەموو کەسێکی دیاریکرد ـ هاو ولاتیان و بێگانە، موسڵمان و ناموسڵمان ـ کە چۆن بژی لەژێر سێبەری ئەو دەوڵەتەدا، تەنانەت ئەگەر هاوەڵ بڕیار دەرێکی جەنگی "مشرك حربى" هاتە خاکی موسڵمانانەوە، پێویستە لەسەر دەوڵەت چاودێری بکات تا ئەیگەیەنێتەوە جێگەی خۆی، بۆ ئەوەی هیچ کەسێك دەست درێژی بۆ نەکات.

دەستەی زانایان ئەوانەی لەژێر چاودێری ئیسلامدا ئەژین ئەکەن بەسێ دەستەوە:

1ـ موسڵمانەکان:

ئەمانە ئەو کەسانەن ئایینی ئیسلامیان وەرگرتووە بە "ئایین و، بەیاسای ژیانیان" وە خۆیان بەسەربازی ئیسلام ئەدەنە قەڵەم، هیچ کات دوور ناکەونەوە لێی.

ئەو موسڵمانە لە هەرشوێنێکدا بژی بە هاووڵاتی، ئیسلام دائەنرێ، هەموو هۆیەکانی ژیانی لەسەریەتی، وە ئەبێ هۆی کامەرانیی و، بەختیاری بۆ بەدەست بێنێ. وە بۆی ڕەولیە لەهەر شوێنێکدا ئارەزووی هەیە ـ لەشار، لە گوند، لەدەشت، لە کێو، .. ـ دانیشێ و خانوو بکاتەوە، و بۆی هەیە بچێتە ئەوێ و بەرگری ناکرێ.

2ـ زیمی "الذميون":

---

[1] الحج / 39 .

[2] سەرێك لەسەربەستیی لە ئیسلامدا بدە / باسی سەربەستیی لە ئاییندارىدا .

ئەمانیش ئەو کەسانەن کە ئیسلام وڵاتێکی گرتووە، وە دانیشتووەکانی لەسەر ئایینی خۆیان ماونەتەوە و لە بەرامبەر ئەوەوە شتێکی دیاریکراو ئەدەن بە دەوڵەت، کەلە فەرهەنگی ئیسلامدا پێی ئەڵێن "جزیە".

پەیمان ئەدەن کە لەهەموو ڕوویەکەوە ملکەچی دەوڵەت بن بێجگە لە یاسای "ژن و ژنخواستن و تەڵاق و میراث و جۆری خواپەرستیان". دیارە ئەمانەیش هەموو مافێکی ژیانیان بۆ هەیە لە ئیسلامدا بێ جیاوازی لەگەڵ موسڵمانەکاندا، هەرچەندە دوژمنانی ئایینی ئیسلام بەسەدەها پڕوپاگەندەیان نووساندووە بە ئیسلامەوە سەبارەت بەمانە، بە تایبەت مەسەلەی سەرانە "جزیە"[1]! ئەم سەرانە لەبەرامبەر ئەوەوە بووە کە موسڵمانەکان ئەوان بپارێزن لە هەڵمەتی دوژمنان تەنانەت ئەگەر ویستبێتیان ئەو شوێنە بەجێ بهێڵن، موسڵمانەکان هەرشتێکیان لێ وەرگرتبێ بۆیان ڕەت کردوونەتەوە، وەك صلاح الدین (خوا لێی ڕازی بێت) هەرچی وەرگرتبوو لەگاورەکانی "شام" هەمووی ڕەت کردەوە کاتێ ناچار بوو بەگەڕانەوە.

3ـ بێگانەکان "المستأمنون" "الأجانب":

ئەمانیش بریتین لەو کەسانەی دێنە وڵاتی ئیسلامییەوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ـ لەلایەن دەوڵەتەوە ـ وە لەدڵیاندا نییە کە لەوێدا بمێننەوە، خۆ ئەگەر ویستیان لەو وڵاتەدا بمێننەوە ئەوە مامەڵەی "ئەهلی زیمەیان" لەگەڵ ئەکرێ.

ئەمەیش سەروەرییە بۆ ئیسلام کە بەو شێوەیە مافی هەموو کەسێك دیاری بکات پێش ئەوەی جیهان خەبەری بێتەوە. ئافەرین بۆ ئەو دەوڵەتەی کە مافی هەموو کەسێك دیاری بکات و بییانو بەکەس نەگرێ، زمان و ڕەگەزو ڕشتە لەبەرچاو نەگرێ!

ئەم بێگانانە بۆیان هەیە بەسەربەستیی لەوڵاتی ئیسلامدا جموجۆڵ بکەن، ئەم شار بۆ ئەو شار، ئەم گوند بۆ ئەو گوند، چ ئیشێ ئەکەن، چۆن بازرگانی ئەکەن؟ چۆن خانوو ئەکەن؟ موسڵمانەکان چۆن هاوژیانن لەدەوڵەتدا، بەو شێوەیە ئەوانیش هاوژیانن، وە ئەم بێگانانە ئیسلام داوایان لێ ناکات ملکەچی یاساو ڕژێمی ئیسلام بن، مەگەر ڕێزی یاسای گشتی دەوڵەت نەبێت یان سوکایەتی بە بیروباوەڕیان بکەن .

ئەم بێگانانە هەر داراییەك پەیدا ئەکەن بەهی خۆیان دائەنرێ، تەنانەت با بیشگەڕێتەوە بۆ وڵاتی کوفرو خوانەناسی و چەکیش هەڵگرێ دژی موسڵمانەکان.

ئەگەر لەوڵاتی ئیسلامدا مرد "داراییەکە"ی ئەنێرێتەوە بۆ میرات بەرەکانی لە وڵاتی خۆیدا، بەڵام تۆڵە "عقوبە" ئەو جۆرەی پەیوەندی بە مافی ئادەمییەوە بێت، لێی وەرئەگیرێ... بەڵام مافی خوایی "حقوق الله" جەماوەری زاناکان لەسەریئەوەن تۆڵەی لێوەرگیرێ... هەرچەند "ئەبوحەنیفە" ڕای جیاوازە[2] .

خوێنەری بەڕێز:

بۆ ئەوەی دەرکەوێ بۆ هەموو کەسێك ـ دۆست و دوژمنی ئیسلام ـ کە ئایینی ئیسلام پێش هەموو دەوڵەتانی جیهانی کەوتووە و دانیناوە بە یاسای "بنەمای ڕاوێژ"، یان "دیموکراتییەت" دا لە هەموو کاروبارێکی گرنگدا، وە بە ڕۆشنتر بڵێین لە شێوەی دیاریکردنی "خەلیفە" کاندا، جا وا شێوەی جۆری هەڵبژاردنی خەلیفەکان باس ئەکەین:

پێغەمبەر (ﷺ) ئەزانێ کاتی گەڕانەوەی بۆلای خوای خۆی نزیك بۆتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا "خەلیفە" یان بۆ دیاری ناکات، ئەوەتا لە حەجی ماڵ ئاواییدا ئەفەرموێ: "لعلي لا القاكم بعد عامكم هذا" واتە: لەوانەیە ئیتر دوای ئەم ساڵە پێتان نەگەمەوە ! !.

---

[1] معالم الثقافة الاسلامية ، ل 223 _ 232 / و بۆ ئەم مەبەستە کتێبی: التشريع الجنائى الاسلام، ی ل372 سەیریکە .

[2] معالم الثقافة الاسلامية ، ل 223 _ 232 / و بۆ ئەم مەبەستە کتێبی: التشريع الجنائى الاسلامى ، ل372.

بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش کەوت و هەر لە نەخۆشییەکەیشدا بۆی دەرکەوت کە ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، وە هیچ کەسیشی دانەنا بە خەلیفە ! ! هەندێك لەوانە کە نەخۆشن ئەڵێن: بۆیە خەلیفەی دیارینەکرد، چونکە زۆر زۆر نەخۆش بوو، بەشێوەیەك دەرفەتی نەدا تا بیربکاتەوە لە دانانی خەلیفە ! !.

دیارە ئەو وتەیە ئەدرێتە دواوە بەم بەڵگەیە: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ یەکەمجار ئەوەندە نەخۆشیەکەی قورس نەبوو تا نەتوانێ بیری لێ بکاتەوە، بێجگە لەمەیش ئەوەتە ئەنێرێ بەدوای (ئەبوبەکر) بۆ پێشنوێژی، دەی ئەگەر پێویست بووایە "خەلیفە" دیاری بکرێ، پێغەمبەر پشت گوێی نەخستەوە.

هەندێ لە دوژمنان ئەڵێن: محمد (ﷺ) ئەیزانی کە ڕژێمی هۆزایەتی ناڕواتە ژێر یاسای "تەواروث"ەوە، لەبەرئەوە هیچ کەسی دیاری نەکرد ! ! ئەم قسەیش ڕەتئەکرێتەوە بەمە کە: پێغەمبەر (ﷺ) منالی نێرینەی نەبووە بکەوێتە دوای خۆی تا جێ نشینایەتی پێ بسپێرێ و ئینجا "حوکم" ببێ بە میرات.

کەوابوو ئەیتوانی بە ئارەزووی خۆی کەسێك هەڵبژێرێ، بەڵام ئەو وای نەکرد، تا یاسای دیکتاتۆری و خوود ڕەئی جێگەی نەبێتەوە لە ئیسلامدا، بەڵکو موسڵمانان خەلیفە هەڵبژێرن. وە بۆئەوەی یاساو بنەمای ڕاوێژ بچەسپێنێ لە جیهاندا، لەگەڵ ئەمەیشدا کە خەلیفەی دیاری نەکرد هێماو ئاماژە ئەکات بۆ "ئەبوو بەکر" لەبەر دڵسۆزی و نەرم ونیانی بە موسڵمانان تا ئەو بکرێ بە خەلیفە: "لوکنت متخذا خليلا من امتي لأتخذت ابابكر..)). "ارحم الناس بأمتي ابوبكر".

خوا باشتر ئەزانێ ئەگەر دیاری بکردایە موسڵمانەکان وایان ئەزانی ئەمە بە فرمانی خوا دانراوە، کەوابوو هیچ کەسێك بۆی نییە ڕەخنەی لێ بگرێ، وەیا چاودێری کارو باری بکات، دیارە ئەو کاتە ئەبویە دیکتاتۆری... یاوایان ئەزانی خەلیفە لە پلەی پێغەمبەردایە، جا لەبەر ئەوە بۆی دیاری نەکردن، هەرچەندە وای نیشان ئەدا حەز ئەکات ئەبوو بەکر بکرێ بە خەلیفە، وە هەروەها موسڵمانەکانیش هەستیان وابوو ئەبوو بەکر ئەبێ بەجێ نشین، چونکە ئەو هاوڕێی پێغەمبەر بووە لە ئەشکەوتی "سەور" دا وە ئەو بڕوای پێ کردووە کاتێ خەڵك بەدرۆیان ئەخستەوە...

**هەڵبژاردنی ئەبوبەکر ( خوای لێ ڕازی بێت )لە 11 ی کۆچییدا**.

بێگومان یەکەم کارێك موسڵمانەکان پێی هەڵسان دوای مردنی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵبژاردنی خەلیفە بوو، تەنانەت پێش بە خاکسپاردنی تەرمە پیرۆزەکەی حەزرەتیان خست! ! چونکە تەرمەکە ئەگەر ماوەیەکیش دوابکەوێ زیانێکی ئەوتۆی نییە، بەڵام دواکەوتنی دانانی خەلیفە زۆر سامناك و جێگەی مەترسییە بۆ جیهانی ئیسلامەتی، بەتایبەت دەوڵەتێکی تازە لە دایك بوو و ئەو هەموو دوژمنەیش ـ لە جوولەکە و دوو ڕووەکان و فارس و ڕۆمەکان ـ لە کەمیندا بن بۆی.

یارمەتیدەرەکان و کۆچکەرەکان خێرا کەوتنە بیرکردنەوە بۆ دانانی خەلیفە. کاتێ عومەر بەمەی زانی بەپەلە ڕۆیشت بۆلای ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) ئاگاداری کرد کە "ئەنصار"ەکان لە "سەقیفە"ی "بەنی ساعدە" دا خەریکی موناقەشەی مەسەلەی خەلیفەن، بەڵێ ڕۆیشتن، لە ڕێگەیشدا "ئەبوو عوبەیدە" یان برد لەگەڵ خۆیاندا ئینجا لەگەڵ یارمەتیدەرەکان و کۆچکەرەکاندا ـ هەر هەموویان ـ کۆبوونەوە.

هەر دەستە و کۆمەڵێك بە ئازادی ڕای خۆی دەرخست و بە تێکڕا لەڕاکان کۆڵینەوە، بێ ئەوەی ترسی ئەوەیان بێ کە تاقمێکیان پێیان ناخۆش بێت ! ! چونکە لە دڵی هەموویاندا پێش چاوگرتنی بەرژەوەندی موسڵمانانە "ئیتر هەرکەسێك عاجز ببێت ناهەقی ئەکات".

نوێنەری کۆچکەرەکان ڕای خۆیانیان پێشکەش بە کۆڕەکە کرد و، ڕەخنەیان لە ڕای یارمەتیدەرەکان گرت، ئەوانیش ـ ئەنصار ـ هەر بەو شێوەیە، ئینجا دوای ئەو لێکۆڵینەوەیە هەموو بڕیاریان دا بۆ هەڵبژاردنی "ئەبوو بەکر" (خوا لێی ڕازی بێت).

مێژوو نووسی دەستپاك "طەبەری" ئەم ڕووداوەی بە پوختە کراوی هێناوە، منیش پێم خۆشە دەقەکەی ـ وەك خۆی ـ بێنم بۆ خوێنەرانی خۆشەویست: "لما قبض النبي (ﷺ) اجتمع الانصار في سقيفة بنى ساعدة وقالوا: نولى هذا الامر بعد

محمد (عليه السلام) سعد بن عبادة، وأخرجوه اليهم وهو مريض واخذوا يتداولون فيما بينهم هذا الامر وفيما يقولونه للمهاجرين , واتى عمر الخبر، فأقبل الى منزل النبي (ﷺ) فارسل الى ابي بكر وكان في الدار هو وعلى ابن ابى طالب في شغل بجهاز الرسول (ﷺ): ان أخرج فقد حدث أمر لابد لك من حضوره، فخرج اليه، فقال له عمر: اما علمت ان الأنصار قد اجتمعت بسقيفة بنى ساعدة يريدون ان يولوا هذا الأمر الى سعدبن عبادة، وأحسنهم مقالة من يقول: منا أمير ومن قريش أمير؟. فخرجنا اليهم، ولقيا أبا عبيدة بن الجراح في الطريق، فصحبهما الى اجتماع الأنصار، واراد ان يتكلم كلاما زواه من قبل، فقال له أبوبكر: رويدا حتى أتكلم. فبدأ أبوبكر فحمد الله واثنى عليه ثم قال: إن الله بعث محمدا رسولا الى خلقه و شهيدا على امته ليعبدوا الله ويوحدوه، وهم يعبدون من دونه آلهة شتى ويزعمون انها لهم عنده شامخة، وانما هى من حجر منحوت، و خشب منجور ثم قرأ: "و يعبدون من دون الله مالا يضرهم ولا ينفعهم ويقولون هؤلاء شفعاءنا عند الله"... "وقالوا ما نعبدهم إلا ليقربونا الى الله زلفى".

بەڵێ "ئەبوبەكر" لە بەشێكی تری وتارەكەیدا فەرمووی: خوای گەورە ئەم ئیسلامەی بۆ ناردین، لەسەرەتاوە عەرەبەكان ـ بەلایانەوە ـ زۆر جێگەی عەیب و نەنگ بوو بێنە سەری و دەست لە ئایینی باوباپیرانیان هەڵگرن، تا خوا كۆچكەرەكانی بۆ هەڵبژاردو بڕوایان پێ هێنا ودەستی یارمەتیان بۆ ڕاكێشاو ئارام و صەبریان هێنا بەسەر خۆیانا، بەرامبەر بەو هەموو ئەشكەنجە و ئازارە كە خزمەكانیان ئەیاندان ! ! كۆچكەرەكان بوون یەكەمجار ـ لەم سەرزەمینەدا ـ خوابپەرستن و بڕوایان هێنا بە پێغەمبەرەكەی (ﷺ)، ئەوانن دۆست و ئاشناو خۆشەویستی پێغەمبەر، دیارە هەر ئەوانیش شایەن ترن بۆ هەڵگرتنی ئەم كارە دوای خۆی، هەقیش نییە كەسێكی تر داوای بكات.

ئێوەیش "ئەنصارەكان" پیاو حەق بڵێ فەضل و ڕێزتان بۆ ئیسلام ناشارێتەوە، پێش بركێتان بۆی ئاشكرایە، خوا ئێوەی هەڵبژارد و كردنیی بە یارمەتی دەری ئایینەكەی و پەناگا بۆ پێغەمبەرەكەی (ﷺ) وە زۆربەی خێزان و هاوەڵانی لە ئێوەیە، وە بێجگە لە كۆچكەرانی یەكەمجار كەس ناگاتە ئێوە...."

ئینجا ئەنصار پیاوێكیان هەڵسایەوە و داوای لێكردن بۆ ئەوەی ئەوان كاروباری جێ نشینی بگرنە ژێردەست چونكە شایەنی ئەوانە، وە وتی:ئەگەر هەر ناگونجێ با ئێمە "ئەمیر" یكمان ببێ و، ئەوانیش ئەمیرێك ! !.

پێشەوا عومەر فەرمویی: ناگونجێ لەیەك سەردەما دوو خەلیفە هەبێت... ئینجا پیاوێكی تر لە ئەنصار دوا بەدوای عومەر هەڵسایەوە وتارەكەی عومەری ڕەتكردەوە. بە ئازادیی و بێ ترس و بیم "ئەمەیش نیشانەی سەربەستی وئازادیی بیروڕایە".

دوای ئەو "بەشیری كوڕی سەعد"ی ئەنصاری هەڵسایەوە ڕووی كردە ئەنصارەكان و وتی: ئاشكرایە ئێمە جێگە دەستمان هەیە بۆ جەنگ لەگەڵ كافراندا، بەڵام ئێمە مەبەستمان ڕەزامەندی خوایە، نەك ناوونیشانی دنیایی، كەوابوو نابێ ناكۆكی وهەرای تیا دروست بكەین، خۆیشتان ئەزانن پێغەمبەر (ﷺ) لە "قوڕەیشە" كەوابوو تیرەكەی ئەو شایەنترە بۆ ئەم كارە، لەخوا بترسن و ناكۆكی بڵاو مەكەنەوە.

ئینجا "ئەبوبەكر" هەڵسایەوە فەرمووی: ئەمە "عومەر" و ئەمەیش "ئەبوعوبەیدە" هەركامێكیان ـ بە ڕای خۆتان ـ پەسەندە هەڵی بژێرن. عومەر و ئەبووعوبەیدە وتیان: تا تۆ لە ناومان بی ئێمە شتی وا ناكەین، تۆ لە هەموو كۆچكەرەكان بە "فەضل" تری، هاوڕێی پێغەمبەر بووی لە ئەشكەوتەكەدا، جێنشینی پێغەمبەر بوویت بۆ پێش نوێژی، وە نوێژیش پایەیەكی بەرزی ئایینی موسڵمانانە" ئیتر كێ شایەنی پێشكەوتنی هەیە؟ دەستت بێنە با "بەیعەت"ت پێ بكەین.

ئەمان ویستیان پەیمانی بدەنێ، لەولاوە "بەشیر" ی ئەنصاری پێشیان كەوت، ئینجا تیرەی "ئەوس" هەموویان، دوای ئەوان كۆمەڵ كۆمەڵ موسڵمانەكان بەیعەتیان پێكرد.

خوێنەری ئازیز: ئابەم شێوەیە عومەرو ئەبوو عوبەیدە "ئەبوو بەكر" یان كاندید "ترشیح" كردو ئەوجا كۆڕی ئەنجوومەنی ڕاوێژ هەڵیان بژارد.

ئەم وتووێژەیش ئەوپەڕی دیموکراتییەت و یەکسانی پیشان ئەدات، وە هیچ جێگەی ڕەخنە نییە، چونکە حەق هەر بە لێکۆڵینەوە دەرئەکەوێ بێجگە لەمەیش مەبەستی هەردوولایان دەرکەوتنی هەق و ڕاستییە و بەرژەوەندی موسڵمانیان ئەوێ.

کەولبوو ئیشەکە بە بنەمای ڕاوێژ ڕۆیشت، بەڵێ سەئەنجام ئیشەکە کەوتە دەست کۆچکەرەکان بەڵام ئەمە مانای وانییە ئیسلام وای پێویست کردووە، بەڵکو ڕێکەوتن و ڕێزگرتنی موسڵمانەکانە بۆ یەکتر، لەو لایشەوە کە لە قورەیش خەلیفە دائەنرێت، لەبەرئەوە نییە ئیسلام واجبی کردبێت، چونکە ئەگەر وابوایە عومەر نەی ئەفەرموو: "ولو كان سالم ـ مولى أبي حذيفه ـ حيا لأستخلفنه" ئەگەر سالم ـ کۆیلەی ئەبوحوزەیفەیە ـ زیندوو بووایە ئەوم ئەکرد بەجێنشین لە ئەنجوومەنی ڕاوێژ دا.[1]

## هەڵبژاردنی عومەر ( خوا لێی ڕازی بێت ) لە 13 ی کۆچییدا

شێوەی کاندیدکردنی ئەم خەلیفەیە، جیاوازی بوو لەگەڵ کاندیدکردنی خەلیفەی یەکەمدا، ئەم "ئەبوو بەکر" ی کاندید کرد، ئینجا ئەنجوومەنی ڕاوێژ بڕیاریان بۆ دەرکرد.

ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازیی بێت) بینی (فارس‌و ڕۆم) چاویان بڕیوەتە وڵاتی ئیسلام، وە چاوەڕوانی هەلن، هەستا پەیماننامەی نووسی بۆ عومەر، تا دەست بەجێ بڕواتە جێگەکەیەوە وکاروبار بگرێتە ژێر دەست و پشێوی و فەوزا نەکەوێتە وڵاتەوە.

بۆیە هەستا پەیوەندی کرد بە گەورە هاوەڵانەوە و کۆڕی ئەنجوومەنیشی بانگ کرد و ڕاوێژی پێکردن، بەتایبەتی "عەبدولڕەحمان و عوسمانی کوڕی عەففان و، سەعیدی کوڕی زەیدو، ئوسەیدی کوڕی حوضە یر"، یەکەیەکە لێی پرسین: ڕاتان بەرامبەر عومەر چییە...؟ هەریەکەیان بە شێوەیەك وەڵامیان دایەوە، کە هەر هەموویان ڕەزامەندییان نیشاندا بەرامبەری و شایەنی "خیلافەت" ی هەیە، هەرچەندە هەندێکیان وتیان: توندو تیژەو توڕەیە، ئەبوو بەکریش فەرمووی وانامێنێ! بەڵێ پیاو حەق بڵێ دوایی بوو بەو عومەرەی دۆست و دوژمن وەسفی ئەکەن.

کەولبوو شێوەی هەڵبژاردنی عومەر جیاوازییەکی زۆری بوو لەگەڵ ئەبوبەکرا، ئەبوبەکر عومەری دیاریکردوو موسڵمانەکانیش دەنگیان بۆ دا.

ئەمەیش دەقی نوسراوەکەی "ئەبوبەکر"ە کە نووسی ـ بە ئیمامی عوسمان ـ بۆ عومەر (خوا لێیان ڕازیی بێت): "بسم الله الرحمن الرحيم: هذا ما عهد به ابوبكر خليفة محمد رسول الله (ﷺ) عند اخر عهده بالدنيا واول عهده بالاخرة. وفي الحال التي يؤمن فيها الكافر ويتقي الفاجر، إني استعملت عليكم عمر بن الخطاب، فان برو عدل فذلك علمي به ورأي فيه ـ وإن جار وبدل فلا علم لي بالغيب، والخير اردت، ولكل امرئ مااكتسب "وسيعلم الذين ظلموا أي منقلب ينقلبون"[2].

## هەڵبژاردنی عوسمان ( خوا لێی ڕازیی بێت ) لە 23 ی کۆچییدا.

کاتێ "ئەبوو لۆلوئە" ی خوا نەناس ڕمەکەی دا لە پێشەوا عومەر، کۆمەڵێك لە هاوەڵان چوونە لای ووتیان: "خۆزگە کەسێکت دیاری بکردایە بۆ خەلیفە... ئەویش فەرمووی بەڕای ئێوە کێ دیاری بکەم؟ ئەوانیش چەند کەسێکیان بۆ هەڵدا، یەکێ لەوانە "عەبدوڵڵا" ی کوڕی بوو !! ئەمیش تووڕە بوو و فەرمووی: بنەماڵەی عومەر تەنها کەسێکی بەسە بۆ ئەوەی "موحاسەبە" بکرێ لەسەر ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی خۆی بوو".

[1] العدالة الأجتماعية، ل202.

[2] ) تأريخ الاسلام ، ( ب1/ ل212 ) .

دوای وتویژێکی زۆر لە نێوانیاندا فەرمووی: کاروبارتان ئەسپێرم بەو شەش کەسە کە پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوای کرد، لێیان ڕازیی بوو، ئەوانیش ئەمانەن: "عوسمان، عەلی، عەبدولڕەحمان، زوبەیر، طەلحە، سەعدی کوڕی ئەبوو وەققاص" وە داوای لەوانیش کرد کە یەکێکیان هەڵبژێرن لەناو هەموویاندا.

بۆ ئەم کارەش ماوەی بۆ دانان، فەرمووی: لەماوەی سێ ڕۆژدا هەموو ئیشێك تەواو بکەن و "ئەمیر" تان هەڵبژێرن.

پیاوانی ڕاوێژ "هەر شەشیان" کۆبوونەوە، سەرئەنجام عەبدولڕەحمان خۆی لە مافی "خیلافەت" دوورخستەوە، ئەوانیش داوایان لێکرد، هەڵسێ بەجێبەجێ کردنی کاروبارو ئیشەکە تەواو بکات وکێ موسڵمانەکان زۆر ڕایان لەسەریەتی ئەویش ئەوە هەڵئەبژێرێ.

بەڵێ، ئەمیش شەووڕۆژ قۆڵی لێ هەڵماڵی و پرس و ڕای کرد بە خەڵکەکە سەرئەنجام وتیان یەکێ لەم دوو کەسە "عەلی، یا عوسمان "هەرکامێکیان بێ باشە". عەبدولڕەحمان تەماشای کرد خەڵکەکە پتر مەیلیان بۆ "عوسمان" ە، چونکە نەرم تر بوو لە عەلی"... دیارە لەم کاتەدا ئەبێ مافی یاسای هەڵبژاردن پیادە بکات، بێ ئەوەی شەرم لە هیچ کەسێك بکات، بۆیە هەستا خەڵکەکەی کۆکردەوە لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر دا (ﷺ) ئینجا بانگی کرد لەئیمامی عەلی و وتی تۆ: ئەتوانی بە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر و شێوەی ڕەوشتی دوو خەلیفەکەی پێشی خۆت ڕەفتار بکەیت؟ عەلی وتی: تا بتوانم وا ئەکەم. ئینجا داوای لە عوسمان کردوو هەمان پرسیاری لێکرد، ئەویش وتی: بەڵێ "ئەم نەی وت ئەگەر بتوانم بەڵکو وەڵامی تەواوی دایەوە". ئیتر دوای ئەم هەڵسوکەوت و وتوو وێژە عەبدولڕەحمان "بەیعەتی" کرد بە ئیمامی عوسمان، دوای ئەویش موسڵمانەکان هەڵسان بەیعەتیان پێکرد. ئەمەیش کۆتایی مانگی "ذی الحجة" دا بوو، ساڵی 23 ی کۆچی.

**هەڵبژاردنی عەلی ( خوا لێی ڕازیی بێت ) لە 35 ی کۆچییدا.**

شێوەی هەڵبژاردنی ئەم خەلیفەیە زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ هەڵبژاردنی خەلیفەکانی تردا، چونکە بە کوشتنی ئیمامی عوسمان هەندێ جیاوازی و ناکۆکی کەوتە ناو موسڵمانەکانەوە، وە دەرگای بەڵاو فیتنەیان لێکرایەوە، شاری "مەدینە" پڕ بوو بوو لە قەڵەباڵغی هەمە جۆرە، وەك "ئینذاری" جەنگ کرابێ وابوو !! موسڵمانەکان لەبەر سامناکی ئەو ڕووداوە نەیانئەزانی چی بکەن، لەولایشەوە بەشێکی زۆر کەمی هاوەڵان وان لە "مەدینە" ئەوانی تریان لە حەج و عومرە بوون لە مەککە.

کۆمەڵێك هاتن داوایان کرد لە ئیمامی عەلی بەیعەتی پێ بکەن، ئەمیش زانی ئەمانە "ئەهلی حەلل و عەقد = کۆڕی ئەنجوومەنی ڕاوێژ" نین، لەبەر ئەوە داواکەیانی ڕەتکردەوە وفەرمووی: ئەبێ هاوەڵان (ئەنصارو مهاجرین) هەڵسن بەدیاری کردنی خەلیفە تا ئیشە کە دامەزرێ و بەڵا بڵاوە نەکات ـ لەمە زیاتر ـ بە جیهانی ئسلامیدا.

بەڵێ، پیاوە خاوەن ڕاکان کۆبوونەوە و زۆریان کرد لە ئیمام بۆ وەرگرتنی ئەو کارە ئەویش کە زانی هیچ دەرفەتی نییە، داوایکرد ئەبێ ئەم "بەیعەتە" لە مزگەوتدا بێت.. ئیتر ئەنجوومەنی ڕاوێژ کۆبوونەوە لە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) وە پەیمانیان دا بەئیمامی عەلی و خەڵکەکەیش بە دوای ئەواندا، ئەمەیش لە ڕۆژی هەینی 13 ی مانگی ذی الحجە ی ساڵی "35" ی کۆچی بوو.

بەڵام ئەو "ئیجماع" ەی لەبەیعەتی "ئەبوو بەکر و عومەرو عوسمان" دا کرا، بۆ ئیمامی عەلی دروست نەبوو!! لەبەر ئەوە هەندێ ناکۆکی و ساردو سڕی پەیدا بوو بوو لەناو هاوەڵەکاندا لە کوشتنی ئیمامی عوسمانەوە و داوای بکوژەکانیان ئەکرد لە ئیمامی عەلی بییاندا بەدەستیانەوە، ئەویش بە باشی نەئەزانی، چونکە کاروباری ناوخۆ ئاڵۆز تر ئەبوو.

ئینجا لەمەوە ـ زۆر بەداخەوە ـ چەندەها جەنگ و ناکۆکی و هەراو ئاژاوە کەوتە نێوان موسڵمانەکانەوە، ئەوەی کە کرا کرا بە جیهانی ئیسلامەتیی، کافران وجوولەکە و گاوریش دەستیان ئەهێنا بە سمێڵیاندا و سەیریان ئەکرد، هەروەك ئێستا موسڵمانەکان لە هەمووی جیهاندا ـ بەتایبەت خاوەرمیانە دا ـ بەربوونەتە یەکتر و جوولەکەکانیش خەریکی پێشخستنی

ولاتی خۆیانن وه هەموو کات له بۆسەدان بۆیان و خەریکی موتالای "تەورات"ەکەیانن، ئێمەیش خەریکی خۆ کوشتنین و کەللەی سەری یەکتر ئەفرۆشین له پێناوی پارەو پولێکی بێ نرخدا !!!.

جوولەکه هەرگیز "خەیبەرو بەنی نەزیرو بەنی قەینوقاع و..." یان لەبیر ناچێتەوه بۆیه هەر لەوێوه دەستیان پێکرد، وەك "عەبدوللای کوڕی سەبەء" و هەندێکی تریان که به درۆوه هاتبوونه ناو موسڵمانانەوه. تا توانیان جیاوازی و ناکۆکی دروست بکەن له نێوانیاندا، کەوابوو جیاوازی و پەرەوازەیی دەردێکی کوشندەیه لەناو هەر گەلێکدا پەیدا بوو پیشەکێشی ئەکات، (اللهم) مەگەر پەشیمان بێتەوه و یەکبگرێتەوه و یەك بیرو یەك بۆچوون و یەك ڕایان بێ.

ئابەم شێوەیه باسمان کرد یاسای "حوکم و شوورا" ڕۆشن بوویەوه، که ئەمیش ئەوه نیشان ئەدا هەموو کاربەدەستەکان، موسڵمانەکان هەڵیان بژاردوون... ئاوایان بەباش زانی که له پێشەوه "ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان، ئینجا عەلی" بکەن به خەلیفە.

پاشان "بەنی ئومەییه" هاتن که له "موعاوییه"وه دەستیان پێکرد له "مەروان"ی دووەمدا حوکمیان له دەست نەما، واته له "41 ـ 132 ، 661 ـ 750". نزیکەی هەشتا ساڵێکیان خایەند. بەلام لەگەڵ ئەمەیشدا کاریان هەر بەپەیمان و "عەهد" ئەکرت، موعاوییه بۆ"یەزید"، مەروان بۆ "عەبدولمەلیك"ی کوڕی، ئەمیش بۆ وەلیدی کوڕی، ئینجا بۆ سولەیمان... هەروەها.....

خەلیفه هەر لەژیانی خۆیدا "بەیعەتی" وەرئەگرد بۆ ئەوەی نێت بەدوایدا، ئینجا که ئەچووه سەر حوکم موسڵمانەکانەکانیش بەیعەتیان پێ ئەکردن.

هەندێ ئەڵێن: بۆیه موعاویه یاسای "ویراثی" داهێنا، چونکه پشێوی و "فەوزا" یەك ڕوویدا بوو لەناوچە و ولاتدا کەس بەگوێی کەسی نەئەکرد، ئەگەر یاسای دەمارگیری و هێز نەهاتایه کایەوه، لەو لایشەوه ئیسلام هێشتا خەریکی کۆتکردنی دوژمنانی بوو و خەریکی "فتوحات" بوو، ئومەییەکانیش لەو ڕووەوه زۆر بەهێز بوون[1]. ناچار هەڵستا بەو ڕژێمە.

## دانانی وەلی عەهد

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەیە ـ لەباسی دیاری کردنی خەلیفەکاندا کردمان ـ دەرکەوت که (بەیعەت) به هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی ڕاویژ ـ هەموویان، یان زۆربەیان ـ تەواو بووه، هەرئەو خەلیفەیەیش جێ نشینی پێشووی دیاری کردووه، بەلام هەر بەوه "خیلافەت"ەکەی دانەمەزراوه، بەڵکو ئەو (تەشریح، کاندیدی) کردووه و ئەنجوومەنیش بڕیاری لەسەر داوه، وەیا پشتگوێی خستووه و کەسێکی تری هەڵبژاردووه.

"عومەری عەبدولعەزیز" (خوا لێی ڕازی بێت) ئاوا تێگەیشتبوو"واته هەرچەندە خەلیفەی پێشوو وەصیەتی بۆ کردبێ، هەر ئەبێ ئەنجوومەن بڕیاری خۆی بدا" بۆیه کاتێ "سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك"ئەمی هەڵبژارد بوو وەسیەتنامەی بۆ بەجێهێشتبوو و نووسراوەکەی مۆر کرد بوو، تیایدا نووسی بوو که: "ڕەجاء" بنەماڵەکەی کۆبکاتەوه و بەیعەت بکەن بۆ ئەو کەسەی ناوی لەم نووسەراوەدا هاتووه بێ ئەوەی ناوەکەی بزانن! !... بەڵێ دوای ئەوەی سولەیمان مرد "ڕەجاء" خەڵكێکی کۆکردەوه وپەیمانی لێ وەرگرتن بۆ ئەوکەسەی ناوی لەم نوسراوەدا هاتووه، ئینجا دوای بەیعەتەکه پەیامەکەی "سولەیمانی خوێندەوه که ئەمەیش دەقەکەیەتی: "هذا الكتاب من عبدالله سليمان أمير المؤمنين لعمر بن عبدالعزيز. اني قد وليته الخلافة بعدى، ومن بعده يزيد بن عبدالملك فاسمعوا له وأطيعوا واتقوا الله ولا تختلفوا فيطمع فيكم" واته: ئەم نووسراوه لەلایەن بەندەی خواوەیه ئەمیری موسڵمانەکان "سولەیمان" بۆ عومەری عەبدولعەزیز. ئەوا عومەرم کرده جێ نشینی خۆم، ئینجا دوای ئەویش "یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك"... ئەوه بوو له شانسی موسڵمانەکانی ئەو سەردەمه "خەلیفه ی پێنجەمی ڕاشیدین وەك ئیمامی شافیعی ئەفەرموێ" ناوی دەرچووو.

---

[1] تأريخ الاسلام / دکتۆر حسن ابراهيم حسن و( معالم الثقافة الاسلامية ) دکتۆر عثمان.

به‌لام دوای ئه‌وه ده‌رکه‌وت که: "عومه‌ر" ده‌بێ بڕواته سه‌رته‌ختی حوکم بیری لێکرده‌وه که په‌یمانه‌که‌ی ته‌واو نییه، چونکه:

یه‌که‌م: (سلیمان) خۆی به ڕاوێژی موسڵمانه‌کان نه‌بووه به خه‌لیفه.

دووه‌م: خۆیشی پێی ڕازی نییه "چونکه وتمان ئه‌بێ ئه‌و که‌سه که ئه‌کرێ، به‌جێنشین خۆیشی پێی ڕازیی بێت" هه‌روه‌ك له وتاره‌که‌یدا هاتووه: "انی والله ما استؤمرت في هذا الأمر وأنتم بالخيار". واته: سوێند به خوا من ڕای خۆم له‌سه‌رئه‌م کاره وه‌رنه‌گیراوه و ئێوه‌ش ئازادن له ڕه‌تکردنه‌وه‌یدا یان له قه‌بوڵکردنیدا"...."يا ايها الناس إني قد ابتليت لهذا الأمر من غير رأى كان مني فيه ولا طلبة له و لامشورة من المسلمين، وإني قد خلعت مافى أعناقكم من بيعتى فاختاروا لأنفسكم".

واته ئاده‌میزاده‌کان من ئه‌م کاره‌م دراوه به‌سه‌را بێ ئه‌وه‌ی خۆم ڕام بۆ بوویێ وه‌یا داوام کردبێ، وه‌بێ ڕاوێژ کردن به کۆڕی موسڵمانه‌کان، ئه‌وا ئه‌و به‌یعه‌ته‌ی وا به ئه‌ستۆتانه‌وه "که بۆ من کراووه له‌لایه‌ن ڕه‌جاوه" داماڵی و له‌سه‌رشانی ئێوه‌م لابرد، ئیتر ئێوه بڕۆن پێشه‌وا بۆ خۆتان هه‌ڵبژێرن.

عومه‌ر (خوا لێی ڕازی بێت) ئه‌یزانی به‌یعه‌ت وه‌ك چوار خه‌لیفه‌کان ئه‌بێ، که‌وابوو دانانی "وه‌لی عه‌هد" بێ ئه‌وه‌ی موسڵمانه‌کان هه‌ڵیبژێرن و، بێ ئه‌وه‌ی خۆی پێی ڕازی بێت - به‌تایبه‌ت ناویشی نه‌هێنرا بێت - په‌یمانی ئاوا ناڕه‌وا و نادروسته.

جا بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌م باسه‌مان - دلنانی وه‌لی عه‌هد - پتر ڕۆشن تر بێته‌وه لای خوێنه‌ر ئه‌ڕۆین بۆ خزمه‌تی زاناکان - ئه‌وانه‌یان خاوه‌ن ڕان و ده‌ستی ورده‌کارییان هه‌یه:

(ماوه‌ردی) ده‌ڵێ: دانانی "ئیمام = وه‌لی عه‌هد" له‌لایه‌ن خه‌لیفه‌ی پێشووه وه "ئیجماع"ی له‌سه‌ره که دروسته و داده‌مه‌زرێ له‌به‌ر دوو به‌ڵگه: یه‌کێکیان ئه‌مه‌یه (ئه‌بوبه‌کر" وه‌صیه‌تی کرد بۆ عومه‌ر، موسڵمانه‌کانیش سه‌لماندیان.

ئه‌وی تریان ئه‌وه‌یه: عومه‌ر خیلافه‌ته‌که‌ی سپارد به ئه‌نجوومه‌نی ڕاوێژ و ئه‌وانیشیان وه‌ریان گرت و خه‌ڵکیش چوونه ناو په‌یمانه‌که‌وه.... جا هه‌رکات ئیمام ویستی "خیلافه‌ت" بسپێرێ به‌که‌سێك، ئه‌بێ هه‌وڵ بدات و که‌سێکی شایه‌نی بۆ بدۆزێته‌وه...".[1] به‌ڵێ، ئابه‌و شێوه‌یه "وه‌لی عه‌هد" دیاری ئه‌کرێ، وه ئه‌بێ مه‌رجه‌کانی "ئیمامه‌تی" تیا بێته دی، چونکه هه‌ر ته‌نها به دانانی خه‌لیفه‌ی پێشوو نابێ ببێ به خه‌لیفه.

زانایان ئه‌ڵێن: ئه‌و "وه‌لی عه‌هد"ه نابێ کوڕی خه‌لیفه پێشووه‌که بێت "چونکه ئه‌بوبه‌کر عومه‌ری دانا" وه نابێ خزمایه‌تیه‌کی نزیك له نێوانیاندا بێت چونکه ئه‌بوو به‌کر عومه‌ری دانا.[2]

ئیبن حه‌زم ئه‌فه‌رموێ: موسڵمانان - هیچیان - جیاوازییان نییه له‌وه‌دا که: دروست نییه به‌کارهێنانی ڕژێمی "پشتاو پشت" له "خیلافه‌ت"دا.

- "ئه‌بوویه‌علی" قاضیی ئه‌فه‌رموێت: "ئیمامه‌ت" هیچ کات به میرات وه‌رناگیرێ.

- به‌غدادی ئه‌فه‌رموێت: هه‌رکه‌سێك دان بنێت به "ئیمامه‌ت"ی ئه‌بوو به‌کردا ئه‌ڵێت: جێ نشین به میراتی وه‌رناگیرێ.

- ئیبن خه‌لدوون ئه‌فه‌رموێت: ئه‌گه‌ر مه‌به‌ست له دیاری کردنی "وه‌لی عه‌هد" پاراستنی بێت بۆ بنه‌ماڵه و کوڕه‌کان، ئه‌وه په‌یوه‌ندی به ئایینه‌وه نییه.

- ئیبن ته‌یمییه ئه‌فه‌رموێت: هه‌ر به‌وه خه‌لیفه یه‌کێك بخاته جێگه‌که‌ی خۆی، ئه‌و که‌سه نابێ به جێ نشین، به‌ڵکو ئه‌بێ ئه‌نجوومه‌نی ڕاوێژ دانی پیادا بنێ.

به‌پێی وته‌ی ئه‌م زانایانه و هه‌ندێکی تریشیان ڕوون بوویه‌وه که "وه‌لی عه‌هد" ئه‌بێ ئه‌نجوومه‌نی ڕاوێژ وه‌ریگرێت و دانی پیادا بنێن.

---

[1] ) الاحكام السلطانية ،ل10 .

[2] ) من اصول الفكر السياسي الاسلامي ، دكتۆر محمد فتحي عثمان ، ل433 .

هەندێکی تریان ـ زاناکان ـ بەلایانەوە وایە کە "خیلافەت بە دانانی وەلی عەهد" دائەمەزرێ، بەڵام تا خەلیفەی وەصیەتکەر ـ لەژیانا بێت، وەصیەت بۆ کراوە کە دەستکاری کاروبار ناکات... ئەم دەستەیەیشیان هەرچەندە وا ئەڵێن، بەڵام خەلیفەی وەصیەت بۆ کراو ئەبێ ئەو مەرجانەی پێویستن بۆ جێ نشین تێدا بێتە دی، ئەگینا دانامەزرێ.[1]

هەر ئەم دەستەیە ئەچن بەگژ ئەو کەسانەدا کە بەلایانەوە دروستە ئەو جموجووڵ و ئاڵوگۆڕەی "بەنی ئومەییە و عەبباسییە"کان کردیان، چونکە "وەلی عەهد"ەکانیان هیچیان مەرجەکانی ئیمامەتیان تێدا نەبووە.

ئینجا بۆیە موسڵمانانیش بێ دەنگ دانیشتبوون بەرامبەریان، چونکە خاوەن دەسەڵات بوون و زاناکانیش ترسی بەرپابوونی "فیتنە" و بەڵایان بووە.

ئەم دەستەیەش ـ کە بەلایانەوە ـ وەصیەت کردن بۆ ئەوەی دێت بەدوای ئەودا دروستە، ئەبنە دوو دەستەوە: بەشێکیان ئەڵێن ئەبێ ئەنجوومەنی ڕاوێژیش دانی پێدا بنێ، وەك چۆن خەلیفەی پێشوو هەڵیبژاردووە و بەیعەتی پێکردووە، ئەگەر وانەبێت ئەو وەصیەتە ناڕەوا و ناپەسەندە.

بەشێکی تریشیان بەلایانەوە وایە کە: خەلیفەی پێشوو بەیعەتی پێ کردووە، لەسەر موسڵمانانیش گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری پێویستە، وە ئیتر ڕازی بن یانە، ئەو خیلافەتە دائەمەزرێ. ئاشکرایە ئەم ڕایە زۆر هەڵەیە.

ئێنجا لێرەدا شتێك ماوە باسی بکرێ ـ ئەویش ئەوەیە ئایا ڕەوایە "عەهد و بەیعەت" بۆ کوڕ؟! کۆمەڵێ لە زاناکان ئەفەرموون: ڕەوایە، بەڵام بەو مەرجەی ئەنجوومەنی ڕاوێژ دانی پیادا بنێ و بەلایانەوە شیاوی "خیلافەت" بێ.

دیسانەوە ئەو دەستەیەش کە بەلایانەوە "بەیعەتی" خەلیفەی پێشوو دروستە و پێویست ناکات ئەنجوومەن ڕای بۆ بدەن ئەوانیش ئەڵێن ئەگەر بەیعەتەکە لە باوکەوە بوو بۆ کوڕ، وەیا لە کوڕەوە بوو بۆ باوك، ئەوە پێویستە ئەنجومەنی ڕاوێژ بیسەلمێنێ و بەلایەوە ڕاست بێت.

### ئەو کەسەی بەزۆر ئەڕواتە سەر حوکم

هەندێ لە زانایان ـ دیسانەوە ـ بەلایانەوە دروستە کە ئەگەر کەسێك بەزاڵبوون کاروباری وڵاتی گرتە ژێردەست، ئەوە پێویستە گوێڕایەڵی و فەرمانی پیادە بکرێ لەلایەن موسڵمانانەوە، ئەم جۆرە جێ نشینە لە فەرهەنگی زاناکاندا پێی ئەڵێن "إمامة المتغلب".. یا "إمارة الاستیلاء" کە هەردووکیان یەك مەبەست ئەگەیەنن، وە هەندێ کاتیش بەم ڕستەیە لێکیان داوەتەوە: "إمامة الضرورة". چونکە لە ناچارییدا پێشەوایە و بە زۆر خۆی سەپاندووە بەسەر کاروباردا، ئەگینا لە ڕاستیدا زاناکان ئەڵێن: لەبەر ئەوەی "فیتنە" بەرپا نەبێت لەناو موسڵماناندا و خوێنیان نەڕێژێ پێویستە ملی بۆ بدەن، با مەرجەکانی "ئیمامەت" یشی تێدا نەهاتبێتە جێگە، بەڵام ئەڵێن: ئەگەر لەدژی هەڵسان ولە شۆڕش بەرپاکردندا فیتنەیەکی ئەوتۆ بەرپا نەبوو، ئەوە پێویستی سەرشانی موسڵمانانە هەڵسن هەوڵ بدەن بۆ لابردنی و دوور خستنەوەی لە موسڵمانان.

ئەم دەستەیە هەندێ بەڵگە دێننەوە بۆ دامەزراندنی سەرۆکایەتی بە زۆر، کە بەڕاستی ئەوەندە لاوازو پووچەڵن بەکەڵکی ئەوە نایەت بیانخەینە سەر کاغەز!!.

بەڵام با ئەوەیش بڵێین ئەگەرئەو زانایانە بیان زانیبا ئاوا "جیهانی ئیسلامەتی" ئەکەوێتە تاریکیەوە بەهۆی ئەو سەرۆکە ستەمکارانەوە هەرگیز فەتوای ئاوایان نەئەدا چونکە ئەوان، بۆیە فەتوایان دا تا فیتنە و کوشتار نەکەوێتەوە... دەی خۆ ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا... کەوابوو ئەگەر لەم سەردەمەدا بژیایەن هەرگیز فەتوای دامەزراندنی "ئیمامەت" ی زۆرکاریان نەئەدا.

تەنانەت هەندێکیان "تەشبیهی" ئەم جۆرە حوکمانە ئەکەن بە خواردنی گۆشتی "بەرازو سەگ" ەوە لەکاتی ناچارییدا، وە ئەڵێن هەمووکات ئەبێ هەوڵ بدرێ بۆ لابردنیان و دوورخستنەوەیان لەدامودەزگای موسڵمانان .[2]

---

[1] من اصول الفکر السیاسی الاسلامی ، دکتۆر محمد فتحی عثمان.

[2] من اصول الفکر السیاسی ، دکتۆر محمد فتحی عثمان.

بەكورتیی:

پێشەوایەتی بە سێ جۆر دائەمەزرێ، وەك زاناكان ئەڵێن:

یەكەم: ئەوەیە ئەنجوومەنی ڕاوێژ- ئەوانەیان ئەگونجێ كۆببنەوە - بەیعەتی پێ بكەن و هەڵیبژێرن.

دووەم: ئەوەیە خەلیفە دیاری بكات هەر لە ژیانی خۆیدا، بەو مەرجە ئەنجومەنی شوراش، دیاریكراوەكە قبووڵ بكەن.

سێهەم: ئەوەیە بەزۆر و زۆركاری سواری كورسی دەسەڵات ببێ، بانا ئەهلیش بێت بۆ ئەو ئیمامەتە، بەم شێوەیە بە هێزی سەربازو چەك حوكمەكەی ببات بەڕێوە... [1].

جا ئەمە دروستە بۆ ئەوەی - بەحیسابی ئەوان - كاروباری موسڵمانان بڕوات بەڕێوە! [] .

بەڵام "قەسطەلانی=ڕاڤەكەری بوخاری" ئەفەرموێت: "وقد أجمع الفقهاء على ان الامام المتغلب تلزم طاعته ماأقام الجماعات والجهاد الا اذا وقع منه كفر صريح فلا تجوز طاعته في ذلك بل تجب مجاهدته لمن قدر" [] .

واتە دەستەی زاناكان - هەموویان - ئیجماعیان لەسەر ئەوەیە ئەو ئیمامەی كە بەزۆر كاروباری گرتۆتە ژێر دەست پێویستە فەرمان بەرداری و گوێڕایەڵی، تا ئەوكاتەی هەڵستێ بە "جومعە و جەماعەت وجیهاد " ئەوە ئیتر سەرپێچی ناكرێ، سامەگەر لەگەڵ ئەوەیشدا كە هەڵستێ بە جومعە و جەماعەت..." كوفرێكی ئاشكرای لێوە دەركەوێ، ئەوە ئیتر دروست نییە گوێڕایەڵی... بەڵكو پێویستە هەركەسێك بتوانێ هەڵسێ بە جیهاد و هەوڵ و تێكۆشان دژیی، تا لەناو ئەبرێ وحوكمەكە ئەگەڕێتەوە بۆ ژێر ڕكێفی فەرماندەیەكی چاك. هەزار هەزا رجار ڕەحمەت و سۆزی خوای گەورەت لەسەر بێ بۆ ئەو بۆچوونەت كە چەند گونجاو و ڕێكە لەگەڵ "ڕۆح" ی ئیسلامدا، لەگەڵ بەرنامەی خوادا، چونكە بەرنامەی خوا بۆ ئەوە نێرراوە بە پێی ئەوحوكم بكرێت، ئەو بەرنامە بێت، جا هەركات حكومەت درایە دەست "هەرزەو منداڵ" و ئەوان كاروباریان داگیر كردو هیچ كەسیش دەنگی نەكرد ئەی چۆن دەستی ستەمكاران ئەشكێنرێت؟!

زانایان (خوا لێیان ڕازی بێت) بۆیە فەتوای دامەزراندنی حكومەتی ئەم وئەویان دا تا فیتنە و بەڵا دووچاری موسڵمانان نەبێت، كەچی ئەوەی ئەوان ڕایان لێكرد لێی خراپتر هاتە جێگەی.

بەڵای هەرە گەورە ئەوەیە ڕازی بیت بە دەرچوون لە فەرمانی خوای گەورە و سەر دابخەیت. كاروباری "دین و دنیا" لەسەر غەیری ڕێبازی خوا پیادە بكرێت.

نابێ هیچ موسڵمانێك ڕازیی بێت بەوەی خوا پێی ڕازی نییە، یا پاڵ بداتەوە لێی تا خوا خۆی چاكی ئەكات!

ئەگەر ئێمە لەترسی "فیتنە و سزاو ئەشكەنجە و ئازار" چاو بنووقێنین لە ستەمی ستەمكاران و دنیا خۆرەكان ئەی كێ پێی هەڵستێ..؟.

ئەگەر دروستە چاو نووقاندن بەرامبەر بەكار بەدەستە ستەمكارەكان "لەترسی فیتنە" ئەی ئیسلام چۆن هاتووە؟ ! ئەی موسڵمانانی پێشووی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ قبووڵی ئەو هەموو ئازارەیان كرد..؟!

فیتنە لەوە گەورەتر ئەبێ كە ڕوویدا لەوان ! ماڵ و سامانیان لێ داگیركردن، دەربەدەریان كردن، سەریان بڕین، خستنیانە ناو "زەیتە" وە، خستنیانە ناو "ئاگرەوە ! !" چەند جار ئاوارە بوون، جارێ بۆ حەبەشە، جارێ بۆ "طائیف"، جارێ بۆ "مەدینە"…. وە هەرووەها.

خوێنەری خۆشەویست!

ڕاستیەكەی ئەمەیە هەر ڕژێمێك لەگەڵ بەرنامەی خوادا نەگونجێ پێویستە لابرێ ئیتر هەرچەندە قوربانی و فیداكاری تێ بچێت، هەرچەندە دارایی و سامانی بۆ خەرج بكرێ، دیارە ئەمەیش ڕێگەی خۆی هەیە، كە ئەویش ئەوەیە پێغەمبەر

---

1) الاسلام واوضاعنا السياسية ، عبدالقادر عودة، وەكتێبی ( من اصول الفكر السياسي الاسلامي) ، د . محمد فتحي عثمان .

1) ارشاد الساری ( ب10 ل218 ) .

2) ارشاد الساری ( ب10 ل169 ) .

(ﷺ) بەکاری هێنا بۆ سەرخستنی یەکەم کۆمەڵی بڕواداران، کە ئەوە بوو هیچ کات سەریان دانەخست لە ئاستی ستەم، تا خوایش سەری خستن.

ئیتر ئاواتە خوازم خوا "ڕۆح" ی جیهاد بخاتەوە دڵمانەوە و ڕێگەی شۆڕش بگرینە بەر بۆ هێنانەوەو سەلماندن و چەسپاندنی ئەم دینە.

## ئایا چەند ئیمامێك لە یەك كاتدا دروستە؟

بۆ ئەم پرسیارە ئەڵێین: لەبناغەدا ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەسەریەكێتی دامەزراوە، واتە وادامەزراوە كە لەناو خاكی ئیسلامدا یەك "پێشەوا" ی ببێ تابتر ڕیشەی یەكێتی و هێزی ڕەچاو بكرێ. بابزانین زانایان چی دەڵێن:

أ ـ (باقەلانی) ئەفەرمووێ: لەبناغەدا هەركات چەند كۆمەڵێك لەئەنجومەنی ڕاوێژ بەیعەتیان كرد بەچەند "ئیمام" ێك، لەچەند شارێكی جیاجیادا، وە هەمویشیان ئەگونجان بۆ پێشەوایەتی، وە لەو سەردەمەیشدا نە "ئیمام" بوو، وەنە "وەلی عەهد" یش ئەوە ئەم تێ بینیانە ئەكەین: یەكەم: كامیان پێش كەوتووەو بەیعەتی پێ كراوە "ئیمامەت" ە كە بۆ ئەوەیان دائەمەزرێ، ئینجا ئەبێ ئەوانی تریان دابەزن. خۆ ئەگەر مانەوەو دانەبەزین ئەوە جەنگیان لەگەڵ ئەكرێ و بەتاوانبار ئەژمێررێن.

دووەم: ئەگەر نەزانرا بەیعەتی كامیان پێشكەوتووە ئەوە هەموویان بەناڕەوا دائەنرێن و ئەبێ سەرلەنوێ بەیعەت بكرێتەوە بەتەنیا كەسێكیان، وەیا بەكەسێكی تریش بالەوانیش نەبێت، ئەگەر ئەمانیش ویستیان دانەبەزن جەنگیان لەگەڵ ئەكرێ... خۆ ئەگەر هیچیان دانەبەزین ئیتر بەسەردەمی "فیتنە" دێتە قەڵەم و موسڵمانان گوناهبار نابن بۆ ئەوەی ئیمامیان نییە....".

ب ـ (بەغدادی) ئەفەرمووێ: "هاوەڵانمان ئەڵێن لەیەك كاتا نابێ دوو پێشەوای فرمان پیادە كراو ببێ، بەڵكو تەنها "بەیعەتی" یەكێكیان دائەمەزرێ و ئەوانیش ئەبێ لەژێر ڕكێفی ئەمدابن، ئەگەر سەر پێچیان كرد بێ هۆی شەرعی ئەوا (یاخی) "بغات" دا ئەنرێن و جەنگیان لەگەڵ ئەكرێ... "بەیعەتی تەنها یەكێكیان دائەمزرێ" سامەگەر دەریایەك لەنیوان شارەكەدا بێت، بە شێوەیەك هاوارو یارمەتی هیچیان نەگاتە ئەوی تریان، ئەوە لەم كاتەدا دروستە هەرشارێك بەیعەت بكات بە "ئیمام" ێك لەناوچەكەی خۆیدا.

بەغدادی لەوتەكەیەوە وادەرئەكەوێ كە "ئەصل" ئەوەیە جیهانی ئیسلام یەك ئیمامیان ببێ، هەروەك ئەوەی ڕەچاو كردووە كە ئەگەر سیاسی ئیسلامیی، یا شێوەی جوگرافیای وڵاتەكەی بەش بەش كردبوو دروستە چەند پێشەوایەك.

ج ـ (ماوەردی) ئەفەرموێ: ئەگەر لەیەك سەردەمدا بەیعەت كرا بەدووپێشەوا لەدوو شاردا ئەوە هیچیان دانامەزرێ. هەروەها لەسەر باسەكەی ئەڕوات ئەفەرموێ "دوای هەندێ كێشەی زانایان" ئەوەی زاناكان پێیان خۆش بێت ئەمە یە كە: هەركامیان بەیعەتەكەی پێشكەوتبێ بۆ ئەوەیان دائەمەزرێ.."

ح ـ قاضي "ئەبوویەعەلل" ئەفەرمووێ: "نابێ لەیەك كاتدا دووپێشەوا دابنرێ بۆ موسڵمانان، هەرچەند هەندێ زانا ئەڵێن: لەشارە دوورەكاندا ـ لەكاتی پێویستیدا ـ دروستە دووئیمام..." [1].

بەڵێ بەپێی ئەو دەقانەی سەرەوە وا دەرئەكەوێ دروستەچەند دەوڵەتێك ـ ئەگەر سیاسی ئیسلام ـ داوای بكات... بەتایبەت لەم دوا دوایانەدا كە ئیسلام ـ سوپاس بۆ خوا ـ ئاڵای خۆی دلچەقاند لەسێ كیشوەری گەورەدا، ئاشكرایشە چاودیری ئەو وڵاتە دوورانەوەو كۆكردنەوەی هەموویان ـ لەگەڵ جیاوازی شێوە ی زاراوەو نەریتیان ـ لەژێر حوكمی تەنها ئیمامێكدا ئاسان نییەو گرانە، بەتایبەت لەو سەردەمانەدا كەبە یەكگەیشتن زۆر ناڕەحەت بووە، چونكە وەك ئێستا فڕۆكە و ئۆتۆمبیل و پاپۆڕ... نەبووە.

پێشەوا "ئیمامولحەرەمەین" هێما بۆ ئەم ڕاستییە ئەكات "هەر كات پێویست بوو" [2].

ئەمە ڕای زانایان بۆ ئەم پرسیارە، وە ئەوە بوو هەر هەموویان ئەوەیان پێ خۆش بوو كە تا بگونجێ دروست نییە دوو ئیمام، وەیا پتر، بۆ ئەوەی جیاوازی و پەرەوازەیی نەكەوێتە جیهانی ئیسلامەتییەوە، خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ ..). (وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَـئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ)

---

1 ) اصول الفكر السياسي الاسلامي ، ل 444 – 446 .

2) الاسلام واوضاعنا السياسية ، ل218 .

ئاشكرایە هەركات وڵاتی ئیسلام پارچە پارچە كراو، بۆ هەر پارچەیەكی (سەرۆك)" ێك دیاریكرا ـ وەك ئەمڕۆ ـ دیارە كاریش سەرئەنجام هەروەك ئەمڕۆ ئەبێت! ! !.

(وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ).[3]

خوای گەورە پێویستی كردووە لە سەر موسڵمانان یەكدەنگ بن، یەك ئامانج بن، یەك بەرنامە بن، یەكێتیان ببێ وە هەموویان لەژێر یەك ئاڵادا ـ ئاڵای قورئان ـ كۆببنەوە.

پێغەمبەری ئازیزیشمان (ﷺ) ئەم مانا و واتەیەی دووپات كردۆتەوە بەم فەرموودە شیرینانەی:

أ ـ "اذا بويع لخليفتين فاقتلوا الاخر منها..." ئەگەر لەیەك كاتا پەیمان درا بە دوو خەلیفە، دوایینەكەیان بكوژن. واتە بۆ ئەوەی پەرەوازەیی لاوازی نەكەوێتە نێوانیانەوە ئەگەر كەسێك ـ دوای یەكەم ـ داوای "خیلافەت"ی كرد و هەندێك بەیعەتیان پێكرد، ئەوە داوای دابەزینی لێ بكەن، خۆ ئەگەر هەرسوور بوو لەسەر قسەی خۆی ئینجا بیكوژن.

ب ـ هەر مەبەستی ئەم یەكێتی و یەك ڕایەیە كە ئەفەرمویێ: "من اتاكم وامركم جامع على رجل واحد يريد ان يشق عصاكم ويفرق جماعتكم فاقتلوه".

ج ـ "ستكون هنات وهنات فمن اراد ان يفرق هذه الامة ـ وهي جميع ـ فاضربوه بالسيف كائنا من كان".

ئەم فەرمودانە هەر هەموویان داوای یەكدەنگی، ومیەك دەوڵەتی، ومیەك بەرنامەیی ئەكەن لەجیهانی ئیسلامدا".[1]

**سێهەم: هێزی دادوەری لە یاسای ئیسلامدا**

لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا پێویستە هێزێك ببێ بۆ ئەوەی هەستێ بە پیادەكردنی بەرنامەكەی خوای گەورە بەو شێوەیەی ناردوویەتی و مەبەستیەتی.. تا دادگەری و یەكسانی بڵاو بكاتەوە لەناو بەرەی ئادەمیزاددا بێ جیاوازی لە نێوان "زەید و عەمر" دا .

ئەم هێزەیش لە فەرهەنگی ئیسلامدا پێی ئەڵێن: "هێزی دادوەری = السلطة القضائية" جاكە خەلیفە پیاوێكی دەست نیشان كرد بۆ ئەم كارەیەو سەرپەستی كرد بۆ ئەنجامدانی كاروبار بە ئارەززوی خۆی، لە هەموو شوێنێك و، لە هەموو كاتێك، ئەوە مانای وایە لە هەموو ئیشێكدا دەستی ئەبێت و لە هەموو ناوچەیەكدا حوكم ئەكات... بەم جۆرە "دادوەرانە" ئەڵێن "دادوەری گشتی".

---

[1] آل عمران /102

[2] (آل عمران : 105 )

[3] (المؤمنون : 52 )

1) كەوابوو سەربارەت بە ئێستای جیهانی ئیسلامەتی ـ كە بەیەكگەیشتن زۆر ئاسانە بەهۆی ئەو ئامێرانەوە كە دانراوە لە ئۆتۆبیل و فرۆكە و بێ تەل و ـ تەلەفون ... هتد پێویستە لە ژێر یەك ئاڵادا كۆببنەوەو هەمویان یەك: (حوكمەتیان ببێ، بە تایبەت دوای ئەوەی كە ئەو هەموو لاوازی و بێدەسەلاتییە هاتووە بەسەریاندا بەهۆی پەرتەوازەیانەوە. ئای چەند خۆشە وڵاتە موسڵمانەكان هەر هەموویان كۆببنەوە (سنوور) لە نێوانیاندا هەڵگرن و یەك سەرەك بۆ خۆیان هەڵبژێرن و (ئەی "بێگانە" بۆ دەرەوە)ی لێبكەن، جا ئەوكاتە بزانم (وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، یا ڕووس) ئەوێرن بەرامبەریان بكۆكن. ئەمیش هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە ــ كە هەموویان ببن بە دەوڵەتێكی یەكگرتوو ـ چونكە ئەوەتا (ئەمریكا) لەچەند وڵاتێك پێكهاتووە هەروەها (ڕووس)، دەی خۆ ئەمە هیچ كەسێك ڕەخنەی لێ ناگرێ، بەڵكو بە پێشكەوتوویش ئەدرێتە قەڵەم، بەلام ئەگەر بڵێن باموسڵمانەكان ــ هەموویان ــ یەكبگرن و یەك پێشەوا (ئیمام)یان بێت و سنوور لە نێوانیاندا نەبێ، كوفرو دامودەزگای جیهان چاومان لێبزر ئەكەونەوە و بەسەدان درۆو بوختانمان بۆ هەڵئەبەستن. تەنانەت هەر بەچكە موسڵمانەكانی لای خۆیشمان دەست ئەكەن بەچەواشەكاری! با ئیتر شاگردەكانی (ڕووس و ئەمریكا) بوەستن چۆن ئەكەونە پەلە قاژێ و خەریكە گیان ئەسپێرن بە خاك، نازانم بۆ...؟ ئەگەر لەبەر ئەوە بێت تەنها ئیشی ئەوانیان بەدڵ بێت، دەی خۆ ئێستا ئەوان پێكهاتوون لەچەندان دەوڵەت. بۆچی بۆ ئەوان ڕەوایە و بۆ ئێمە یاساغە؟ دیارە هەر ڕقیات لە ئیسلامە، ئەزانن ئەگەر ئەم دەوڵەتە موسڵمانانەكە ئێستا ئەوان یارییان پێ ئەكەن ـ یەكبگرن و ئاڵایان یەك بێت، ئامانجیان یەك بێت، بەرنامەیان یەك بێت، لە هەموویان سوپایەكی بڕوادار پێكبهێنن. ئەزانن ئەو كاتە ئیتر ناتوانن ئابەو شێوەیە خۆیان بكەنە كۆنجت لە خاوەرمییانەدا.

هێزی دادوەری ـ لە ئیسلامدا ـ نوێنەری کۆمەڵ و ئوممەتە ـ بەلای هەندێ لە زانایانەوە ـ بۆیە ئەگەر جێ نشین بمرێت ئەم لەکاری خۆی ناکەوێت و "عزل" ناکرێت .

دادوەری لە یاسای سیاسی ئیسلامدا شێوەیەکی بەرزی سەرسوڕهێنەری هەیە، وە لەهەموو دادوەرییەکانی تری جیهان جیا ئەبێتەوە بەمە کە ئەم پتر لە هەموویان سوورە بۆ بڵاوکردنەوەی دادگەری و پیادەکردنی بەسەر کاربەدەست و مرۆڤەکانی تری کۆمەڵەکەدا.

قورئانی پیرۆز پڕە لەم جۆرە ئایەتانەوە هانی "حاکم"ەکان ئەدات بۆ فەراهەمهێنانی دادگەری: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ) .

خوای گەورە داوا ئەکات لە پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی هەڵسێ بە بڕینەوەی کێشە لە نێو خەڵکەکەدا (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ...).

هەروەك لە فەرموودەی حەزرەتدا (ﷺ) هاتووە کە سیفەتێکی ئەو پێغەمبەرە ئەوە بووە: دادوەری نێوان خەڵکی کردووە: "انما انا بشر مثلكم وانكم تختصمون الى، فلعل بعضكم ان يكون الحن بحجتة من بعض فاقضى له على نحو ماأسمع منه فمن قضيت له بشى من حق اخيه فلا يأخذن منه شيئا فإنما اقطع له قطعة من النار..". واتە: من ئادەمیزادێکم وەك ئێوە، ئێوەیش کێشە دێنن بۆ لای من، وایش دەبێت هەندێکیان قسەزان ترن لە هەندێکی ترتان، ئینجا منیش بەپێی ئەوە بڕیاری بۆ ئەدەم کە لێی ئەبیسم جا ئەوەی من بڕیاری بۆ ئەدەم و هەقەکەی ئەدەمێ و (لە ڕاستیدا هیی ئەو نییە) با ئەو کەسە هچی لێوەرنەگرێ، چونکە بەشێکی دۆزەخم بۆ دابڕیوە، بەو مانایە ئەگەر کەسێك ـ لە کاتی داوەرییەکەی مندا ـ قسەی ڕەوان و بەڵگەی پتەو وبەهێزی ئەبەست بەیەکەوە تا سەرئەنجام منیش بەپێی قسەکەی ئەو حوکمم بۆ دا، جائەگەر دادوەرێك مافێکی ناڕەوای بۆ دەستخستین، ئەوە با نزیکیی نەکەوینەوە، چونکە حوکمی حاکم حەرام حەڵاڵ ناکات، وەسامانی هیچ کەسێك ناکا بەهی کەسێکی تربەشێوەی شەرعی .

بێجگە لەمانەیش دەستەی زانایان ئەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم کەس بووە "دادوەر"ی داناوە بۆ چاودێریکردنی موسڵمانان و بڕینەوەی کێشەی نێوانیان... هەر لەسەردەمی خۆیدا کۆمەڵێکی دەست نیشان کرد، وەك "عومەر کوڕی خەتتاب" و"ئیمامی علی" کە "عەلی نارد بۆ "یەمەن" لەکاتێکدا هێشتاهەر لاو بوو. جاپێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: "هەرکات دوو خاوەن کێشە هاتن بۆ لات بڕیاریان بۆ نەدەیت تاقسەی ئەولاکەی تریشان نەبیستی، ئەمە پتر ئەبێتە هۆی ڕۆشن بوو نەوەی بڕیارەکەت.

---

2) الاسلام واوضاعنا السياسية ،ل187 وە کتێبی : (( نظرية الاسلام السياسية ،ل57 ، وە کتێبی(( الدولة القانونية والنظام السياسى الاسلامى))، ل422 .

3) سوورەی الحديد / 25 .

[3] النساء / 65 .

2) صحيح مسلم .. وە لە بوخاریشداهاتووە لەگەڵ هەندێ جیاوازییدا. بڕوانە: ارشاد السارى، ل240، ب10 .

[5] ئەم فەرموودەیە ئەوەی لێوەرئەگیرێ کە پێغەمبەر (ﷺ) کارو بارە نهێنیەکانی نەزانیوە، سامەگەر خوائاگاداری کردبێت، بۆیە پێویستی بە گەواهی و شایەت هەیە بۆ ڕوون بونەوەی داوای دواکەر. وە ئەمەیش تیایە کە حوکمی (حاکم) تەنها لەڕووی ڕەواڵەتەوە (منقن) و پیادە کراوە ... بەلأم (باطنا) وە لەڕووی نهێنیەوەلەقیامەتا بەر پرسیارە .

"موعاذ"یش یەكێك بوو لە (قاضی)یەكانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبوو ناردی بۆ "یەمەن" تابێ بە "قاضی" و فێركەریان[1].

ئینجا دوای ئەویش جێ نشینی یەكەم "ئەبوبەكر (خوا لێ ڕازی بێت) "دادوەری سپارد بە "عومەر كوڕی خەتتاب" دوو ساڵ مایەوە هیچ كەسێك نەهات بۆ لای "سەبارەت بە یەكخستنی كێشە و ناكۆكیان" [2]. كە سەردەمی خیلافەتی "عومەر" یش هات، ئەوەبوو وڵات و ناوچە زۆر بوو ناچار چەند كەسێكی دیاریكرد بۆ دادوەریی، واتە "ویلایەت" و "قەضاوەت" ی جیا كردەوە.

ئیمامی عومەر نووسراوێكی نووسی بۆ "ئەبوموسای ئەشعەری" تیایدا جۆرو شێوەی دادوەریی ڕۆشن كردۆتەوە.. كە بەڕاستیی نموونەی لێهاتوویی و زانیاری ئەو دەست نیشان ئەكات.

لەسەردەمی "ئەبوو جەعفەری مەنصوور"یشدا "قاضی القضاة = دادوەریی دادوەران" دامەزراو ئیتر ئەو سەرپەرشتی هێزی دادوەریی ئەكرد، وە دانان و لابردنی "قاضی"ی بەدەست ئەو بوو.

## دادوەر چاودێری هەموو دەزگاكانی تایبەت بەخۆی ئەكات:

"قاضی" ی كە دیاریكرا لەلایەن "ئولی ئەمرەوە" تەواوی دەسەڵاتی دایەو بەپێی هەموو شوێنێك جووڵایەوە، ئەوە پێی ئەڵێن "عام الولایە والنظر" چونكە ڕێئەكەوێ داوا لەسەركراو تەنها كەسێك بێت، وە یان دەزگایەك بێت.

دەستەی زاناكانیش بەلایانەوە هیچ جیاوازی نییە لەوەدا داوا لەسەر كراوەكە تاك بێت، یان "والی" و سەرەك دەوڵەتێك بێت... چونكە بەلایانەوە پێویستە لەسەر (دادوەر) هەمووستەمی ستەم لێكراوێك ڕۆشن بكاتەوە و بڕیاری بۆ دەربكا، ئیتر هیچ جیاوازی نییە لەمەدا ـ وەك وتمان ـ ئاخۆ ستەمكارەكە تاك بێت، وەیا دەزگا بێت.

واتە هەر ئیشێك دەزگاپێی هەڵئەسێ ئەگەر دەستدرێژی تیدا بەدی ئەكراو ئەبوو بەهۆی پێشێل كردنی مافی كۆمەڵ وەیا مافی تاك ئەوە بەخێرایی ئەبێ "قاضی" دەستی بۆ ببات و نەهێڵێ.

تاك لەدیدی ئیسلامدا ـ ئیتر كرێكار بێت، یان جوتیار، هەژار بێت یان دەوڵەمەند ـ بۆی هەیە داوای خۆی بەرز بكاتەوە بۆ لای "قاضی"، "قاضی" یش ئەبێ بەشێوەیەكی زۆر پڕ لە دادگەری دادوەری بكات.... وە ئەگەر "دادگایی" ی سەرەك دەوڵەت كەوتە لای پێویستە وەك هەر هاووڵاتییەك لەگەڵیدا ڕەفتار بكات، چ بەقازانج، چ بەزیان. سەرەك بۆی نییە خۆی فافی خۆی وەربگرێ ئەگەر كەوتە لای كەسێك، بەڵكو ئەبێ دادگا بیبڕێتەوە بۆی.

ماوەردی ئەفەرمووێ: "قاضی ئەبێ بەیەكسانی بجوڵێتەوە لەنیوان ئەوانەدا دێنە لای بۆ بڕینەوەی كێشەیان لە: چوونە ژوورەوەو دانیشتن و هەڵساندا، لەنێوان ناودارو بێ ناودا، ئازادو بەندا، موسڵمان و نا موسڵماندا... تەنانەت ئەبێ وەك یەك تەماشایان بكات".. (ماوەردی) بەڵگە بۆ ئەم قسەیە دێنێتەوە بەمەكە: عومەری كوڕی خەتاب و ئوبەی كوڕی كەعب ڕۆژێكیان ـ دادگاییان بوو ـ چوون بۆلای "زەیدی كوڕی ثابت" بۆ ماڵەوە... زەید ڕایەخێكی هێنا بۆ ئەوەی عومەر لەسەری دانیشێ... عومەر وتی: ئەمە یەكەم ستەمت بوو هەر لەئێستاوە، ئەبێ وەك یەك سەیرمان بكەیت لەدانیشتندا، ئینجا هەردووكیان ـ عومەر و ئوبەی ـ لەبەردەم قاضی دا دانیشتن"[1]

---

[1] لە خەلیفەكانیشدا یەكەم كەسێك (قاضی) ی دانا عومەری كوڕی خەتتاب بوو، ئەویش بەم شێوەیە: ئەبوو دەردای كرد بە قاضی (مەدینە) ئەبوو موسا هیی (كوفە) شورەع بۆ (بەحرە) ... ئەمەیشی كرد تاتۆزێ كارە ڕامیارییەكان ڕامیاری لەسەر شانی سووك بێن، چونكە ئەوەندە بەزەیی و سۆزو برایەتی و یارمەتی و دەروون پاكی و بێ تەمەعی بلاّو بوو بوویەوە لەنیوانیاندا هیچ كەسێك نەدەچوو بەگژ كەسدا، وە كەس ماڵی كەسی داگیر نە ئەكرد تابڕۆن سكالاّی یەكتر بكەن

[2] ) د. حسن ابراهیم ، تأریخ الاسلام السیاسی ل526 ب1 .

1 ) ئیبن خەلدون : المقدمة، ل 225 . الماوردی : الأحكام السلطانیة، ل 67 .

بەڵێ ئەم پێشەوایە جێگەی خۆیەتی ئەوەندە هەق ڕەوبێت، چونکە لەهەموو دادگەرەکان بەدادتر بووە، بۆیە سەبارەت بەدادوەری نوسراوێکی ئاراستەی ئەبوو موسای ئەشعەری کرد، وەبلاوی کردەوە بەناوچەو وڵاتدا تیدا گەلێك ڕاستی و واقیعی خستە پێش چاو، جابۆ ئەوەی خوێنەر پتر لەلای ڕۆشن بێت دەقەکەی ئەهێنین: "دوای سوپاس و ستایشی بێ پایان، دادوەریی فەرزێکی سابت و نەگۆڕاوە، وەڕێگەو ڕچەیەکی پەیڕەوی کراوە، جا هەرکات ڕووداو هێنرایە لات بەجوانی لێی تێبگەو بڕیاری بۆ بدەو پیادەی بکە، چەنکە وتەی هەق ئەگەر پیادە نەکرێ هیچ کەڵکێکی نییە. مرۆڤەکان وەك یەك تەماشا بکە لە ڕووتدا لەکۆڕی دانیشتنتداو لە دادگاییکردنیدا تا ناودارێك بەتەمای ئەوە نەبێت بەستەم حوکمەکەی بۆ پیادە بکرێ... وە تابێ دەسەڵاتێك بێ ئومێد نەبێت لە دادگەریەکەت. شایەت لەسەر داواکەرە. سوێندیش لەسەر نکوڵی کەر. صولح و ڕێکەوتن ـ لەنێوان موسڵماندا ـ ڕەواو دروستە، ڕێکەوتنێك نەبێت حەرامێك حەڵاڵ بکات، وەیا حەڵاڵێك یاساغ بکات.

ئەگەر دوێنێ حوکمێکت دابوو ئیمرۆ بیرت لێکردەوەو بارە هەقەکەت دۆزییەوە، ئەوە بێ چەندو چوون دەست لەو حوکمە کۆنە هەڵبگرەو ڕەفتار بەپێی تازەکە بکە، چونکە "هەق" کۆنەو هەربووە، پیاچونەوەی هەق و ڕاستی زۆر زۆر باشترە لەدرێژەوان بەناهەقی.

ئەوی دێت بەدڵتدا و لەقووڕئان و فەرموودەیشدا نییە بە باشی لێی تێبگەو نموونەی هاوچەشن و چوونیەکی وەك ئەو بدۆزەرەوە "قیاس" ی بکەرە سەرهاو وێنەی خۆی، هەرکەسێك داوای مافێکی نادیاری کرد، وەیا داوای شایەتی کرد ماوەیەکیان بۆ دیاری بکە کە بەپێی ژیری بیگاتێ..."[1]

داوەری بۆ ئەوەیە نەهێڵرێ هیچ کەسێك ـ ئەندامێکی کۆمەڵە یان دەزگا ـ ستەم بکات، وەیا ستەمی لێبکرێ.

دادوەری لەئیسلامدا دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کە هەرکات سەرەك دەوڵەت سەرپێچی دادگای خوای گەورە بکات، وەك تاکێك لە کۆمەڵەکە دادگایی بکات.

### دادوەری ئەبێ بە پێی بەرنامەی خوا بێت

(قاضی) ئەبێ بەپێی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر و "ئیجماع" ڕەفتار بکات و حوکم بدات، جائەگەر ڕووداوێك پەیدا بوو و حوکمەکەی لە قورئان و فەرموودەوە.... دەست نەکەوت ئەوە "ئیجتیهاد" ئەکات و بڕیاری بۆ ئەدات.

جا بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بۆی نەبێت دەم بکوتێتە ئەم باسەوە، بۆ ئەوەی هەر نائەهلێك هەڵنەسێو دەست بکات بەدادگایی خەڵکی وخۆی ناوبنێ "قاضی".. ! وەك لەم ڕۆژە ڕەشانەدا پێش چاوئەکەوێت ... هەرعەوام ونەخوێندەوارە خۆی کردووە بە (قاضی) ناوچەو وڵات، ئەکاتە سەر خەڵکی بۆ پارەو پووڵ، بڕیار ئەدات: فلان ئەوەندەی لێ بسێنرێ فڵانیش بکوژرێ، یا لەسێدارە بدرێ...! !! بۆ ئەوەی هەق و ناهەق "قاضی" پەسەند کراوی ئیسلام جیا بکرێتەوە لە "قاضی" ناپەسەندو نائەهل، دەستەی زانایانی ئیسلام کۆمەڵێك مەرجیان بۆ دەست نیشان کردووە:

مەرجی دادوەری سەر ڕاست:

1 ـ بالغ بوون: کەوا بوو ڕەوا نییە منداڵ بکرێ بە "قاضی" وە ئەگەر کرایش هەر حوکمێ بدات ناڕەوایە و دانامەزرێ، چونکە "قەضاوەت" و دادوەری لە "کاروباری" "ویلایەت" وسەرپەرشتی کردنی کۆمەڵگەیە، منالیش بۆی نیە دەست بخاتە ئیشی خۆیەوە کەوا بوو باشتر ناتوانێت دەستکاری ئیشی خەڵك بکات.

پێغەمبەر (ﷺ) عەتتابی کوڕی ئوسەیدی کرد بە (والی) مەککە لە تەمەنی بیست و ئەوەندە ساڵی دا.. دیارە ئیشی (والی) یش دادوەریی کردنە لە نێوان خەڵکیدا.

2ـ ژیریی: کەوا بوو شێت و هەرکەسێکی تریش کە عەقڵی نا تەواو بێت ناکرێ بە "قاضی" و دادوەر بۆ بینین و بڕینەوەی کێشەی موسڵمانان. بێجگە لەمەیش "ماوەردی" ئەڵێت: تەنها "عەقڵ" بەس نییە بۆ دادوەر، بەڵکو ئەبێ

1 ) ئیبن خەلدون : المقدمة ، ل 225 . الماوردی : الاحکام السلطانیة ، ل 68 .

هەستێكی وایشی ببێت بتوانێ بەباشی شت لێكبداتەوە، وە ئەبێ زیرەك و وریایش بێت و دووریش بێت لە "سەهوو غەفڵەت".

ئەم دوو مەرجەی وتمان دەستەی جەماوەری زانایانی لەسەرە، بەڵام ئەوانی تریان زانایان ڕای جیاجیان لەسەر هەیە.

3 ـ موسڵمان بێت: ئەم دادوەرییە ئەگەر لەنێوان موسڵماناندا بێت ئەوە ئەبێت ئەو "قاضی" یە موسڵمان بێت، خوا ئەفەرموێ: (وَلَن يَجْعَلَ اللّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً).[1] خوا دەسەڵاتی نەداوە بەكافرەكان بەسەر موسڵمانەكاندا بە هیچ شێوەیەك، ئاشكرایشە دادوەریی یەكێكە لەوكارو دەسەڵاتانەی كەنابێ بدرێتە دەست كافر، خۆ ئەگەر دادوەریی بێت لە نێوان ناموسڵماندا ئەوە دەستەی زاناكان ـ بێجگە لە حەنەفیەكان ـ ئەم مەرجەی پێشەوە پێش چاو ئەگرن، واتە ئەڵێن قاضي ناموسڵمان هەر نابێت ئیتر دانیشتووەكان و حوكم بۆ كراوەكان موسڵمان بن یا نەء؟!.

حەنەفیەكان بەلایانەوە دروستە ناموسڵمان بكرێ بە "قاضي" با دروستیش نەبێت حوكمەكەی بۆ موسڵمان تا لەسەر ئایینی خۆی بێت.

مەبەستی حەنەفیەكان ئەوەیە كە: لەسەرتاوە قاضي با موسڵمانیش نەبێت دروستە دابنرێ، جا ئەگەر دوای ئەوە كە دانرا بڕوای هێناو موسڵمان بوو، ئەوە سەرلەنوێ دانانرێتەوە بەڵكو پێشووەكەی ئیعتبار ئەكرێ و لەسەری ئەڕوا.

دەستەی زاناكان هەموویان یەك دەنگن لەوەدا كە "ئەهلی ذیمة" لەسەریان نییە ملكەچی دادوەریی ئیسلامی بن بەزۆر.. بەڵكو ئەگەر خۆیان ـ بە ئارەزووی خۆیان ـ داوایان هێنا بۆ لای، ئەوە ئەمیش ئارەزووی خۆیەتی بۆی هەیە تەماشای داواكەیان بكاو بۆیشی هەیە دەستی لێ هەڵبگرێ.

لێرەدا شتێك ماوە و پێویستە بزانرێ ئەویش ئەمەیە: ئایا دروستە ناموسڵمان شایەتی و گەواهی بدات بۆ موسڵمان...؟.

كۆمەڵێك لە زانایان لەسەر ئەوەن كە دروستە لە "سەفەر" دا گەواهی بۆ بدات لەسەر "وەصیەتە" كەی، بەڵگەیشیان ئایەتی: (يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ). هەروەها ریوایەت كراوە لە "عەبدوڵلای كوڕی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل" وە كە دروستە لە میراتیشدا ناموسڵمان شایەتی بدات بۆ موسڵمان بە "قیاس" لەسەر "سەفەر".

لەئیمامی "مالیك" یشەوە ئەگێڕنەوە كە دروستە دوو پزیشكی ناموسڵمان شایەتی بدەن لەسەر موسڵمان ئەگەر موسڵمان دەست نەكەوێت.

بەكورتی: ئەم باسە جۆرە درێژە پێدانێكی هەیە لەناو زاناكاندا.. دكتۆر "عبدالخالق نەداوی" ئەڵێت: گەواهی ناموسڵمان لەسەر موسڵمان تەنیا لەكاتی ناچارییدایە.

4ـ نێرینە بێت: زاناكان لەمەدا یەك قسە نین و هەرەیەكەیان بۆچوونێكی هەیە:

**أ ـ ڕای ئیمامی شافیعی ومالیكی و حەنبەلییەكان:**

ئەمانە بەلایانەوە وایە قاضي ئەبێ نێرینە بێت، نەك ئافرەت، ئەوكاتە دروستە دابنرێ و هەر حوكمێكیش بدات دا ئەمەزرێ، واتە بە هیچ شێوەیەك نابێ ئافرەت ئەم كارەی بدرێتێ، ئەگەر پێیشی درا ئەوە ناڕەوایە، بەڵگەیشیان:

یەكەم: ئەم ئایەتەی سوورەی (النساء)یە، (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء..)

خوا سەرپەرشتی و چاودێری كردنی ئافرەتی سپاردووە بە "پیاو" لەهەموو ڕوویەكەوە. "قورطبی" ئەفەرموێ: لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: حاكم و ئەمیر و سەرەك دەوڵەت وئەمیری جیهاد لە پیاودا ئەبێت نەك لە ئافرەتدا، چونكە پیاوان سەلیقەی تەكبیرو ڕاوێژو ژیرییان پتر ترە لە ئافرەتان... لەگەڵ هەندێ سیفەتی تردا كە زانیاریی تازەیش دانی پیادا ناوە [2].

---

[1] (النساء : 141 )

[2] ) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە كتێبی (سەربەستیی لەئیسلامدا) .

جا لەبەر ئەم سیفەتانەیە خوای گەورە "قەوامە" ئەداتە دەست پیاو، ئەم قەوامەیشە سیفەتی گشتیەو فراوانە وەك: سەرەك دەوڵەتی و، دادوەریی و، چاودێری كاروباری جەنگ و فەرماندەی سوپا بە پیاو ئەسپێرێ، نەك بە ئافرەت.

دووەم: ئەم فەرموودەیە "لن يفلح قوم ولوا امرهم امرأة" كە ئیمامی بوخاری وئیمامی ئەحەمەدو ئیمامی تیرمیذی هێناویانە كە: كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بیستی فارسەكان كچەكەی "كیسرا"یان كردووە بە پاشای خۆیان، ئەم فەرموودەیە فەرمووو دای بە گوێی جیهاندا كە هەرگەلێك كاروباری خۆیان بسپێرن بە ئافرەت بە هیچ شێوەیەك بەختیارو سەرفراز نابن، دیارە مەبەست بەو "ئەمرە" كە پێغەمبەر ئەیفەرموێ: كاروباری گشتییە، نەك كاری تاكی و"فەردی" ی .

سێهەم: ئیجتماعی دەستەی زانایانە.

بەڵێ زانایان و موجتەهیدەكان ئیجماعیان لەسەر ئەوەیە كە دروست نییە ئافرەت بكرێ بە "قاضي"ی، بەڵگەیشیان قورئان و فەرموودەیە. وە موسڵمانەكان بە درێژایی رۆژگار ـ لە چەرخی پێغەمبەر و خەلیفەكاندا ـ والی و ئەمیر و فەرماندەی سوپاو (قاضی) یان لە شارەكان داناوە، وە كۆڕی ئەنجوومەنی راوێژیان بەستووە هەر هەمووی لە پیاوان بووە، لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێ كار بووە هەردووكیانی (پیاو ئافرەت) گرتۆتەوە. ئەگەر پێویست بوایە ئافرەتیش بەشداری ئەكرد.

ئەنجوومەنی راوێژ لە "سەقیفە"دا بەشدار بۆ دانانی خەلیفە و دیاریكردنی نەخشەی داهاتووی موسڵمانەكان لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) وە ئیمامی ئەبوو بەكر راوێژی كرد بە موسڵمانان دوای خۆی كێ بكەن بە خەلیفە، ئیمامی "عومەر" كۆڕێكی بەست بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە دوای خۆی، ئەمانە و چەندەها رووداوی تریش لە ژیانیاندا روویداوە... تا ئێستا هیچ كەسێك باسی نەكردووە كە تەنها ئافرەتێك ئامادەی ئەو كۆڕانە بووبێ و هاوبەشی كردبێ. لەگەڵ ئەوەیشدا چەندەها ئافرەتی داناو زانا وشارەزا لە كاروباردا هەبووە.

چوارەم: كردنی ئافرەت بە (قاضي) چەندەها شتی ناهەموارای لێ پەیدا ئەبێت بۆ ناو كۆمەڵی موسڵمانان، چونكە رێئەكەوێت لەگەڵ بێگانە و مەحرەم و نامەحرەمدا، دائەنیشێ و ئەڕواو دێت و.. هتد ئەمەیش توشی هەڵوێستی گوماناوی ئەكات..

بێجگە لە مانەیش ئیشی "قاضي" پێویستە هەموو رۆژێك پیادە بكرێن بۆ ئەوەی ئیشێكی زۆر كۆنەبێتەوە لەسەری و لە دواییدا بۆی جێبەجێ نەكرێ... دەی ئەگەر "قاضي" یەكە ئافرەت بێت بێگومان كە تووشی "حەیزو دوگیان بوون و منالْ بوون و...)) ئەبێت دیارە لەو سەردەمانەدا ناتوانێ دەوام بكات،و كارەكانی ئەو پەكیان ئەكەوێت.

**ب ـ رای حەنەفیەكان:**

حەنەفیەكان ئەڵێن: بەمەرج نەگیراوە قاضي نێرینە بێ، با بەپێی شەریعەتیش یاساغ بێت دانانی ئافرەت بە دادوەر... بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هەركات دانرا بە دادوەر ئەوە كارەكەی دائەمەزرێ و هەر حوكمێكیش بدات بەڕەوا دائەنرێ و پیادەیش ئەكرێ تەنها لە "حدودو قصاص" دانەبێت، ئەوە پێویستە هەر پیاو بێت وحوكمی ئافرەت نابێت.

ج ـ رای "ظاهر"یەكان:

ئەمانیش ئەڵێن : دروستە ئافرەت بە دادوەر دابنرێ فەرمانی داوەریی بدرێتێ، بێ ئەوەی هیچ گوناهێك رووبكاتە ئەوەی دای ئەنێت و هەر بڕیارێكیش دەربكات پیادە ئەكرێ ئەمانەیش بەلگەكانیانن:

یەكەم: ئافرەت هەر بەمە صیفەتی "مێینی"یەتی تێدایە بەرگری ناكرێ لە "قەضاوەتی" چونكە صیفەتی "مێینەیی"ەكەی بەرگری ئەوەی ناكات كە بەرێكوپێكی و بە وردی لە قسەی ئەمو ئەو تێبگاو كێشەی نێوانیان ببڕێتەوە بە شێوەیەكی ئیسلامیی [1] .

[1] ) دەستەی زانایانی تر ئەم بەڵگەیە بەوە رەت ئەكەنەوە كە مله ملێی ناوێ ئەمە كە: ئافرەت هەندێ صیفەتی تێدایە ئەبنە كۆسپ بۆی لە پیادەكردنی كاروباری شەرعدا، وەك دڵ نەرمی و ، دڵ گەرمی و ، زوو تێكچوون و هەڵچوونی لە بەردەم كاری نەهاتدا ....

دووەم: زانایان هەموو یەك قسەن لەوەدا كە: دروستە ئافرەت "فەتوا" بدات. كەوا بوو بۆیشی هەیە ببێ بە قاضی لەناو خەڵكیدا [1].

سێهەم: عومەری كوڕی خەتتاب "شیفای كچی عەبدوڵڵای" كرد بە "بەرپرس" بەسەر دارایی وساماندا، ئاشكرایشە "ویلایەتی حیسبی"ی وەكو "ویلایەتی" دادوەریی وایە [2].

چوارەم: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ "والمراة راعیة فی مال زوجها وهی مسؤولة عن رعیتها"، ئافرەت شوان وچاودێریكەری ماڵی مێردەكەیەتی، وە بەرپرسیاریشە لەوەی لەژێر دەستیدایە.دەی كە "ویلایەت" ی درایە لە ماڵی مێردەكەیدا، كەوابوو لە ئەهلی ویلایەتە و سەئەنجامیش فەرمانی داوەریشی ئەدرێتێ [3].

5ـ هەستەكانی ساغ بن "سلامة الحواس":

بەڵێ بۆ ئەوەی "قاضی" پتر بڕواتە ناو كۆمەڵەوە و بتوانێ هەڵسێ بە پیادەكردنی كاروباری ناوچەو وڵات بەمەرج گیراوە زمان و گوێی و چاوی ساغ بن، وە دوور بێ لە لاڵی و كەرپی و كوێریی.

زانایان بۆ ئەوەی "قاضی" گۆیا (ناطق) بێت هەموویان یەك دەنگن و جیاواز بیان نییە تێیدا، چونكە هەمووكەس لە ئاماژە "إشارة" تێناگات، جا لەبەر ئەوە پێویستە گۆیا بێت.

بەڵام بۆ ئەوەی "بینا" بێت زاناكان یەك دەنگ نین، بەڵكو جەماوەریان لەسەر ئەوەن كە پێویستە كوێر نەبێت و ئەبێ بینابێت تا بتوانێ بە تەواوەتی هەڵسێ بە پێداویستی یەكانی خەڵك.. هەرچەندە لە پێشەوا مالیكەوە و لە هەندێ شافیعییەكانەوە گێڕراوەتەوە كە: دروستە كوێر بكرێ بە قاضیی، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) عەبدوڵڵای كوڕی مەكتوومی كرد بە "والی" مەدینە و كوێریش بوو.

بەڵام "حەنەفیە" كان بەمەرجییان نەگرتووە ـ بۆ ئەوەی قاضی دابنرێ ـ ئەبێت (بینا) بێت. ئینجا بۆ ئەوەی "بیسندە" بێت ـ دیسانەوە ـ بەمەرج گیراوە، چونكە قاضیی ئەبێ وتەی داواكەرو داوا لێكراو ببیسێ ئەو كاتە ئەتوانێ بڕیاریان بۆ بدات... هەرچەندە حەنەفیەكان ئەڵێن: ئەگەر تەنها دەنگیبەرزی ئەبیست ئەوە دروستە و ڕەوایە بكرێ بە قاضیی، ئەگینا نەء.

ئەمە سەبارەت بە هەستەكانی، سەبارەت بە ئەندامەكانی تری ـ وەك دەست و قاچی و... ـ بەمەرج نەگیراوە تێرو تەواو بن، بەڵكو دروستە قاضییەكی دەست پەڕیو حوكم بدات و حوكمەكەیش پیادە بكرێ. بەڵام دیارە ئەگەر هەموو ئەندامەكانی ڕێك و پێك بن ئەوە چاكترە، چونكە پتر ئەتوانێ هەڵسێ بە ئیشەكەی و "هەیبەت" یشی زیاترە.

6ـ داد گەر بێت:

واتە گوناهی گەورەی نەبێت و خۆیشی بپارێزێ لە گوناهی بچووك، وە خاوەن سپاردە بێت و ڕەفتاری جوان و ڕێك پێك بێت.

ئەمە مانای "عەدالەت"ە... هەرچەندە زاناكان یەك قسە نین لەم باسەدا، چونكە تەنها شافیعییە كان و حەنابیلە كان و مالیكییەكان "عەدالەت" یان بەمەرج گرتووە، واتە دادوەریی "فاسق" دروست نییە.

---

[1] ) جەماوەری زاناكان ئەڵێن: دادوەریی حوكمەكەی ئەبێ پیادە بكرێ بێ چەندو چوون ، بۆیە لە ( ویلایەت ) دانراوە ، ئاشكرایشە ئافرەت ویلایەتی بۆ نییە . بەڵام (فەتوا) پێویست نییە لەسەر پرسیار كەرەكە بەگوێرەی حوكمی (( موفتی ))یەكە ڕەفتار بكات .

[2] ) ئەمیشیان وا ڕەت داوەتەوە كە بەڵگەیەكی ڕاست وڕەوان نییە بۆ ئەوەی ئیمامی عومەر ولی كردبێت ، چونكە مێژوونووسەكان جیاوازییان هەیە .

[3] ) وەڵامی ئەم خاڵەیش بەم جۆرەیە : ئەو (ویلایەت)ەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی دیاری كردووە ویلایەتی تایبەتییە و پەوەندی تەنها بە ماڵەوە هەیە ، دەی هیچ كەسێكیش لەمەدا ڕای جیاوازی نییە ... كەوابوو مافی (ویلایەتی خاصە) مافی (ویلایەتی عامة) پێویست ناكات بۆی .

بەڵام حەنەفیەکان بەلایانەوە (عەدالەت" مەرج نییە بۆ دانانی "قاضیی" و پیادەکردنی فەرمانەکانی، بەڵکو دروستە "فاسق" بکریٚ بە قاضیی و هەر حوکمێکیش بدات پیادە ئەکریٚ. بناغەی ئەم جیاوازییانە ئەمەیە: بەلای حەنەفییەکانەوە شایەتی "فاسق" وەرئەگیریٚ کەوابوو بڕیارەکانیشی پیادە ئەکرێن... بەڵام بەلای مەزهەبەکانی ترەوە شایەتی فاسق وەرناگیریٚ و دروست نییە، کەوابوو "قەضاوەت" یشی دروست نییە.

7ـ خاوەن ئیجتهاد بێت:

زاناکان زۆر گرنگیان داوە بەم خاڵی حەوتەمە، وە ئەڵێن کاتیٚ دروستە "قاضیی" دابنریٚ کە ئاگاداری قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر بێت، وە ئەبیٚ شارەزایی ئیجماع و قیاس بێت.

شافیعییەکان و حەنابیلەکان و مالیکییەکان و حەنەفییەکانیش ـ هەندێکیان ـ ئەڵێن کاتیٚ دروستە قاضیی دابنریٚ کە خاوەن "ئیجتهاد" بێت [1]. کەوابوو شوێنکەوتن و "تەقلید" ی ناموجتەهید دروست نی یە و بڕیارەکانی پیادە ناکریٚ.

جەماوەری حەنەفیەکان، وە لەوتەی ڕاستیی مالیکییەکاندا هاتووە کە ئیجتهاد مەرج نییە بۆ دانانی قاضیی و پیادەکرنی بڕیارەکانی، بەڵکو ـ ئەڵێن ـ مەرجی "کەماڵە" واتە باش وایە قاضی "موجتەهید" بێت، خۆ ئەگەر خاوەن ئیجتهادیش نەبێت هەر دروستە و ڕەوایە دابنریٚ و بکریٚ بە قاضي، بەلای ئەمانەوە دروستە شوێنکەوتنی دادوەری ناموجتەهیدو بڕیارەکانیشی پەسەندن بەو مەرجە دژ بە قورئان نەبێت.

بەڵگەی ئەوانەی ئەڵێن: قاضي ئەبیٚ موجتەهید بێت

یەکەم: ئایەتی (فَإِن تَنَازَعْتُم فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ)، [2] ئایەتی: (وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ..) [3]. لەئایەتی یەکەمدا داوا ئەکات کە هەرکات کێشە دروست بوو ئەبیٚ بگەڕێنرێتەوە بۆ لای قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کەوا بوو قاضی ئەبیٚ موجتەهید بێت.

دووەم: پێغەمبەر "مەعاز"ی نارد بۆ "یەمەن" و کردی بە "والی" ی ئەویٚ فەرمووی: "مەعاز" بەچی حوکم ئەکەیت؟ وتی: بە قورئان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی ئەگەر ئایەت نەبوو و حوکمەکەت بۆ ڕۆشن نەبوویەوە؟ مەعاز وتی: دوای ڕای خۆم ئەکەوم و هەوڵێکی زۆر ئەدەم تاحوکمەکەم بۆ دەرکەویٚ ئەوجا بەڕای خۆم بڕیاری بۆ ئەدەم و پیادەی ئەکەم... پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "الحمد الله الذی وفق رسول الله لما یرضی الله ورسوله". کەوابوو قاضی ئەبیٚ موجتەهید بێت.

ڕاکەی تر ئەڵێت: ئاشکرایە کە چاك وایە قاضی موجتەهید بێت، بەڵام ئەی ئەگەر موجتەهیدێکی (عادل) نەبوو؟ ئایا داوەریی و "ئەحکام" پەك ئەخریٚ و ماتڵ ئەکریٚ؟ ئاشکرایە ئەم بەرنامەی ئیسلامە بۆ ئادەمیزاد هاتووە، وە ڕوونیشە کە ئەم مەرجانە ـ عەدالەت و ئیجتهاد ـ زۆر بەزەحمەت دەست ئەکەون لەم چەرخی ئێمەدا چونکە ئەوەتە دیارەو لە پێش چاوەوەیە کە موجتەهید دەست ناکەویٚ. کەوابوو چار هەر ئەوەیە هەر کەسێك دەوڵەت داینیٚ و بیکا بە قاضیی حوکمەکەی پیادە ئەکریٚ با فاسقیش بێت.

بۆیە زۆربەی زاناکانی ئەم سەردەمە ڕایان وایە کە دروستە تەقلیدو دوای قاضیی ناموجتەهید بکەوین [4].

**قاضي موجتەهیدو قاضي ناموجتەهید:**

---

[1] ) بڕوانە ( ارشاد الساری ) ، ( ب10 ل240 ) سەبارەت بە مەرجەکانی ( قاضیی ) .

[2] (النساء : 59 )

[3] لنساء : 83 )

[4] ) شافیعییەکانیش هەروا ئەڵێن ،واتە کە قاضیی شەرعی نەبوو لەبەر ناچاری حوکمی قاضیی ناشەرعی پیاد ئەکریٚ .

له پێشەوە وتمان لە بەرنامەی ئیسلامدا تا بگونجێ قاضیی ئەبێ "موجتەهید" بێت، چونکە یەکێ لەمەرجەکانی ئەوە بوو ئەبێ خاوەن ئیجتهاد بێت، بێجگە لە جەماوەری حەنەفییەکان و مالیکییەکان، ئەوان وتیان دروستە ناموجتەهیدیش بێت، کەولبوو قاضیی دوو جۆرە، یەکەم: موجتەهید. دووەم: موقەللید. واتە شوێنکەوتوو (چاولێکەر).

قاضیی موجتەهید:- وەك وتمان - ئەبێ دوای قورئان و فەرموودە و ئیجماع و قیاس بکەوێ، خۆ ئەگەر حوکمەکەی بۆ ڕۆشن نەبوویەوە ئینجا ئیجتهاد ئەکات و بەپێی ڕای خۆی ئەجوولێتەوە بەو مەرجە پێچەوانەی قورئان و فەرموودە نەبێت..بەلگە بۆ ئەمە زۆرە، ئەوە بوو هەندێکمان باس کردن.

جا ئەگەر دوای هەولێکی زۆر حوکمەکەی بۆ ڕۆشن نەبوویەوە ڕاوێژ بە دەستەی زانایان و ئەهلی ڕەئی بکا... ئەگەر یەککەوتن هەموویان لەسەر حوکمێك ئەوا باشە، خۆ ئەگەر جیاوازییان بوو، دیسانەوە هەولێ تر بدات و بە "ڕایە"کەی خۆی حوکم بکات.

**قاضي ناموجتەهید:**

ئەم جۆرە قاضیانە پێویستە بە گوێرەی مەزەبی پێشەواکەی خۆی حوکم بکات، واتە نابێ بە هیچ شێوەیەك لێی لابدات، وەك "ئیبنی عابدین" ئەڵێت: "يشترط لصحة القضاء ان يكون موافقا لرأية - أي لمذهبه - مجتهدا كان او مقلدا، فلو قضى بخلافه فلا ينفذ". بێجگە لەمەیش پێویستە هەموو کات فەتوا بە "صەحیح" ی مەزەبی ئیمامەکەی بدات خۆ ئەگەر فەتوای بەوتەی لاواز دا ئەوە دانامەزرێ[1].

بەکورتیی:

دادوەریی کارێکی زۆر قورسە، چونکە زۆر جار لەلایەن کاربەدەستە ستەمکارەکانەوە چەندان بڕیاری ناهەق و نادروست ئەدەن بە "دادوەر = قاضي" کان، بۆیە پیاوە گەورە و"فەقیهە" کان ڕایان کردووە لێی و نەیان کردووە.

أ ئەبوو حەنیفە سێ جار بانگیان کرد بۆ دادوەریی، هەر سێ جارەکە داواکەی دایە دواوە، تەنانەت هەرجارەی سێ داریان لێ ئەدا.

ب - حەیاتی کوڕی شورەیح: بانگ کرا بێ بە "قاضی" میصر، ئەمیش نەیکرد، ئینجا "ئەمیر" وتی: ئەو "شیر" مم بۆ بێنن !! کاتێ شورەیح ئەمەی بینی، دەستی کرد بە گیرفانیاو کلیلێکی دەرهێناو دایە دەست ئەمیر و وتی: ئەوە کلیلی ماڵەکەمە و منیش ئەڕۆم بۆ خزمەتی پەروەردگاری خۆم". کە ئەمیر زانی زۆر سوورە لەسەر نەکردنەکەی وازی لێ هێنا.

ج - ئەبوو خوزەیمە: ئەمیر داوای لێ کرد بۆ دادوەریی، نەیکرد، ئەویش بەیاسای خۆی شمشێرەکەی بۆ کێشا !! ئیتر لە ناچارییدا بەرگەی نەگرت و کردی بە قاضیی میصر، ئەمانەو چەندان زانای تریش هەڵوێستی هەر وابووە.

بێجگە لەوە کە لەکاربەدەستە ستەمکارەکان ئەترسان کە هەندێ جار ئیشی ناڕەویان پێ بکەن، ئەم فەرموودانەی پێغەمبەریشیان پێش چاو گرتبوو:

1- القضاة ثلاثة: قاض في الجنة، و قاضيان في النار، قاض عمل بالحق في قضائه فهو في الجنة. و قاض علم الحق فجار متعمدا فذلك في النار، و قاض قضى بغير علم واستحيا ان يقول لا اعلم فهو في النار".

2- "من قعد قاضيا بين المسلمين فقد ذبح نفسه بغير سكين".[2]

---

[1] ) بۆ ئەم هێزی دادوەرییە کەڵکم لە کتێبی: "العلاقات الدولية والنظم القضائية في الشريعة الاسلامية" وەرگرتووە . جا ئەوەی ئەیەوێ بە تەواوی ئاگاداری هەموو لایەنەکانی دادوەریی بێت با بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو کتێبە و هەندێ لە کتێبە گەورە فیقهیەکانی تر وەك (المغنى لابن قدامه) و (تحفة)ی ئیبن حەجەر .

[2] رواه الاربعة عن ابى هريرة.

واتە: قاضیە كان سێ جۆرن: یەكێكیان ئە ڕواتە بەهەشت، دوانیش ئە ڕۆنە ناودۆزەخەوە. بە هەشتیەكان ئەوانەن كە لەگەڵ حەقدا ئەجوولێتەوە. دۆزەخیەكانیش: یەكێكیان هەقەكە ئەزانێ و كەچی ڕەفتاری پێ ناكا. ئەوی تریشیان زانیاری نییە لەگەڵ ئەوەیشدا عەیبی لێ دێت بڵێ نازانم ! !.

فەرموودەی دووەمیش ئەفەرمێ: هەركەسێك دانیشێ بۆ داوەریی لە نێوان موسڵماناندا ئەوە بێ "چەقۆ" خۆی سەربڕیووە.

ئەم فەرموودانە هەرچەند هەڕەشەن لە قاضییە خراپەكان، بەڵام زاناكان هەر ئەترسان و كەناریان ئەگرت لە ترسی ڕۆژی دوایی.

هەزار ڕەحمەت لەوزانایانەی ترسی خوای گەورە هەیە لەدڵیاندا لە هەموو كاتێكدا، لەوكاتەدا وا لە "میحراب" ی مزگەوتدا، و، لەو كاتەیشدا لەسەر كورسی حوكمی دانیشتووە.

هەزار ڕەحمەت لەو "قاضییە" كە تەنها لە خوای گەورە ئەترسێ و بەپێی ئەم ئایەتانە ئەجوولێتەوە: (..فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ).[1]

واتە: حوكم و بڕیار بە پێی "هەق و ڕاستی" بدە لە نێوان مرۆڤەكاندا "ئەی قاضیی" نەكەی دوای ئارەزوی خۆت بكەوی و سەرئەنجام لە ڕێگەی خوا بتترازێنێ و گومڕات بكا، بێگومان ئەو كەسانەی ڕێگەی خوا ون ئەكەن سزای توندو سەختیان بۆ هەیە بەهۆی ئەوەوە كە ڕۆژی لێ پرسینەوەیان لە بیر خۆیان بردۆتەوە. (..فَلاَ تَخْشَوُاْ النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ).[2] ئەی قاضییە كان "لەكاتی حوكمەكانتاندا" لە مرۆڤەكان نەترسن "حوكمەكەتان ڕێك بكەن" تەنها لە من بترسن، وە حومكەكەی من مەگۆڕن بە نرخێكی سادەی كەم و كورت "واتە لەكاتی حوكمەكەتاندا دەعوەت و دەعوەت كاری و شت وەرتان نەگێرێ و چەوت مەڕۆن".

حوكم بەپێی بەرنامەكەی خوا بكەن، "چونكە" ئەو كەسەی بەپێی بەرنامەی خوا حوكم نەكات "بەم شێوەیە بڕوای پێ نەبێ، وەیا بڕوای پێی بێ بەڵام لەسەركورسیەكە بە یاسا تازە دەست هەڵبەستەكان بجوولێتەوە" ئەوانە كافرو خوا نەناسن.

## بانگەوازێك بۆ قاضییە كان:

ئەی برا قاضییە كانمان ! بەپێی بەرنامەی خوا بجوولێنەوە، ڕازی نەبن بە بەرنامەی ئەمو ئەو، بە یاسای ئەورووپا، یاسای "خۆر هەڵات و خۆرئاوا" چونكە ئەوانە لەسەر بناغەی بێ خوایی "ئیلحاد" دامەزراون.

ئەگەر هەر ڕێگەتان نەبوو ناچار بوون بەوەی حوكمی پێ بكەن دەستی لێ هەڵگرن، خۆتان مەكەن بە سووتەمەنی دۆزەخ.

ئێوەیش وەك برا پێشووەكانتان بن، با هیچ هێزێك لە خشتەتان نەبات... ئێوە ئەبێ ئازاد بن، سەربۆ هیچ دەسەڵاتێك دانەخەن، ئەمو ئەو لە هەق نەتان ترازێنێ، كاغەزو نووسراوی "زەیدو عەمر" چەواشەتان نەكات هەق وا لەسەر هەموو كەسێكەوە.

ئیبراهیمی كوڕی ئیسحاق "قاضیی" میصر ساڵی "204 ك"، دوو كەس كێشەیان هێنایە لای، سەرئەنجام هەق بوو بە هیی یەكێكیان، دوایی ئەویان هەڵسا پەنای بردە بەر "والی" والیش داوای كرد لە قاضیی حوكمەكەی بووەستێنێ ! ! ئینجا قاضیی "دوای ئەوە كە بینی سەرەك دەوڵەت دەستی كێشاوەتە كارەكەیەوە و داوەریش ئەبێ ئازاد و سەربەست بێت" لە ماڵی خۆی دانیشت و ئەو ڕۆژە دەوامی نەكرد تا بیستی وا "والی" هات بۆلای و داوای لێكرد بڕواتەوە سەر ئیشەكەی.

---

1 (ص : 26)

2 (المائدة : 44)

"قاضیی"یش وتی: ئیتر تا من ماوم ناڕۆمەوە سەر کورسی حوکم، چونکە پاڕانەوە و لاڵەنەوە"شەفاعەت" لە حوکمکدا نییە.

"خەیری کوڕی نوعەیم" ی قاضیی، جارێکیان دادگایی سەربازێکی کرد، لە ئەنجامدا ماوەیەك بەندیخانەی بۆ بڕییەوە... دوای ئەوە "والی" ڕۆیشت لە بەندینخانە هێنایە دەرەوە! ! کە قاضیی ئەمەی بیست لە ماڵەوەی خۆیدا مانی گرت و دەستی لە ئیشەکەی هەڵگرت، ئینجا "والی" داوای لێکرد بگەڕێتەوە سەر ئیشەکەی خۆی.

"قاضیی" یش وەك پیاوو مەردی موسڵمانی تێگەیشتوو لە ئیسلام وتی: "تا ئەو سەربازە نەگەڕێتەوە جێگاکەی خۆی ناچمەوە سەر ئیشی خۆم".

لە ڕاستیدا قاضیی ئاوایە، هەق ڕەوە، ئەبێ بە "تەلەفون و تەلەفون کاری" فریو نەدرێ.

**ئەی قاضییەکان**

حوکمەکەتان بە ڕەوان بدەن، لە هیچ هێزێك شەرم نەکەن، با ئەوەیش دێتە لاتان سەرۆك کۆمار بێت، چاو لە "شوڕەیحی" قاضیی براتان بکەن، عومەری کوڕی خەتتاب کردی بە قاضیی، پاش ماوەیەك ئیشێکی کەوتە لای شوڕەیح، ئەمیش شەرم نەیگرتوو نەی وت من عومەر کردوومی بە قاضیی، کەوابوو با لە خۆمی ڕازی بکەم، نەخێر، بەڵکو بە زیانی ئەو حوکمی دا.

وەنەبێ ئەمە تەنها لەگەڵ ئەوا وا بووبێ، بەڵکو "ئیمامی عەلی" یش ڕووداوێکی هێنایە لای، قاضیی هەر بەزیانی ئەو حوکمی بۆدا [1].

"ئەبویوسف"ی قاضیی، هاروونە ڕەشید ڕووداوێکی هێنایە لای کە لەگەڵ فەلەیەکدا شتێك کەوتبووە نێوانیان، قاضیش حوکمەکەی بە قازانجی فەلەکە دا، لە کاتێکدا ئەبوو یوسف هاروون کردبووی بە قاضیی.

برای قاضیی !

هەوڵ بدە با هەموو کات دەرگای دادگاکەت کرابێتەوە و دەرگاوانیشت نەبێ، تا هەژارەکە بەئاسانی بتوانێ بتگاتێ و سکاڵای خۆی بگەیەنێ پێت... چونکە فەرمووده زۆرە سەبارەت بەو کەسانە دەرگا لە هەژارەکان دائەخەن و ناڕۆن بەدەم پێویستییەکانیانەوە، جا تۆیش بەزەیت بێتەوە بە خۆتدا، بەتایبەت لەو ڕۆژەدا لەبەردەم دادگاکەی خوادا ڕات ئەوەستێنن و پرسیاری هەژارەکانت لێ ئەکەن، ئەبێ لەو کاتەدا کێ فریات بکەوێ؟! ئەوانەی تەلەفوینان بۆ ئەکردی؟! ئەوانەی بەهۆی خزمایەتیەوە ناهەقیت بۆ ئەکردن؟! ئەوانەی فێری بەرتلیان کردی؟!.

سەبارەت بەدانانی دەرگاوان ئەم فەرموودەیە بخوێنەوە کە ئەفەرموێت: "من ولاه الله من امر الناس شيئا فاجتحب عن حاجتهم اجتحب الله عن حاجته يوم القيامة" [2].

پێغەمبەر (ﷺ) هەڕەشەی توندو سەختی هەیە بۆ ئەو قاضیانەی بەرتیل ئەخۆن، تەنانەت بەناوی "هەدیە و دیاریشەوە" هەر نادروستە.

".. ما بال العامل نبعثه فيأتى فيقول هذا لك، وهذا لى فهلا جلس في بيت ابيه وامه فينظر أيهدى له ام لا؟ والذى نفسى بيده لا يأتى بشئ إلا جاء به يوم القيامة يحمله على رقبته! ان كان بقرة له رغاء، او بعيرة لها خوار، او شاة تعير، ثم رفع يديه حتى رأينا عفرتى ابطيه !ألا هل بلغت (ثلاثا)" [3].

خوا لەگەڵ تۆیەتی کە ئەفەرموێ:

---

[1] ) الاسلام واوضاعنا السياسية ، ل231 .

[2] ) رواه ابو داود و الترمذي.

[3] ) ارشاد السارى ، ( ب10 ل245) ماناکەی لەدواوە دێت .

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: 44 )

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (المائدة: 45 )

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) (المائدة: 47 )

برای قاضیی !

هەوڵ بدە جێگەی دانیشتنەکەت با ڕێکوپێك بێت و هەموو کەسێك "پیرو شەل و کوێر..." بە ئاسانی دەستیان بیگاتێ و تووشی چەرمەسەریێ نەبن لە ڕێگەدا کاتێ دێن بۆلات.

لەسەردەمی ئیمامی عومەردا (خوا لێی ڕازی بێت) قاضییەك لە شوێنێکی سەخت و ناهەمواردا دانیشتبوو، بەشێوەیەك موسڵمانان زۆر بە ناڕەحەت پێی ئەگەیشتن، ئینجا ئیمام عومەر بۆی نووسی: ".. فاسهل ولا تشق على مسلم ولا معاهد". واتە جێگایەکی ئاسان هەڵبژێرە بۆ خۆت، بە قورس و ناڕەحەت مەجووڵێرەوە، نە لەگەڵ موسڵماندا، وە نە لەگەڵ گاورو جوولەکەدا.

## سیاسەتی ئیسلام لە جەنگدا

بەڵێ، بۆ ئەوەی دنیا خۆرەکان ودوژمنانی تروسکایی و ڕۆشنایی کۆمەڵ بزانن کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام پێش هەموو کەسێك کەوتووە لە دانانی خاڵی گرنگ و جواندا بۆ پیادەکردنی دەوڵەتە زێڕینەکەی خۆی، بە شێوەیەك بە بیری هیچ کەسێکدا نەهاتووە لەو سەردەمەدا... مەگەر تەنها بەرنامەی خوای گەورە ئەو نەخشەیەی دانابێت وپەراوێزی بۆ کردبێ بە "دادگەریی و یەکسانیی و ئازادیی و... هتد". جا فەرموو تۆو هەندێك لە سیاسەتی ئیسلام لە جەنگدا... جەنگی ناچاریی، نەك شەڕ فرۆشتن بەخەڵکی بۆ زۆرکردنی ڕوویەری زەمین و پەرەپێدانی نەخشەی جوگرافیایی ! !.

لە ئیسلامدا دروست نییە بە هیچ شێوەیەك هێرش بردن بۆ هیچ دوژمنێك پێش ئەوەی ئاگادار بکرێ، چونکە زۆر جار وا ئەبێ زۆربەی ئەوانەی کە حەزیان لە ئیسلامە کوتوپڕ ئەکەونە ناو ئاژاوە وجەنگەکەوەوئەکوژرێن و تیا ئەچن... وە زۆرجار وا ئەبێت بەهۆی جەنگەکەوە ڕووداوێك پەیدا ئەبێت و سەرئەنجامەکەی سامناکتر ئەبێت لەوەی پێش جەنگەکە. ئەمەیش لە قورئاندا بەرگری لێکراوە: (..وَلاَ تَعْثَوْاْ فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ).[1] واتە: تۆوی "فەساد" و خراپە لە زەوییدا بلاوەکەنەوە. کەوابوو ئەبێ ئەم خاڵانانە پێش چاو بگیرێن:

یەکەم: پێویستە پێش هەڵگرساندنی جەنگەکە - بە سێ ڕۆژ - دوژمن ئاگادار بکرێ و ڕاپۆرتێکی بدرێتێ و تێ بگەیەنرێ کە خۆی ئامادە بکات بۆ هەڵبژاردنی یەکێ لەم سێ بارەیە:

1- وەرگرتنی ئیسلام و موسڵمان بوون.

2- ملکەچکردن بۆ دەوڵەتی ئیسلام، وە ئاژاوە نەنانەوە.

3- ئامادە بوون بۆ جەنگ.

ئەم ئاگاداری و "انذار" کردنە یەك جار لەسەرەتای جەنگەوە بلاو ئەکرێتەوە، واتە پێویست نییە تا ماوەی سێ ڕۆژەکە ئەڕوا هەر بوترێتەوە.

پێشەواکانمان وابوون لە نەخشەی جەنگەکانیاندا، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) تا ئەگاتە هاوەڵە نەجیبزادەکانی... ئەوەتا - بۆ نموونە - سەلمانی فارسی "کراوە بە فەرماندەی بەشێ لە سوپاکەی ئیسلام" ئەفەرموێ بەسەربازەکانی: "وازم لێ بهێنن با بانگیان بکەم "بۆ لای ئیسلام" چونکە پێغەمبەریش (ﷺ) هەروای ئەکرد. ئینجا سەلمان ئەڕوا بۆ لای فارسەکان و پێیان ئەڵێ: "من پیاوێکم لە ئێوە و بڕوام هێناوە.. خۆ ئەیشزانن موسڵمانەکان چەند ڕیزم لێ ئەگرن... ئێوەیش ئەگەر موسڵمان بن ئەوا لە مافدا وەك موسڵمانەکان تەماشا ئەکرێن، خۆ ئەگەر بڕوایش ناهێنن، قەیناکا "سەرانە" بدەن، وە

---

[1] (الأعراف : 74 )

ئەگەر ئەمەیش ناکەن ئیتر جەنگتان لەگەڵ ئەکەین". سەلمان سێ ڕۆژ ئابەو شێوەیە ئاگاداری کردن و لاواندنی و کەڵکی نەبوو تا ـ بە ناچاریی ـ بۆ ڕۆژی چوارەم چووە مەیدانی جەنگەوە بۆیان.

موسڵمانان هیچ کات دەستیان لەم "انذار" و ئاگادارکردنە هەڵنەگرتووە، دەستیان نەکردووە بەجەنگ وەرا، مەگەر لە کاتێکا بە بەڵگەو نیشانە بۆیان دەرکەوتبێ کە بە هەموو شێوەیەك (إنذار) و ئاگادارکردن سوودی نییە.

دەستیان نەکردووە بە جەنگ پێش ئەوەی ئاگاداری دوژمن بکەن، چونکە بێجگە لەوەی کە لە قیامەت و پاشە ڕۆژ تووشی سزاو تۆڵە ئەبن.. لە دنیایشدا هەر گیان و سامان و داراییەك تێدا بچێت بەرپرسیار ئەبن لێی و ئەچێتە ئەستۆیانەوە[1].

لاپەڕەکانی مێژوو گەواهیمان بۆ ئەدەن کە هیچ دەوڵەتێك ئەمەی نەکردووە بە بناغە و ڕچەی جەنگی... تەنانەت لەسەدەی حەڤدەهەمەوە تا نۆزدەهەمیش ئەمە نەکراوە بە بەندێکی نەخشە جەنگییەکان... بەڵێ وەك سوپاردەیەك ئەبێ مرۆڤ بیسەلمێنێ و باسی بکات و بیڵێ کە: لەساڵی (1907) دا لە لاهایدا کۆنگرەیەك بەسرا ئەم خاڵەیە خرایە پرۆگرامەکانەوە[2]. بەڵام ئەویش زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ ئیسلامدا چونکە ئیسلام:

یەکەم: هەروەك ئاگادرای دوژمن ئەکات بەوەی کە ئەیەوێ جەنگی لەگەڵ بکات ماوەی "72" کات ژمێریش مۆڵەتی ئەدات، بۆ ئەوەی لەو ماوەیەدا بیر لە داهاتووی خۆی بکاتەوە و ڕایەك هەڵبژێرێ ـ لەو سێ خاڵەی ئیسلام بۆی دیاری کردووە ـ بۆ خۆی.

بەڵام ئەوان مۆڵەتی تێدا نییە، تەنها ئاگاداری کردنە.... بۆیە دەوڵەتی "هۆڵەندە" ڕەخنەی گرت لە کۆنگرەی "لاهای" لەسەر ئەوەی بۆ چی ماوەی دیاری نەکردووە، هەروەك پێش جەنگەکە ئاگاداری ئەکات...!! داوای کرد "24" کات ژمێر مۆڵەت بدەن بەو لایەنە کە جەنگی لەگەڵ ئەکرێ. کەچی کۆنگرە داواکەی ڕەتکردەوە..!!.

خوێنەری بەڕێز:

هەندێ بیربکەرەوە لە سۆزو میهرەبانی ئیسلام لەگەڵ مرۆڤدا.. لەگەڵ دوژمنەکەیدا بزانە چۆن پێش ئەوەی هێرشی بۆ بکات ئاگاداری ئەکات و مۆڵەتیشی بۆ دائەنێ..؟! خۆ ئەوە ئەزانێت دەوڵەتانی سەدەی بیستەم چۆن ئەجووڵێنەوە لەگەڵ یەکتردا؟!

دووەم: ئەگەر ئەو لایەنە کە جەنگی لەگەڵ ئەکرێ خاوەن پەیمان بوو لەگەڵ موسڵمانەکاندا، وە دەرکەوت کە ئەوان وردە وردە لە ژێرەوە خەریکی گزیکاری و ناپاکین لەگەڵ ئەماندا... ئەوە موسڵمانەکان پێش ئەوەی هەڵمەتیان بۆ ببەن ئاگاداریان ئەکەن و پەیمانەکەیان بۆ ڕەت ئەکەنەوە... خۆ ئەگەر ئاوا نەکەن ئەوە ئیسلام بە تاوانبار و گزیکاریان دائەنێ، قورئانی پیرۆز ئەفەرمێ: (وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاء إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الخَائِنِينَ).[3] واتە هەرکات زانیاری تەواوت بوو بەوەی کە هۆزێك ئەیانەوێ ناپاکی و گزیکاریت لەگەڵ بکەن سەبارەت بەو پەیمانەی لەگەڵیاندا بەستراوە، بەو مانایە ئەیانەوێ بتخەڵەتێنن و کوتوپڕ هەڵمەتت بۆ بێنن، ئەوە تۆ وەك ئەوان مەبە، بەڵکو بە ئاشکرا پەیمانەکەیان بۆ ڕەت بکەرەوە، با ئەوانیش ئامادەیی وەرگرن بۆ جەنگەکە، چونکە بە ڕاستی خوا دەستدرێژکەرانی خۆش ناوێ!! واتە ئەوانەی لە کە میندان وهەل ئەقۆزنەوە پەیمانەکە نادەنە دواوە و بەئاشکرا ناڵێن: ئەوا پەیمانەکەمان هەڵوەشاندەوە ! ئەو جۆرە کەسانە بەدەست درێژی کەر دائەنرێن.

---

[1] ) الماوردی : الاحكام السلطانية ، ل38 .

[2] ) القانون الادولي لعلى ماهر، (ل 514 _ 515 ).

[3] الأنفال: 58.

بەکورتی: هەرکەسێك خاوەنی "وەفا" بێ ئیسلام داوا ئەکات وەفات ببێ لەگەڵیدا، بەڵام ئەوانەی ئەیانەوێ لەژێر پەردەی "پەیمانە" کەوە گزیکاری بکەن ئەوە فرمان ئەدا بە هەڵوەشاندنەوەی.

ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) ئەفەرموێ: "الوفاء لأهل الغدر غدر، والغدر بأهل الغدر وفاء".

بێجگە لەمە لەفەرموودەیشدا هاتووە: "لە نێوان موعاوییە و ڕۆمەکاندا پەیمان بوو، موعاویەیش بەرەو وڵاتی ئەوان ڕێگەی گرتووەتە بەر "واتە بەهۆی گزیکارییانەوە ویستی جەنگیان لەگەڵ بکات" بە نیازی ئەوەوە کە هەرکات ماوەی پەیمانەکەیان تەواو بوو جەنگیان لەگەڵ بکات، ئینجا لەولاوە ئەسپ سوارێك هات ئەیوت: الله اکبر، الله اکبر، پەیمان بەجێ بهێنە، نەك لابدە، تەماشایان کرد وا "عەمری کوڕی عەبەسە" هات، موعاوییە ناردی بۆلای، ئەویش وتی لە پێغەمبەرم بیستووە (ﷺ) ئەیفەرموو: "من كان بينه وبين قوم عهد فلا يحلن عقده ولا يشدنها حتى ينقضي أمدها، او ينبذ اليهم عهدهم على سواء" ئەوکەسەی پەیمانی هەیە لەگەڵ تاقمێکدا نە خاوی بکاتەوە و نە توندیشی بکاتەوە تا ماوەکەی بەسەر ئەچێ، یان پەیمانەکەیان بۆ ڕەتئەکاتەوە "وە ئاگاداری جەنگ ئەبن" چوون یەك ئیتر موعاوییە گەڕایەوە[1].

گرنگتر لەمەیش پێویستە دوای ئەوەی کە پەیمانەکەیان بۆ ڕەتکرایەوە ئەبێ ماوەیەك مۆڵەت بدرێن تا لەو ماوەدا بتوانن لەناو چەو وڵاتە ئیسلامییەکان دەرچن و خۆیان بگەیەننە قایمایی. ئەم ئایەتە ئەم مەبەستەمان بۆ باس ئەکات: (وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ ..)[2] واتە: ئەگەر یەکێ لە (هاوەڵدانەرەکان) داوای پەنای لێکردی، ئەی موحەمەد (ﷺ) تۆیش پەنای بدە.

بەڵێ هەندێ لەزاناکان بە لایانەوە وایە کە کاتێ نروستە پەنادان، لەوپەنادانە موسڵمانەکان تووشی هیچ جۆرە زیانێك نەبن، ئەگینا دروست نییە، وە هەرئەم دەستەیە بەلایانەوە وایە تا دەساڵ دروستە پەنا بدرێن، جا ماوەتەوە سەرئەوە ئایا سەرانەیان لێ ئەسەنرێ یانە؟ دوو ڕێگە هەیە:

بەڵام ئەوەی پشتی پێ ببەسترێ ئەوەیە کەکار بەدەستەکان خۆیان ئەزانن، وە چۆن بەژەوەندی داوا بکات ئاوا ڕەفتار ئەکەن[3].

بەڵێ، ئەمەیە یاسای پڕ لە دادگەریی و، ئازادیی و، سەربەستیی، هەل قۆستنەوە ـ بەلایەوە ـ قەدەغەیە، ئەگەر کاتی خۆی کەسێك، وەیا چەند کەسێك هاتبوونە وڵاتی ئیسلامەوە... کەچی لە پڕێکدا نێوان هەردوولا تێکچوو ئەوە ئەبێ ئەو دوژمنە مۆڵەت بدرێ و بگەیەنرێتەوە جێگەی خۆی.

کوان دەهۆڵ لێدەرانی خۆرهەڵات و خۆر ئاوا...؟ ڕوویان هەیە سەر بێننە دەرەوە با بەراوردێکی ئەم لێبوردنەی ئیسلامە و ئەو دەستدرێژییەی ئەورووپایە بکەن لە شەڕەکانی خاچپەرستیدا، ئیسلام ئەگەر کۆمەڵێك هاتبنە خاکەکەیەوە بە شێوەی "ڕەسمی" ی و پاشان دوژمنایەتی بکەوێتە نێوان هەردوولاوە ئەوە زۆر بەنەرم و نیانی ئەیانکاتە دەرەوە "سامەگەر سیخوڕی و هەندێ کاری زۆر ناپەسەندییان کردبێت.."، بەڵام ئەورووپا دەست درێژیان بۆ ئەکات و ئەشکەنجە و ئازاریشیان ئەدات.. !! دەستە ناپاکەکەی "ئەڵەمانیا" لە جەنگی دووەمی جیهانیدا شایەتی ئەم داوایەیە.

لەحاڵەتی جەنگدا چوار پرسی گەروە دێتە پێشەوە:

1ـ دیاریی کردنی جەنگکەرەکان.

2ـ کەرەسەکانی جەنگ و کوشتار.

3ـ پەیوەندی سیاسی لە کاتی جەنگەکەدا.

4ـ ڕەفتارکردن بە پلەیەك شایەنی ئادەمیزاد بێت.

---

[1]) نیل الأوطار ( ب8 ل45).

[2] (التوبة : 6 )

[3]) تفسیر المنار ( ب10 ل179) .

جا وا پشت بە خوای گەورە ئەمانە هەموویان ڕۆشن ئەکەینەوە بۆ خوێنەرە بەڕێزەکان، وە بۆیان دیاری ئەکەین کە کاتێ ئیسلام جەنگی کرد ـ بەناچاریی ـ لەگەڵ وڵاتێکدا چ جۆرە هۆیەکی جەنگی بەکار ئەهێنێ؟ ئایا هەرچی بەردەست کەوت بۆی ڕەوایە بەکاری بهێنێ بۆ دوژمنەکەی، بە بەڵگەی ئەوە وە جەنگی لەگەڵ ئەکات...؟ پەنجە ڕائەکێشێ بۆ ئەوەیش کە ئایا ئیسلام هەموو دانیشتووەکانی شاری دوژمنەکەی بەشەڕکەر دائەنێ؟ تا دەست پارێزی نەکات لە پیرو منداڵ و ئافرەت و... هتد، یان تەنها ئەوانە بەجەنگکەر دائەنێ هاتوونەتە مەیدانی جەنگەوە بۆی...؟!! ئەمانە و هەندێ شتی تریش ڕۆشن ئەکەینەوە بۆ خوێنەری ئازیز بەو هیوایەوە دەست لەم و لەو هەڵگرێ و بە تەواوی ڕوو بکاتەوە ئیسلام.

یەکەم: دیارییکردنی شەڕکەرەکان:

لەسەدەکانی پێشوو ناوەڕاستدا یاسا وابوو: کاتێ جەنگ هەڵبگیرسایە لە نێوان دوو دەوڵەتدا هەموو ژێر دەستەکانیان ـ بێ جیاوازی نێوان شەڕکەرو شەڕنەکەردا ـ بەشەڕکەر ئەدرایە قەڵەم، وە هەرکامێکیان هەرچی ئەو لاکەی تری بەرچنگ بکەوتایە ئافرەت و منداڵ و، پیرو گەنج، جەنگکەرو نەخۆش، هەمووی بە دوژمن ئەدلیە قەڵەم و ئەیکوشت ئەگەر دەسەڵاتی بەسەردا پەیدا بکردایە!!.

ئینجا کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات نەخشەی تایبەتی کێشا بۆ جەنگ و بڕیاری دا تەنها جەنگکەران بکوژرێن، واتە ئەو کەسانەی ئامادە کراون بۆ جەنگ، ئیتر یەکسەرە بەشداری بکەن، وەیا ئامادە کرابن بۆ کاتی تەنگانە و پێویست.

بەڵام نەخۆش، ئافرەت، منداڵ، پیر، ئەوانەی تەنها خەریکی خوا پەرستین، جوتیار، بازرگان پیشە ساز... ئەوانە بە "مەدەنی" و بێ تاوان دائەنرێن، نەك بە سەربازو جەنگکەر، ئەمانە نابێ بەهیچ شێوەیەك دەستیان بۆ ببرێ و ئازار بدرێن، سامەگەر بەشێکیان بیێ لەجەنگەکەدا وەك ئەوە ئافرەتێك سیخوڕی بکات، وەیا چارەسەری بریندارەکان بکات.

ئافرەت و منداڵ و.. هتد ناکوژرێن، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری کردووە لە کوشتنی ئەوانە، ئەم ئایەتەیش هەر ئەو مەبەستە ئەگەیەنێ: (وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ ..)[1]. واتە: جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا بکەن و ئەوانە بکوژن لەگەڵیانا ئەجەنگێن، نەکەن زیادە ڕەوی بکەن بۆ ئەوانەی جەنگتان لەگەڵ ناکەن. وە ئەمانەیش کۆمەڵە بەڵگەیەکی ترن:

1ـ پێشەوا ئەحمەدو ئەبوو داود ئەگێڕنەوە ـ لەو فەرموودەیە کە ڕیاحی کوڕی ڕەبیع هێناویەتی ـ کەلە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) ڕۆشتن بۆ "غەزا" یەك، خالیدی کوڕی وەلید کرا بوو بە سەرکردەی بەشی پێشەوە "مقدمە" ی سوپاکە، ڕەباح و هاوەڵەکانی تێپەڕین بەلای ئافرەتێکی کوژراودا[2] ـ دیار بوو سوپاکەی پێشەوە کوشتبووی ـ تەماشایان کرد و سەرسام مان لە کوشتنەکەی!! ئینجا گەیشتن بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش هات سەیری کردوو فەرمووی: "ما كانت هذه لتقاتل" نەئەبوو ئەمە بکوژرایە. دوای ئەوە یەکێکیان نارد بۆلای خالید فەرمووی پێی بڵێ: "لا تقتلوا ذرية ولا عسيفا" منداڵ و کرێکار نەکوژن.

2ـ ئەبوو داود ـ کەئەنەس ئەیهێنێ ـ ئەفەرمێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "انطلقوا باسم الله، وبالله، وعلى ملة رسول الله، لاتقتلوا شيخا فانيا، ولا طفلا صغيرا، ولا امرأة،...".

بەناوی خواوە بڕۆن، یارمەتی هەر لە خواوە وەربگرن، پیرو، منداڵ و، ئافرەت نەکوژن...

ئەم فەرموودانە و هەندێ فەرموودەی تریش ئەبنە بەڵگەی ئەوە کە ئافرەت ومنداڵ و نەخۆش و پیر و... ناکوژرێن، چونکە ئەمانە دەستیان لە جەنگەکەدا نییە.

---

[1] (البقرة : 190 )

[2] ) وەنەبێ کوشتنەکەی دەست ئەنقەست بوو بێت، بەڵکو لەکاتی شکاندنی بت پەرستەکاندا بوو و ئەوکاتە بوو موسڵمانەکان کەوتنە سەریان ، بەهەڵە ئەو ئافرەتە پێوە بوو ، هەروەك لە هێرشی سەربازییداچەندەها شتی هەڵە ڕوو ئەدات . الرسول القائد (ﷺ)، ل 262 .

دوای پێغەمبەر (ﷺ) جێ نشینەکانیشی هەربەو نەخشەدا ڕۆیشتن، عومەر (ڕەزای خوا لێ بێ) ئەفەرمێ: "اتقوا الله فى الفلاحين، فلا تقتلوهم الا ان ينصبوا لكم الحرب"[1].

بەڵێ ئیسلام ئەمانە ناکوژێ، چونکە بۆ پاککردنەوەی سەر زەوی هاتووە، لە ستەمی ستەمکاران، ئاشکرایە ئەمانە بێ ستەمن، کەوابوو کێ ستەمکارە ئەو کەسە لەناو ئەبات.

ئەوانە ناکوژرێن، بەڵام ئەوەندە هەیە جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ئافرەتێکی کوشت، جارێکی تریش هاوەڵەکانی ئافرەتێکی تریان کوشت، ئەم لێی بێدەنگ بوو... وە هەروەها پیرەمێردێك کوژرا تەمەنی پتر لە سەد ساڵ بوو، پێ ناخۆش بوونیشی دەرنەبڕی! !. نەك هەرئەمە، بەڵکو لەگەڵ "بنى قورەيظة" دا جەنگاو تەواوی پیاوەکانی کوشتن، تەنها چواریان نەبێ، ئەمانە موسڵمان بوون و خۆیان ڕزگار کرد لە کوشتن. وە ژن و مناڵەکانیشیان هێڵرایەوە[2].

دیارە کرێکارو جوتیارو پیر... ئەمانەیشیان تیا بووە کەچی گوێی نەداونێ و لەناوی بردن! ! واتە لە پێشەوە وترا ئیسلام ئافرەت و پیرەمێرد و منال و کرێکار... ناکوژرێت کەچی ئەوەتە پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ کات کوشتوونی ! ! ئەم دوو وتەیە چۆن ئەگونجێن؟. ئێمەیش لە وەڵامدا ئەڵێن:

1ـ ئەو ئافرەتەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کوشتی ئافرەتێك بوو بەردێکی دا بە موسڵمانێکدا و کوشتی، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتەکەی کوشتەوە لە جیاتی خوێنی موسڵمانەکە[3].

ئەو ئافرەتەیش لە پێش چاوی پێغەمبەردا کوژرا و پێشی ناخۆش نەبوو، ئەوە لە ڕۆژی "حونەین" دا بوو، "ئیبنی عەبباس" باس ئەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) بە لای ئافرەتێکی کوژراودا تێپەڕی، فەرمووی کێ ئەمەی کوشتووە؟! پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە جەنگ دەستم کەوتووەو خستمە پاشکۆی خۆم، تەماشا ئەکەم پەلاماری شیرەکەی دام کاتێ بینی ئێمە تێکشکاین تا بمکوژێ، من مۆڵەتم نەداو ئەوم کوشت، پێغەمبەر (ﷺ) پێناخۆش بوونی دەرنەبڕی.

ئەم دوو ڕووداوە وا مانا ئەبەخشن کە ئەو دوو ئافرەتە هەردووکیان بەشداری جەنگیان کردووە بۆیە کوژراون، لە پێشیشەوە وتمان هەرکەسێك بەشداری جەنگ بکات ئەوە ئەو کەسە بە جەنگکەر دائەنرێ با لە قۆڵی دواوەیشەوە بێت.

2ـ ئەو پیرەمێردەیش کە کوژرا ـ کە بوخاری و مسلیم ئەگێڕنەوە بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) کوشتی لە ڕۆژی "حونەین" دا ـ چونکە پیاوێکی وریاو زیرەك و خاوەن تەجروبە و دنیا دیدە بوو، بە تایبەت لە کاروباری جەنگدا شارەزا بوو، ئەوانیش ـ دوژمن ـ تەگبیرو ڕاوێژیان پێ ئەکرد ئەویش نەخشەی بۆ ئەکێشان.

ئاشکرایە کاروباری جەنگ لەسەر نەخشە ئەڕوات، وە نەخشە گرنگترین شتە لە جەنگدا، تەنانەت ئەو کەسەی نەخشەکە ئەکێشێ گرنگترە لە جەنگاوەرەکان... بۆیە لە جەنگەکەی نێوان موعاوییە و عەلی دا قەیسی کوڕی سەعد ـ پیاوێکی ناودارو خاوەن ڕای جەنگ بوو ـ چووە ناو لەشکرەکەی ئیمامی عەلییەوە، کاتێ موعاوییە ئەمەی بیست وتی: "لو امد علي بمثانية آلان مقاتل ماكان بأغيظ لي من ذلك" ئەگەر هەشت هەزار جەنگاوەرو سەرباز بهاتایە بۆ یارمەتیدانی عەلی بە ئەندازەی ئەوە پێم ناخۆش نەبوو کە "قەیس" هات بۆلایان.

3ـ لەناوبردنی و کوشتنی پیاوەکانی "بەنی قورەیزە"، لە فەرموودەیەکی "صحيح"دا ـ کە ئیمامی مسلیم هێناویەتی ـ هاتووە... واتە ئەمە ڕاستیە کە پێغەمبەر (ﷺ) هەموو پیاوەکانی کوشت، بەڵام ئەمە کاتی تایبەتی خۆی بووە، وە هۆی تایبەتی وای داوا کردووە، چونکە لە یاسای دەوڵەتانی جیهاندا هەیە:"ان الضرورات تقدر تقديرا نسبيا يختلف باختلاف الاشخاص لتبرير الوسائل الصارمة". کە ناچاری و پێویستی دیاری ئەکرێ بە گوێرەی کات و زەلام وهۆکانی جەنگیی.

ئەو جوولەکانەیش هەر هەموویان هاتبوون بۆ لە ناوبردنی موسڵمانەکان لە جەنگی "خەندەق" دا.. هاتبوون بۆ ڕیشەکەنکردنی ئیسلام بەتەواوی، بەونیازەوە، ئیتر جارێکی تر بڕوادارێك نەمێنێ، قورئانی پیرۆز ئەمە ئەخاتە پێش چاو:

---

[1] ) واتە: لە خوا بترسن سەبارەت بە جوتیارەکان "مافیان زەوت مەکەن" وە مەیان کوژن ، سامەگەر شەڕتان پێ بفرۆشن.

[2] ) ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن (ﷺ) پارەزانی ( 389 ).

[3] ) سەیری : (( الرسول القائد ــ ﷺ ــ بکە ل170 جەنگی چاڵ ، بەشی / محاسبة القادرين .

(إِذْ جَاؤُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ منكُمْ وَإِذْ زَاغَتْ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَت الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ باللَّه الظُّنُونَا * هُنَالكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمنُونَ وَزُلْزلُوا زلْزَالاً شَديداً * وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافقُونَ وَالَّذينَ في قُلُوبهم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُوراً * وَإِذْ قَالَت طَّائفَةٌ مِّنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا وَيَسْتَأْذنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَاراً) (الأحزاب: 10 ـ 13).

نیازێکی زۆر نامەردانەیان بوو.. هەڵسان بە سێ قۆڵی ـ بەنی قورەیزە و، قورەیش و، غەطەفان ـ هەرچی هێزیان بوو بەکاریان هێنا... بەڵام ئەوە بوو خوای گەورە جموجووڵەکەیانی بێ ناوەرۆك کردەوە و ڕووخاندنی و نەی هێشت بگەن بەئاواتی بۆگەنی خۆیان.

ئەوان نیازیان ئەوە بوو، ئینجا کە موسڵمانەکان سەرکەوتن بەسەریاندا، ئەمیش ئاوای لەگەڵ کردن کە کردی[1]. بەڵێ ئیسلام خاوەنی عەفوو و لێبووردنە، بەڵام کاتی وا هەیە ـ ئەگەر لە دەستدرێژی دوژمنان بترسێ ـ ڕەوایە بۆی وەك ئەوان بکات، بەڵام هەرکات دەسەڵاتی بوو و لە دەستدرێژی نەترسا ئەو کاتە عەفوو و لێبووردنەکەی ئەخاتە کار.

بەڵێ لە پێشەوە وتمان "مەدەنی" جەنگی لەگەڵ ناکرێ و دروست نییە دەستی بۆ ببرێ... ئەمە وایە بەمەرجی ئەوە دوژمن نەیانکات بە قەڵغان و لە پاڵ ئەواندا دەست بوەشێنێ... ئیتر بیخاتە پێشەوە، وەك ئەوەی "ئەڵمانیا" کردی بە دیلەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی، ئەوە بوو دیلەکانی ئەخستە پێشی سوپاکەیەوە، خۆ ئەگەر مەدەنییەکانی کردە قەڵغان و لە دوایانەوە دەستی ئەوەشان، وەیا سەربازگەیان بردە پەنای دێهات و شارەکانەوە، ئەوە لەم کاتەدا دروستە دەست نەپارێزێ نە لە سەربازگەکە و، نە لە "مەدەنی" یەکان، چونکە ناگونجێ جەنگەکە لەبەر خاتری ئەوان بووەستێنرێ، ئەگینا دوژمن فورسەت دێنێ وخۆی ئەخاتە پەنای "مەدەنی" یەکانەوە و دەستی خۆی ئەوەشێنێ و ئەمیش لەبەرخاتری "مەدەنی" یەکان هیچی پێ ناکرێ. بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری نەکرد لە هێرش بردنە سەر هۆزی "بەنی موصطە لیق"، وە لە دێهاتەکانی جوولەکە.

ئیسلامی پیرۆز ئا بەو شێوەیە ئەو فێڵ و تەڵەکەیەی دوژمن بەکاری ئەهێنێ بۆ لەناوبردنی ڕۆڵەکانی ئیسلام پووچەڵی ئەکاتەوە، پێش ئەوەی وڵاتە یەکگرتوەکان بەندی پانزەهەم دابنێن ساڵی 1861 ز و بڵێت: "ان ضرورات الحرب تجيز اتلاف العدو المسلح، وكل نفس وجدت اثناء النزال ولم يستطع انقانها"[2]. ناچاری جەنگ لەناوبردنی دوژمنی چەك بەدەست بەڕەوا ئەدات، وە هەروەها هەرکەسێکی تریش بێتە ناو گۆڕەپانی جەنگەوە و ڕزگاری نەکرێ، بێ ئەوەی لەناو ببرێن.

ئیسلام ئەم یاسایەی هەیە، وڵاتە یەکگرتووەکانیش هەیەتی، بەڵام ئەمەی ئیسلام ـ بێجگە لەوەی پێشی ئەو کەوتووە بەچەند سەدەیەك ـ جیا ئەبێتەوە لەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان لای کەمی لەدوو ڕووەوە:

1 ـ بنەمای "بیستو پێنجەم" هەن لەبەندەکانی جەنگە وشکانییەکان بەڕەوا ئەبینێ گوللەبارانکردنی هەر شارو دێهاتێك بتوانێ کەم تا زۆر بەرگری لەخۆی بکات، بەلاوازو نەخۆش و منداڵ و پیرەمێرد و شتی ترەوە، گوایە بەو نیازە کە دوژمن ورەی نەمێنێ و لاواز ببێت و لەناچاریدا خۆی بدات بە دەستەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان ئەمەی بەلاوە پەسەندە کەچی ئیسلامی پیرۆز ـ وەك وتمان ـ بەلایەوە قەدەغەیە، بەڵکو تەنها جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا ئەکات بەشداری جەنگەکە ئەکەن.

---

[1] ) ئەی چۆن لەناویان نەبا ..؟ ئەوان لەگەڵ قورەیشدا و پارتەکانی تری ئەو سەردەمە دەستیان تێکەڵ کردو ئەوانیان هێنایە سەریان و شارەزاییان کردن، چونکە شارەزای ڕێگە و بانەکانی "مەدینە" بوون، تەنانەت هەندێکیان خۆیان بەدزیەوە و ئەڕۆیشتنە ناو شارەوە بۆ ئەزیەت دانی خێزانی موسڵمانەکان !! ئیتر ئەو عەهدو پەیمانەی لە نێوانیاندا بوو لە بیریان چوویەوە و دەستیان نایە ناو دەستی پارتەکان بۆ لە ناوبردنی موسڵمانەکان. ئایا ئەگەر پارتەکان سەرکەوتنیان بەسەر ئەماندا دەست بکەوتایە چییان پێ ئەکردن؟! ئایا لەناویان نە ئەبردن؟ کەوا بوو ئێستا ئەمانیش بۆچی تۆڵەی خۆیان وەرنەگرنەوە ؟ .

[2] ) حقوق الملل ، ل35 .

2 ـ ئەگەر ولاتێك گەمارۆ درا ئەوە بەپێی یاسای دەوڵەتانی جیهان ـ لەم دواییانەدا نەبێ ـ دەرفەتی "مەدەنی" نادرێ دەرچێ و بڕواتە دەرەوە! ! کەچی ئیسلام بەلایەوە کارێکی پەسەندە و ڕێگە یان بۆ چۆڵ ئەکرێ تابڕۆنە دەرەوە و نەبن بە بەسووتەمەنی جەنگەکە.

بەڵێ، ئیسلام خاوەن سۆزو بەزەییە، بۆ لەناوبردن و قەلاچۆی کۆمەڵ نەهاتووە، بۆ لابردنی دەستدرێژی و ستەمی ستەمکاران هاتووە، دەی بە هەربەندازەیەك بگونجێ لەوە زیاتر دروست نییە تێپەڕ بکرێ لێی.

یاسادانەرانی (دونیای خۆرئاوا)یش ئەڵێن: (ان اعفاء بعض رعایا الدولة من اعباء لحرب لایزید علی مجرد خرافة دینیة ـ ان صحت فیما مضی من الحروب ـ فلا یمکن أن تطبق علی الحروب الحدیثة).[1] عەفووکردن و لێبوردن لە هەندێ دانیشتوانی دەوڵەت لە ئەشکەنجە و ئازاری جەنگ، شتێکی پووچەڵ و ئەفسانەی ئایینیە، ئەمە ئەگەر کاتی خۆی ڕەوا بوو بێت، ئێستا هەر دروست و ڕەوا نییە پیادەکردنی لەگەڵ جەنگەکانی ئەمڕۆی جیهاندا! ! !.

دووەم: دیاریکردنی کەرەسەکانی جەنگ:

هەر کەرەسەیەك هۆی سەرکەوتن بێت بەسەر دوژمندا لە جەنگدا ئیسلامی پیرۆز بە ڕەوا و پەسەندی دائەنێت، بەپێی ئایەتی: (وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ ..).[2] مەگەر هۆیەك بێت ئەم زیانانەی لێ بووەشێتەوە:

أ ـ گزیکاری و خیانەت بۆ دوژمن، ئەوە دروست نییە، چونکە پەیمان شکاندن صیفەتی دووڕوو "منافق"ە.

ب ـ زیان بەخش بێت بە کۆمەڵی موسڵمانان....

ج ـ کارێکی ناپەسەندی وا کە ئیسلام "ڕەفض" ی بکات و بەلایەوە دروست نەبێت بەکارهێنانی لەگەڵ ئادەمیزادا، وەك گوێ برین و لووت برین و... پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمێ: "ایاکم والمثلة ولو بالکلب العقور" خۆتان دوور بگرن لە ناشیرین و بێ ڕێزکردنی "مثلة" (گیانلەبەران) تەنانەت لەگەڵ سەگی هاریشدا.

واتە: دوای ئەوە کە سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، نابێ ناشیرینی بکەیت وەك گوێ برین و هەڵواسینی و ڕاکێشانی بەدوای ئوتۆمۆبیلدا و.... هتد.

**ئەمانەیش هەندێکن لەو کەرەسانەی لە ئیسلامدا بەکارهێنانیان دروستن**

1ـ چەکی سپی (الاسلحة البیضاء).

2ـ تۆپی قورس "القذائف الثقیلة".

3ـ بڕینی سەرچاوەی ئاو لە دوژمن "قطع المیاه".

4ـ غەرق کردن و نوقم کردنی لە ئاودا "التغریق".

5ـ گەمارۆدانی دوژمن "حصار العدو".

6ـ کەمین دانان بۆی.

7ـ دانانی لوغم (مین) "بث الالغام".

8ـ سیخوڕی و جاسوسی "التجسس".

9ـ ناکۆکی و دووبەرەکی خستنە نێوان دوژمنەوە .

---

[1] ) مذکرات سامی جنیسنة

[2] (الأنفال : 60 )

10- لەناویردنی دارایی و سامانی دوژمن "ئەو ئەندازەیەی جەنگەکە داوای بکات".

ئەمانەش ئەوانەن کە دروست نییە بەکارهێنانیان:

1- گازی ژەهراوی "الغازات السامة".

2- گازی تاساندن "الغازات الخانقة".

3- ئەو تۆپانەی دەبنە هۆی بریندارکردنی دوژمن، برینێکی ئێش پێگەیەنەر بیٚ ئەوەی پێویست بیٚ بەکارهێنانی.

4- داوای یەك کەوتن بە درۆوە "المفاوضة بالخداع".

5- جلوبەرگ لەبەرکردنی دوژمن، بۆ ئەوەی سەری لیٚ چەواشە بیٚ و نەتناسیٚ.

6- داگیرکردنی ماڵی دوژمن "المصادرة".

ئەمانە و هەندیٚ هۆکاری تریش هەن دروست نییە بەکارهێنانیان.

ئینجا پشت بەخوای گەورە درێژە ئەدەین بە چوار خاڵ لەوانەی باسمان کردن لەسەرەوە، لە دروست و نادروستەکان.

1- سیخوڕی "التجسس"

2- حرب الاعصاب

3- اتلاف ممتلکات العدو

4- مصادرة مایوجد منها یلاننا

**سیخوڕی**

وشەی "جاسوسی" و سیخوڕی وشەیەکە دەروونی هەموو ئادەمیزادێکی زانا و بەویژدان بێزاری لیٚ ئەکات، هەرگیز دڵی بۆی لێنادا، چونکە کاری پیاو نییە، پیاو ئەوەیە بە عەرەقی ناوچەوان و هێزی باسك نان پەیدا بکات، نەك وەك مشکی جەوالدڕ خۆی داگریٚ لەم و لەو تا قسەیەکیان لیٚ بدزیٚ و بیبا بۆ ئاغاکەی و ئەویش خەڵاتی بکات!! خەڵات لەسەرچی؟ لە پێناوی چیدا؟ لە پێناو ئایین فرۆشتندا !! خۆفرۆشتندا!! نیشتمان فرۆشتندا!!.

"سیخوڕی" ی ئەوەندە ناشیرینە دەروون پیٚ ی تاریك و ڕەش ئەبێت، بەڵام چونکە جەنگ کاتێکی تایبەتی خۆی هەیە و لە نائاسایشدا ڕوودەدات، لە ناچارییدا ڕوو ئەدات، ئیسلامی پیرۆز بە ڕەوای دائەنێت، "بەو مەرجە ڕەوا بێت".

---

[1]) وەك ئەوە کە "نوعەیمی کوڕی سەعد" هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی دایە کە بڕوای هێناوە و موسڵمان بووە، وە هێشتا گەلەکەی نەیانزانیووە . ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: "تۆ تەنها پیاوێکی ــ واتە ئەتوانی خۆت کەناربگری لە ئێمە بۆ ئەوەی کەس نەت ناسیٚ ــ کەوابوو تا ئەتوانی با پێت نەزانن، چونکە یەکیٚ لە هۆ جەنگیەکان بەکارهێنانی وردە کاری و فێڵە بەرانبەر بە دوژمن".

نوعەیمیش لێداو ڕۆیشت بۆ ناو "بەنی قوڕەیزە" ــ کە کاتی خۆی هاوپەیمان بوون ــ پێی وتن: ئێوە خۆ ئەزانن من تا چ ئەندازەیەك خۆشەویستم بۆتان بیستوومە لەگەڵ قوڕەیش و غەطفان" دا پەیمانتان بەستووە سەبارەت بە جەنگ کردن لەگەڵ موحەممەددا !! دیارە "وەك خۆتان ئەزانن: ئەوان وەك ئێوە نین ، ئەم شارە شاری ئێوەیە ماڵ و خێزانی ئێوەی تیایە، بەڵام (قوڕەیش) و (غەطەفان) ئەگەر دەستکەوتیان بوو ئەوا باشە، ئەگینا ئەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و دەست لە ئێوە هەڵ ئەگرن و ئەو کاتە ئێوەو موحەممەد ئەمێننەوە ، دیارە دەرەقەتیشیان نایەن. کەوابوو یارمەتیان مەدەن تا بارمتەیان لیٚ وەرنەرگن، بەنی قوڕەیزە وتەکەیان بەلاوە پەسەند بوو، ئینجا هەڵساو لێدا ڕۆیشت بۆ لای قوڕەیش وتی: "بیستوومە کە "بەنی قوڕەیزە" پەشیمان بوونەتەوە و ناردویانە لای موحەممەد و وتوویانە: ئەگەر ئێمە هەندیٚ لە پیاوە ناودارەکانی (قوڕەیش) و (غەطەفان) بێنین تۆ بدەی لەگەردنیان لێمان خۆش دەبی ؟! ئەویش بەڵێنی پیٚ داون. کەوابوو ئەگەر قوڕەیزە داوای بارمتەیان کرد لێتان تەنها پیاوێکیان نەدەنیٚ" .

هەر بەو چەشنە ڕۆیشتە لای غەطەفان)یش ... ئینجا قوڕەیش و هاوپەیمانەکەی ناردیان بۆ یارمەتی و ئامادە بوون بۆ لای بەنی قوڕەیزە، ئەوانیش داوای بارمتەیان کرد !! کە ئەمەیان بینی وتیان: بەڕاستی نوعەیم ڕاستی وت!! بارمتەیان نەدا، بەنی قوڕەیزەیش وتیان: بەڕاستی نوعەیم ڕاستی وت!!. ئیتر پارتەکان ناکۆکی کەوتە نێوانیان و متمانەیان بە یەکتری نەما. دیارە پەرتەوازەیی ڕووی کردە هەرتاقمێك زوو تیا ئەچێت .

ئاشکرایە هەموو فەرماندە و ئامێرێکی سەربازی ئەبێ وریایی و ئامادەیی خۆی دەربڕێ بۆ زاڵ بوون بەسەر دوژمندا، ئەمەیش بەوە ئەبێت بزانێ چۆن هەنگاو هەڵئەگرێ و سوپاکەی چۆن دایمەزرێنێ ولە کوێیدا سەربازگەی بۆ بکاتەوە و چۆن برواتە سەر دوژمن؟ چەند هێزو سوپای ئەوێ؟ ئەمانە و هەرچی تریش پێویستی جەنگن... هەر لەبەر ئەمەیە هەموو سوپایەك ـ کۆن و تازە ـ کۆمەڵە سیخوڕێکی بووە بۆ ئەوەی ئەندازەی دوژمنی بۆ دەست نیشان بکات لە رووی ئەندازەو هێزو دەسەڵاتەوە. بۆ ئەمەیش پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر لەسەرەتاوە خۆی ئەمەی بەکارهێناوە وەك هۆیەك بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، بەلگەیشمان:

أـ لە ڕۆژی "حونەین" دا پێغەمبەر (ﷺ) عەبدوڵلای کوڕی ئەبوو حەدرەدی ئەسلەمیی نارد بۆ ناو دوژمن تا بزانێ چی ئەکەن و خەریکی چین..[1]؟ ! !.

ب ـ لە جەنگی خەندەقدا پێغەمبەر (ﷺ) حوزەیفەی کوڕی یەمانی نارد فەرمووی: "ادخل في القوم فانظر ماذا يفعلون، ولا تحدثن شيئا حتى تأتينا به". بڕۆرە ناو دوژمن و ورد بەرەوە و بزانە خەریکی چین و چی ئەکەن؟ "هەرچیت بۆ دەرکەوت" لای کەس باسی نەکەیت تا دێیتەوە بۆ لامان.

ئەمانە و چەند ڕووداوی تریش وانیشان ئەدەن کە پێغەمبەر (ﷺ) هیچ کات دانەنیشتووە و چاوەڕوانی نەخشەی "قەدەر" بێت، بەڵکو هۆی سەرکەوتن بەسەر دوژمندا چی بوو بێت بەکاری هێناوە، کەوابوو "سیخوڕی" لەجەنگە ئیسلامییەکاندا ڕەوایە. دەوڵەتە تازەکانیش بەڕەوایان داناوە و بەلایانەوە دروستە بەکارهێنانی ئەو هۆیانە ئەبنە هۆی وەرگرتنی "زانیاری" لە دوژمن و، لە گۆڕەپانی جەنگدا "فقد نصت المادة (23) من لائحة الحرب على جواز استعمال الوسائل اللازمة للحصول على معلومات عن العدو، وعن ميدان القتال"[2].

ئینجا ئەم سیخوڕە پێویست ناکات موسڵمان بێت، وە پێویست ناکات سەربازێك بێت لەناو سوپای ئیسلامدا، بەڵکو ئەگەر موسڵمان نەبێت و لە دوژمن خۆی بێت پتر سەرکەوتوو ئەبێت بەسەر ئیشەکەیدا و ئەتوانێ بڕواتە ناو کۆمەڵ و کۆڕەکانەوە... دیارە بۆ ئەم کارەیش دروستە لە بوونجەی موسڵمانان شتێکی بۆ دیاری بکرێ لە بەرامبەر کارەکەیەوە بەڵگەیشمان ئەمەیە: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ "ئەبوو بەکر" دا (خوا لێی ڕازی بێت) کاتێ کۆچیان کرد لە "مەککە" وە بۆ "مەدینە" پیاوێکی "موشرك" یان بەکرێ گرت... تا شارەزای ڕێگەیان بکات و بیان گەیەنێتە جێگەی خۆیان، کەوابوو جاسووسیش، ئەگەر جێگەی متمانە و بڕوا پێکراو بوو دروستە ناموسڵمان بێت. بەڵێ ئیسلام پەنجەی ڕاکێشاوە بۆ هەر شتێك هۆی سەرکەوتن و شۆڕش بێت، پێش ئەوەی قەوارەی سیاسی "خۆرهەلات و خۆر ئاوا" لە دایك بن، بۆیە بەسەربەرزییەکەوە بە دەنگی زوڵاڵەوە ئەڵێین ئیسلام "دین و دەوڵەتە، دین و ژیانە".

**سزادانی سیخوڕ**

لەچەند ڕووداوێکدا هاتووە و دەرکەوتووە کە دروستە ئازارو سزای جاسووس بدرێ بە پێی قەبارەی تاوانەکەی، نەك لەوە زیاتر:

ڕووداوی یەکەم:

بوخاری و موسلیم ئەیگێڕنەوە لە "سەلەمەی کوڕی ئەکوەع" وە ئەڵێت: "غزونا مع رسول الله هوازن، مبينا نحن نتضحى "اي نأكل ضحى: اذ جاء رجل على جمل احمر فأناخثم تقدم يتغدى مع القوم، وجعل ينظر ــ وفينا ضعفة "حالة ضعف وهزال" ورقة في الظهر، وبعضنا مشاة ــ إذ خرج يشد، فأتى جمله، فقعد عليه فانافه، فاشتد به الجمل "زاد البخاري ان النبى ــ ﷺ ــ قال: "اطلبوا فاقتلوه". قال: سلمة: وخرجت اشتد... حتى اخذت بخطام الجمل فأنخته، فلما وضع ركبته في الأرض

---

[1]) ئەویش ڕۆیشت و هاتەوە هەواڵەکەی گەیاند کە: هۆزی "هەوازن و سەقیف" لە شیوی "ئەوتاس"ن و خۆیان ئامادە کردووە بۆ هێرش هێنانە سەر موسڵمانەکان، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) بەپەلە بڕیاری هێرشی دەرکرد بۆ سەریان پێش ئەوەی ئەوان بێن بەسەر ئەماندا .

[2]) مذكرات لسامي جنينة ، ل74 .

إخترطت سيفي فضريت راس الرجل فنذر (سقط) ثم جئت بالجمل اقوده عليه رحله وسلاحه"[1]. واته: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشتین بۆ سەر هۆزی "هەوازن" کاتێ خەریکی نانخواردنی بەیانی بووین لە چێشتەنگاودا... سەیر ئەکەین حوشتر سوارێك هات و حوشترەکەی یخ داو هاتەپێشەوە دەستی کرد بە خواردن لەگەڵ خەڵکەکەدا، (ئەبینین) سەیر ئەکات "ئێمەیش لاوازی و بێدەسەلاتیمان پێوە دیار بوو بەپەلە بۆی دەرچوو سواری حوشترەکەی بوو و بە توندی لێی خوڕی "بوخاری ئەمەیشی بۆ زیاد کردووە". پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دوای کەون و بیکوژن" سەلەمە ئەڵێت: منیش بەپەلە دەرچووم بۆی و جڵەوی حوشترەکەیم گرت و خەواندم. کاتێ ئەژنۆی خستە زەوی شیرم لێ کێشاو دام لەسەری و کەوتە خوارەوە، ئینجا هاتم حوشترەکەیم لێخوڕی بە بارو چەکەکەیەوە و هێنامەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ).

ئەم جاسووسە کوژرا، ئاشکرایە موسڵمان نەبوو و خاوەن پەیمان و پەنا هەندەیش نەبوو لەلایەن موسڵمانەکانەوە، ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا بە کوشتنی و دەستبەجێ فەرمانەکەی جێبەجێ کراو کوژرا.

کەولبوومانای وایە جاسووس با ناموسڵمانیش بێت هەر ئەکوژرێ.

ڕووداوی دووەم:

پێشەوا "ئەحمەدو ئەبوو داود" لە "فوراتی کوڕی حەیانە" وە ئەگێڕنەوە کە: "ان النبی (ﷺ) امر بقتله وکان ذمیا، وکان عینا لأبی سفیان، وحلیفا لرجل من الانصار، فمر بحلقه من الانصار فقال: انی مسلم، فقال رجل من الانصار: یارسول الله انه یقول: انه مسلم، فقال رسول الله (ﷺ) ان منکم رحالا نکلهم الی ایمانهم منهم فرات بن حیان".

پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی دا بە کوشتنی "فورات"، لەکاتێکدا ئەهلی "زیممە" بوو و جاسووسی ئەبوو سوفیان بوو، وە هاوپەیمانی پیاوێکی "ئەنصار" یی بوو بەلای کوڕێك لە ئەنصاردا تێپەڕی "ویستیان فەرمانەکەی پێغەمبەر جێ بەجێ بکەن و بیکوژن" وتی: من موسڵمانم، ئینجا پیاوێکی ئەنصار وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەڵێ موسڵمانم "واتە: چی لێبەکەین، بیکوژین یان نەء" پێغەمبەریش فەرمووی: هەندێکتان ئەدەینە دەستی باوەڕەکەی، جا فوراتیش یەکێکە لەوانە. واتە کە بڕوای هێناوە لێی گەڕێن و مەیکوژن.

ئەم ڕووداوەیش ئەو وانەمان ئەداتێ کە جاسووسی ئەهلی زیممە دروستە بکوژرێ، چونکە ئەوە بوو بۆ یەکەمجار فەرمانی دا بەکوشتنی، بەڵام کە بڕوای هێنا فەرمانەکەی هەڵوەشاندەوە.

ئەبویوسف (خوا لێی ڕازی بێت) لەم ڕووداوە وە ئیجتهادی کردووە وەریگرتووە، بۆیە کاتێ هارونە ڕەشید پرسیاری ئەوەی لێکرد کە ئایا دروستە جاسووسی ئەهلی زیممە بکوژرێ؟ ئەویش فەتوای بۆ داو فەرمووی بەڵێ: "وسألت یا امیر المؤمنین عن الجواسیس یوجدون من اهل الذمة، او أهل الحرب... فاضرب اعناقهم"[2].

ڕووداوی سێهەم:

بوخاری و مسلیم لە ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوو تالیبەوە ئەیگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی عەلی و زوبەیری لەگەڵ میقداد ناردوو فەرمووی: "انطلقوا حتی تأتوا روضة خاخ فإن بها ضعینة ومعها کتاب فخذوه منها.. فأتینا به رسول الله فإنا فیه: من حاطب بن ابی بلتعة الی ناس من اهل مکة...". واتە: بڕۆن تا ئەگەنە "ڕەوضە تی خاخ"[3].

ئافرەتێکی حوشتر سواری تێدایە "ئەیەوێ بەرەو شاری مەککە بڕوا" و کاغەزێکی پێیە، بڕۆن بە خێرایی لێیوەرگرن، وە "مەهێڵێن بڕواو دەرچێ، ئەوانیش بەپەلە ڕێگەیان گرتە بەر و گەیشتنە ئەوێ و نووسراوەکەیان لێ وەرگرت، ئیمامی عەلی ئەفەرمێ: ئینجا هێنامان بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) سەیر ئەکەین (حاطەبی ئەبوو بەلتەعە) ناردوویەتی بۆ کۆمەڵێ لە "مشرك" ەکانی قوڕەیش و هەندێ هەواڵی موسڵمانەکانی نووسیووە بۆیان "وەك جاسووسێك".

---

[1]) شرح مسلم ، (ج1 ل67) .

[2]) الخراج لابی یوسف ل226 .

[3]) بە جێگایەك ئەڵێن نزیك بە شاری مەککە .

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: حاطب ئەمە چییە؟ ئەویش وتی ئەی پێغەمبەری خوا پەلەم لێ مەکە، "هەندێ بڕووبیانوی هێنایەوە" عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە با بدەم لە گەردنی ئەم ناپاکە، پێغەمبەر فەرمووی: نە ئەم پیاوە کاتی خۆی ئامادەی غەزای "بەدر" بووە "شتی وانەکەیت و شتی وایش نەڵێت پێی" تۆ چووزانی کاتی خۆی خوای گەورە بە چاوی ڕێزو سۆزەوە سەیری ئەهلی بەدری کردووە و پێی فەرموون: "اعلموا ما شئتم فقد غفرت لکم" بڕۆن چی ئەکەن بیکەن ئەوا لێتان خۆش بووم.

لەم ڕووداوی سێهەمدا ئەوەمان بۆ ڕۆشن بوویەوە کە جاسووس با موسڵمانیش بێت دروست و ڕەوایە تۆڵەی لێ وەربگیرێ بە کوشتن، هەرکات لەبەر بەرژەوەندی کۆمەڵێك جووڵایەوە، ئەوە بوو عومەر ویستی بیکوژن، پێغەمبەر نەی فەرموو دروست نییە بکوژرێ لەبەر ئەوە کە موسڵمانە، بەڵکو هەستا بیانوو و بەرگرییەکی تری باس کرد بۆ کوشتنەکەی ئەویش ئەوەیە: ئامادەی "بەدر" بووە.

بەکورتی: ئەو موسڵمانانەی جاسووسی ئەکەن بۆ دوژمن، سەبارەت بە کوشتنیان دەستەی زاناکان تیایدا قسەیان جیاوازە:

أ ـ ئیمامی شافیعی و ئیمامی مالیك (خوا لێیان ڕازیی بێت) ئەفەرموون: کاروباری ئەدرێتە دەست ئیمام و پێشەوا بۆ ئەوەی چی بەلاوە پەسەند بوو بەرامبەری بیکات.

ب) (ئیمامی ئەوزاعیی) ئەفەرموێ: "شار بەدەر "نەفی" ئەکرێت، وەیا "تەعزیر" و سەرزەنشت ئەکرێ بەپێی هەڵبژاردنی ئیمام.

ج) (ئیمامی ئەبوحەنیفە) ئەفەرموێ: ئەکرێتە بەندیخانەوە.

خوێنەری بەڕێز:

لەڕاستیدا ئازارو ئەزیەتدانی جاسووس ــ موسڵمان بێت، ئەهلی زیممە بێت، وەیا ناموسڵمان بێت ــ ئابەو شێوەیە زۆر جێگەی خۆیەتی بەتایبەت کەسێك هەستێ خۆی بکات بەئامێری دەستی دوژمن و جاسووسی بۆ بکات بەسەر برا موسڵمانەکانییەوە و قسەیان لێ بدزێ و بیانبات بۆ ئاغاکەی ! !.

جاسووسی کارێکی زۆر قێزەون و، ئیشێکی زۆر نامەردانەیە و، نامرۆڤانەیە بۆیە، ئیسلامی خاوەن بەزەیی، بەهیچ شێوەیەك بەزەیی پیایاندانایەتەوە و لەسەر زەویدا ناهێڵێ بژین.

کەوابوو داوا لە هەموو براو خوشکێك ئەکرێ خۆیان نەکەنە سووتەمەنی دۆزەخ لە قیامەتدا، لە دنیایشدا لاپەڕەیەکی ڕەش بۆ خۆیان تۆمار نەکەن وخۆیان نەخەنە بەر نەفرینی مێژوو و خەڵکی.

## کوشتنی کتوپڕی "القتل غیلة"

یەکێ تر لەو خاڵە گرنگانەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام هێناویەتی بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد مەسەلەی "ئیغتیال"ە، واتە یەکێ بنێرێتە وڵاتی دوژمنەوە بە نهێنی، وەیا بە ئاشکرا بڕواتە ناویانەوە و ئینجا وا نیشان بدات کەلەسەر ئایینی ئەوانە، وەیا دڵسۆزیانە تاهەلی بۆ هەڵکەوێ، ئەوجا ئەوەی مەبەستی بێت بیکا... ئەمە لە یاسای ئیسلامدا ناڕەوایە و نا دروستە، یەکێ لە زاناکانی ئیسلام ـ کە بە مەزهەبی ئیمامی مالیك ڕەفتار ئەکات ـ بە ئاشکرا دان بەم کارەدا ئەنێ و ئەڵێت: "ولیس منها (یعنی الخدع الجائزة أثناء الحرب) أن یظهر لهم أنه منهم او علی دینهم أوجاء لنصحهم حتی إذا وجد غفلة نال منهم فهذه خیانة لاتجوز"[1]. واتە لەو یاسا جەنگییانە نییە کە چاوپۆشی تێدا کراوە بەکارهێنانیان لە کاتی جەنگدا ئەمە کە: کەسێك بڕواتە ناودوژمنەوە و هێمنیان بکاتەوە وخۆی وا نیشان بدا کە ئەندامێکە لەوان، یاخود دڵسۆزی ئەوانە... تا هەلی بۆ دەست بدات ئینجا مەبەستەکەی جێبەجێ بکات، ئەوە ناپاکییەو دروست نییە.

---

[1] ) قوانین ابن حزم ،ل155 .

یاسای دەوڵەتانی جیهانی ئەمڕۆیش دەستیان ڕاکێشاوە بۆی و لەماددە (23) دا ئەڵێت: ئەوە دەوڵەتەی جەنگ ئەکات لەگەڵ دەوڵەتێکی تردا بۆی ڕەوا نییە پیاوێك بنێرێ ـ بەکرێ بێت یا بە خۆڕایی ـ بۆ کوشتنی یەکێ لە ئەندامی دەوڵەتەکەی تر بەبێ ئاگاو بەنهێنی. ئەم یاسایەیان داهێنا... بۆیە ئینگلترە کاتێ جەنگا لەگەڵ "سودان" دا سامانێکی دیاری کرد بۆ ئەوەی بڕوا "کەللە سەر"ەکەی "عثمان دجنە" ـ یەکێ لەسەرکردەکانی سوپاکەی مەهدی ـ بێنێ.. لەلایەن دەوڵەتانەوە ڕەخنەی هاتە سەر ناچار بڕیارەکەی هەڵوەشاندەوە [1].

## جەنگی دەروونی

لە سەدەکانی ئەم دواییەدا بەڕەوا بینراوە بەکارهێنانی هەر هۆیەك ببێتە هۆی بێ هێز بوونی دوژمن، لە قسە، لەکردار، تەنانەت با درۆیش بێت، وە بۆ ئەم مەبەستە هەموو جۆرەکانی ڕاگەیاندن (اعلام)، تەنانەت بڵاو کردنەوە و فڕێدانی بەیان بە فڕۆکە و شتی وا بە ڕەوا دراوە، وە لەم ڕێگەدا دارایی و سامانێکی زۆر خەرج ئەگرێ... تەنانەت لە زۆربەی دوڵەتاندا "وەزارەت" کرا بوویەوە بۆ ئەم مەبەستە، تا لەم دوا دواییەیشدا پیان ئەوت وەزارەتی پڕوپاگەندە.. جا لەبەر ئەمە زۆر بە دەگمەن مرۆڤ هەواڵی ڕەوان و ڕاستی وەرئەگرت بەدەم ئەو دوو دەوڵەتەوە، هەرکامێکیان بگری باسی سەرکەوتن و بەختیاری خۆی ئەکات لەبەرەی شەڕەکاندا، وە باسی تێکشکاندنی ئەوی تر ئەکات !!!.

ئەم (جەنگی دەروونیە) هەموو دەوڵەتانی جیهانی ئەمڕۆ بەلایانەوە پەسەندە و بەکاریشی ئەهێنن، با بزانین ڕای ئیسلام چۆنە سەبارەت بەم کردەوەیە؟ بەڵێ ئیسلام پێش ئەوەی دەوڵەتان دروست بن پەنجەی بۆ ئەم مەبەستە ڕاکێشاوە و بەلایەوە دروستە، چونکە هەرچی هۆی تێ شکاندنی دوژمن بێت بەکارهێنانەکەی ڕەوایە، دەی ئەم جەنگی پروپاگاندەیە یەکێکە لەو هۆیانە، بەڵگەیشمان:

أ ـ ئەو فەرمودانەن کە مۆڵەتی درۆکردن ئەدەن لە جەنگەکاندا: وەك ئەو فەرموودەی بوخاری ومسلیم ـ لە ئوممی کەلثومی عەقەبەوە ـ ئەیهێنن: "لم اسمع النبی (ﷺ) رخص في شئ من الكذب مما يقول الناس الا في الحرب، و الاصلاح بين الناس وحديث الرجل امرأته، وحيث المرأة زوجها". واتە نەم بیستووە پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی درۆکردن بدات لە سێ شتدا نەبێت: لە جەنگدا، لە یەکخستنی نێوان خەڵکدا، قسەی پیاو بۆ خێزانی، یان ئافرەت بۆ مێردەکەی.

ب ـ لە جەنگی (مؤتە) دا خالیدی کوڕی وەلید شێوەو شێوازی سوپاکەی گۆڕی و ئاڵوگۆڕی هێنا بەسەر لەشکرەکەیدا و بەشی لای ڕاستی خستە لای چەپەوە، چەپی خستە لای ڕاستیەوە، بەشی پێشەوەیشی گۆڕی، ئینجا بەم ئاڵوگۆڕە دوژمن لێی تێکچوو وایزانی کە سوپای موسڵمانان یارمەتیان بۆ هاتووە، ئیتر ترسیان لێ نیشت و ئەوە بوو سەرئەنجام تێکشکان [2].

بەڵێ ئەمانە و وێنەیان نموونەی ئەوەن کە بەکارهێنانی فێڵ لە جەنگدا شتێکی ڕەوایە و دروستە، وە ئەبێ سەرکردەو فەرماندەکان وریاو زیرەك بن بۆ بەکارهێنانی هۆی سەرکەوتن.

## لەناوبردنی دارایی و سامانی دوژمن

ئەم جۆرە کردەوەیە لەکاتی جەنگدا نەبێت دروست نییە، چونکە دوای ئەوە کە جەنگەکە کپ بوویەوە هەرچی بکرێ لەگەڵیدا ئەبێتە هۆ بۆ لەناوبردنی دارایی بە ناهەق و بێجێ... دیارە ئەمەیش نە "شەریعەت" و نەژیری ناپسەلمێنێ، لەناوبردنی شتوومەکی دوژمن لەکاتی جەنگەکەدا ئەبێ بەسێ بەشەوە:

یەکەم: ئەوەیە جەنگەکە بێ لابردنی ئەو شتانە بەرێکوپێکی ناڕوا.... وەك ئەو شتانەی ئەبنە کۆسپ لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا، یا لە ڕێگەدا، وەیا دوژمن لە پشتییەوە خۆی قایم ئەکات، وە هەروەها...

---

[1] ) مذكرات لسامی جنیه ، ل72 .

[2] ) فتح الباری ( ب7 ل361 ) .

ئەم جۆرەیان دەستەی زاناکان هەموویان قسەیان یەکە لەوەدا کە دروستە، بۆیە "ئیبنی قدامه" ئەفەرمێت: "هذا یجوز اتلافه بغیر خلاف نعلمه".[1] بێ جیاوازی زاناکان دروستە لەناوبردنی ئەم جۆرە "ممتلکات"ەی دوژمن. نەك هەر ئەمەندە، بەڵکو هەندێ کات واجیب و پێویستە. وەك ئەوە کە ڕێگەی سەرکەوتن تەنها لەوێوە بێت.

دووەم: بەرژەوەندی داوا ئەکات بهێڵرێتەوە... وەك ئەو شتانەی فەوتاندنیان ئەبێتە زیان بۆ موسڵمانەکان، وەك ئەو عەمارە ئاوانە (الخزانات المائیه) کە ئەگەر لەناو ببرێن موسڵمانەکان تووشی بێ ئاوی و شتی وا ئەبن... ئەمەیشیان زاناکان قسەیان یەکە بۆ دروست نەبوونی لەناوبردنی، چونکە بەزیانی موسڵمانەکان تەواو ئەبێت.

سێهەم: بەرژەوەندی جەنگەکە نەداوای هێشتنەوەی ئەکات، نە داوای لەناو بردنی ئەکات، وەك کشتووکاڵ و مەزراکان... ئەم جۆرەیان لەسەر فەرموودەی ڕاستی زانایان دروست نییە لەناوبردنی، چونکە فەوتاندنەکەی ـ بەرژەوەندی جەنگەکە داوای ناکات ـ تەنها خراپەکاری و "افساد" ە، واتە هیچ سوودێکی تێدا نەبوو، لە قورئانیشدا زۆر جار بەرگری کردنی هاتووە لە "خراپەکاری"، (..وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ).[2]

لەپێغەمبەریشەوە (ﷺ) هاتووە ـ کاتێ سوپایەکی ئەنارد بۆ قۆڵێك ـ : "لا تهدموا بیتا، ولا تعقرن شجرة، إلا شجرا یمنعکم قتالا، او یحجز بینکم وبین المشرکین" [3].

نەماڵ بروخێنن، نە درەخت ببڕن، درەختێك نەبێ نەهێڵێ جەنگەکە بکەن... مانای وایە هەردارو درەختێك ڕێگەلە سوپاکە بگرێت لەوەی دەستی بگاتە دوژمن ئەوە دروستە لەناوبردنی "الا شجرا یمنعکم قتالا...".

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) ماڵەکانی جوولەکەی "بەنی نەزیر" ی سووتاند، هەندێ دارودرەختی ببڕین... یا بۆیە بە "مەنجەنیق" تۆپبارانی (تائیف) ی کردو هەندێ لە باخە تریکانی بڕین [4].. چونکە جەنگەکە بێ ئەم کارە سەرکەوتوو نەئەبوو بۆیە پێی هەڵسا ئەگینا هەروا لەبەر ئارەزووی دەروون و نەفس دروست نییە.

### ئایا لەناو بردنی قوتابخانە و شوێنەوارە کۆنەکان دروستە؟

بەڵێ، لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا هەر شتێك ببێ بەهۆی دواکەوتنی بەدەستهێنانی سەرکەوتن و لەناوبردنی دوژمن دروستە بەکارهێنانی، کەوابوو ئەگەر قوتابخانەیەك دوژمن سوپاو سەربازەکانی تێ برد، وەیا کردنی بە جبەخانە ئەوە هیچ تاوانی تیانییە لەناوبردنی ئەو جۆرە شوێنانە... نەك هەر ئەمەندە، بەڵکو واجیب و پێویستە.

## لەناوبردنی ئاژەڵ و گیانلەبەر

ئایا ڕەوایە لەناوبردنی ئاژەڵ وگیان لەبەری دوژمن؟ هیچ گومانی تێدا نییە کە زاناکان هەموویان یەك دەنگن لەم باسەداو بەلایانەوە دروستە کوشتن و سەربڕینی ئاژەڵی دوژمن بۆ خواردن، وەیا هەر بۆ لەناوبردنی، بۆ ئەوەی دوژمن زەبوون و بێ بەش و لات بکەوێ. (وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ..).[5] بەڵام ئەو ئاژەڵەی کە گۆشتی ناخورێ و دوژمنیش بەکاری ناهێنێ بۆ جەنگ، ئەوە بەلای هەندێکەوە دروستە لەناو ببرێن، وە بەلای هەندێکی تریانەوە دروست نییە.

### دەست بەسەراگرتن ( المصادره)

ئەو دەوڵەتەی جەنگ ئەکات لەگەڵ دەوڵەتێکی ترداو سامان و دارایشی هەیە لای ئەم دەوڵەتەکەی تر دروستە بۆ ئەم دەوڵەتە ئەو دارایی و سامانەی لێ داگیر بکات و دەستی بەسەرا بکێشێ...؟.

---

[1] ) المغنی ( ب10 ل509 ).

[2] ) (الأعراف : 74 )

[3] ) سنن البیهقی

[4] ) سنن البیهقی .

[5] ) (الأنفال : 60 )

ئەوانەی توێژینەوەی یاسای دەوڵەتان ئەکەن ئەڵێن: ڕەوایە بۆ هەر دەوڵەتێك جەنگی بوو لەگەڵ دەوڵەتێکی تردا هەرچی هەیە بەلایەوە داگیری (مصادرە) بکات، واتە موڵکە گشتییەکان (الاملاك العامە) بێجگە لە قەرز، ئەوە هەرچەند دروستە بۆ ماوەی جەنگەکە دەست بکێشرێ بەسەریا، بەڵام بۆ هەتا هەتایی نابێ داگیر بکرێ، ئەمە و هەندێ شتی تریش کە لە یاسای دەوڵەتانا ڕۆشن کراوەتەوە.

ئینجا سەبارەت بە موڵکی تایبەتی، واتە ئەو شتانەی ماڵی چەند کەسێکی تایبەتین لە دوژمن ئەوە ئەگەر بەکارئەهێنران بۆ بەرژەوەندی دوژمن ئەویش دەست ئەگیررێ بەسەریا تا جەنگەکە تەواو ئەبێت، ئەوجا ئەدرێتەوە بە خاوەنەکەی.

دوای ئەمە با بزانین بیرو ڕای ئیسلام چۆنە لەم باسەدا... ئایا ئەم کارە بە پەسەند ئەزانێ، وەیا بەستەم و داگیر کردن و زەوت کردن؟

1ـ بەڵێ کاتی خۆی هەندێ کەس ئەهێنرانە خاکی ئیسلامەوە بەناوی (وەفد)ەوە. بەماڵ و سامانەوە ئەهاتن دیارە بە شێوەی ڕەسمی وپاساپۆرتەوە، دەستەیەك بوون کە سەرپەرشتی ئەو جۆرە کارانە بکەن، جا کە مۆڵەتی کەسێکیان بدایە ئەوە لە مانای پاساپۆرتی ئێستەدا بوو... کەوابوو خۆیان و ماڵ و سامانیان پارێزراو ئەبوو لە هەموو دەستدرێژییەك بە پێی ئەندازە و ماوەی ئەو مۆڵەت و پاساپۆرتەی بۆی کراوە.

بەکورتی:

ئەو بێگانانەی هاتوونەتە وڵاتی ئیسلامەوە بەهیچ شێوەیەك دروست نییە دەست ببرێ نە بۆ خۆیان و نە بۆ دارایی و سامانیان.

2ـ هەندێ کات ڕێك ئەکەوێ ئەو بێگانانە خۆیان ئەڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و سامانەکەیان بەجێ دێڵن لای وەکیلەکانیان... بۆ ئەمەیشان هەرچوار پێشەواکان لەسەر ئەوەن کە مۆڵەت و (ئەمان) مکە هەڵناوەشێتەوە سەبارەت بە ماڵەکە، چۆن بووە هەر وا ئەمێنێتەوە، هیچ کەسێك بۆی نییە دەستی ناپاکی بۆ ببات.

3ـ ئەگەر کەسێکیان لێ مرد یەکسەرە کەلەپوورەکەی ئەڕوا بێ میراتگرەکان و هیچ کەسێك بۆی نییە لێیان داگیر بکات بە بیانووی ئەوەوە کە گوایا خاوەنە بنەڕەتیەکەی مردووە و کەوا بوو ئێستا داگیر بکرێ.

خۆ ئەگەر میرات بەریان نەبوو، ئەوە ئەو سامانە ئەبێتە ماڵی دەوڵەت، وەك چۆن ئەهلی زیممەیەك بمرێ و میراتبەری نەبێت، ئەمیش ئاوا. جا ئەم مردنە مردنی سروشتی بێت، یا بکوژرێ جیاوازی پەیدا نابێت لەحوکمەکەی پێشەوە... بەڵام (ئەبویوسف) ئەڵێت: ئەو کەسەی تیا ئەچێت دوای ئەوەی کە دیلکرا هەرچی هەیە ئەبێتە ماڵی ئەو دەوڵەتەی وا بەلایەوە. (مالیکییەکان) ئەڵێن: ئەدرێتەوە بە بنەماڵەکەی.. (شافیعیەکان)یش ـ هەندێکیان ـ ئەڵێن، هەرچی دارایی (مستأمن)[1] هەیە هەمووی ئەبێتە ماڵی دەوڵەت.

ئەمە و لەگەڵ هەندێ درێژە پێدانی تردا لە باسەکەدا... ئینجا ئەوەی ئەیەوێ پتر شارەزا ببێت با بگەڕێتەوە سەر کتێبی "العلاقات الدولية و النظم القضائية في الشريعة الاسلامية".

4 ـ ئەگەر موسڵمانێك بڕواتە خاکی ئەوانەوە ـ بێگانەکانەوە ـ ئینجا لەوێ ماڵێکی کەوتە سەر ئیتر بەهۆی کڕین و فرۆشتنەوە بێت، وەیا بەهەر هۆیەکەوە بێت , ئایا ئەم سامانە چی لێ ئەکرێ...؟ ! ! !.

مەزهەبی شافیعی و حەنەفی و حەنبەلی (خوا لێیان ڕازی بێت) پێویستە ئەو سامانە ڕەت بکرێتەوە بۆ خاوەنەکەی ئیتر هیی زەلامی تایبەتی بێت، وەیا هیی دەوڵەت بێت.

کەولبوو لە ئیسلامی پیرۆزدا (مصادرە) نییە و دروست نییە، وە ئیسلام بەجۆر ستەمێکی داناوە.

---

[1] ) وشەی (مستأمن) وە (اجانب) یەك مەبەست ئەگەیەنن، ئەویش بریتیە لە مۆڵەتدان بە ناموسڵمانێك بۆ ئەوەی بێتە وڵاتی ئیسلامەوە، بۆ بازرگانی و شتی وا . جا ئەم (مستأمن)ە پێویستە ئاگاداری یاساو ڕێژێمی ئەو وڵاتە ئیسلامییە بکات، وە ئەبێ کڕین و فرۆشتن و مامەڵەی بە گوێرەی حوکمی ئیسلام بێت ... وە هەرکات دەستدرێژی کرد ( وەك زیناو پیاو کوشتن و ... ) ئەوە حەددی بەسەرا ئەدرێ .

(وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ..)[1]

**پاراستنی نوێنەرو باڵوێزەکان**

لە کۆن و ئێستاشدا دەوڵەتان نوێنەریان لای یەکتر بووە و پەیوەندییان بووە، بەڵام ئەگەر ئەم دوو دەوڵەتە جەنگ کەوتە نێوانیانەوە نوێنەریان لای یەکتر بوو ئایائەو دەوڵەتە بۆی هەیە دەست رابکێشێ بۆ ئەو نێرراوە و بیکوژێ پاراستنی نوێنەران و باڵوێزەکان یاسایەکی کۆنە و سەلمێنراوە لە ئیسلام و پێش ئیسلامدا (ئیبنی مەسعوود) ئەڵێت: "مضت السنة أن لا تقتل الرسل"[2]. یاسا واهاتووە کە نوێنەران ناکوژرێن.

ئەمە کە نوێنەر ناکوژرێت بە ئاشکراو ڕۆشنی لە فەرموودەو کرداری پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەر ئەگیرێ، وەك:

أ ـ پێشەوا (ئەحمەدو حاکیم) و جگە لەوانیش ئەیگێڕنەوە لە (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود"ەوە کە: "ئیبنی نەووالحەو، ئیبنی ئاسال ـ نێرراوەکانی موسەیلەمە ـ هاتن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمون: "اتشهدان أني رسول الله؟ قا لا: نشهد ان مسیلمة رسول الله، فقال رسول الله (ﷺ) آمنت بالله و رسوله، لوکنت قاتلا رسولا لقتلتکما". گەواهی ئەدەن من پێغەمبەری خوابم؟ وتیان گەواهی ئەدەین کە موسەیلەمە نێرراوی خویە!! پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بڕوام بە خواو پێغەمبەرەکەی هەیە... ئەگەر نێرراوم بکوشتایە، ئێوەم ئەکوشت.

ب ـ ئەحمەدو ئەبوو داود و نەسائی و ئیبنی حەببان: فەرموودەیەك ئەهێنن کە قورەیش (ئەبوو ڕافیع) ئەنێرن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) (بۆ کارێکی خۆیان) کە ئەڕواتە ئەوێ بڕوا ئەکەوێتە دڵیەوە و ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا من لای ئێوە ئەمێنمەوە و ناگەڕێمەوە بۆ لای قورەیش، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "اني لا أخيس بالعهد، ولا احبس البرد فارجع اليهم آمنا فإن وجدت بعد ذلك في قلبك مافيه الآن فارجع الينا". واتە: من گزیکاری و گاڵتە ناکەم بە پەیمان، و پۆستە بەرەکان بەند ناکەم، کەوابوو ئێستا بە ئیمانەکەتەوە بڕۆرەوە بۆلای ئەوان، جا ئەگەر ڕۆیشتیتەوە ئەوێ و ئەوی ئێستا لە دڵتایە مابوو ئەوە بگەڕێرەوە بۆ لامان.

بەڵێ موسڵمان ناپاکی و گزیکاری ناکات لە هیچ کەسێك، ئەوەتا وەفدو پەیامبەرەکان ئەیانەوێ نەڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و لە خاکی ئیسلامدا بمێننەوە کە چی لێیان وەرناگرن! بەڵکو ئەبێ بڕۆنەوە کارەکەیان جێبەجێ بکەن جا ئەوکاتە بۆیان هەیە بگەڕێنەوە.

تەنانەت ئەگەر کافرەکان دەست بەسەرە (رەهائن) ەکانی ئێمە بکوژن ئێمە نێرراو ونمایندەکانی ئەوان ناکوژین، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: "وفاء بغدر خير من غدر بغدر"[3].

ئیسلامی پیرۆز هیچ کات دەست نابات بۆ ئەو نوێنەرو باڵوێزانەی هاتوونەتە لای و نێرراون لەلایەن دەوڵەتێکەوە، بەڵکو کارەکەیان چۆن بووە و بۆچی هاتبن ئاوا بۆی جێبەجێ کردون و ناردوونیەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

**مامەڵە کردنی چوونیەك لەگەڵ دوژمندا**

پێویستە لەسەر موسڵمانان لە گۆڕەپانی جەنگدا بەرێکوپێکی بجوڵێنەوە و بە دادگەریانە ڕەفتار بکەن لەگەڵ دوژمنیاندا، واتە زیادەڕەوی نەکەن لە وەرگرتنەوەی (قصاص) دا، بەڵگە بۆ ئەمە زۆرە.

أ ـ لە قورئاندا هاتووە: (وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ ..)[4] (وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ ..)، (وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ)، (وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا

---

[1] (المائده : 8 )

[2] ) سنن البیهقی ( ب9 ل212 ).

[3] ) فقة السنة ( ب2 ل696) .

[4] (البقره : 179 )

عُوقِبْتُم بِهِ ..).[1] ئەم کۆمەڵە ئایەتانە هەر هەموویان ئەوەیان تێدایە کە ئەگەر مرۆڤ دەستدرێژی کرایە سەری، بۆی هەیە مافی خۆی وەرگرێتەوە، ڕێك بەرێك، بێئەوەی زیادەڕەوی بکات لەکارەکەیدا.

ب ـ لە فەرمودەیەکدا هاتووە: کە ئیمامی بوخاری لە ئەنەسەوە (خوا لێی ڕازی بێت) هێناویەتی: "أن رهطا من ثمانية قدموا على النبی (ﷺ) فاجتووا المدينة، فقالوا: يا رسول الله أبغنا رسلا (بالكسر ـ الدر من اللبن) فقال: ما أجدلكم إلا أن تلحقوا باذود (هو ابل من ثلاثة الى عشرة) فانطلقوا فشربوا من أبوالها وألبانها حتى صحوا وسمنوا، فقتلوا الراعي و استاقوا الذود، وكفروا بعد أسلامهم، فأتى الصريخ النبي (ﷺ) فبعث الطلب، فما ترجل النهار (ارتفع) حتى اتى بهم، فقطع أيديهم وأرجلهم، ثم امر بمسابير فأحميت، فكحلهم بهم، وطرحهم بالحرة يستقون فما يسقون حتى ماتوا"[4].... وە لە ڕیوایەتی موسلیمدا بەم شێوەیە هاتووە: "أن الرسول إنما سحل أعينهم لأنهم سحلوا أعين الرعاة...".

بەڵێ، ئەم کردارەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی بۆ دەست نیشان کردین کە ڕەوایە (قصاص) و وەرگرتنەوەی مافی ئادەمیزاد لە مرۆڤی لە سنوور دەرچوو، هەرچەندە (مثله) ڕوویدات.

ج ـ ژیری و عەقڵ بەلایەوە هیچ ناهەموار نییە بەکارهێنانی چەکی کوشندە بۆ لەناوبردنی دوژمن، ئەگەر ئەو بەکاری هێنا، چونکە ئەگەر ئاوا نەکرێ لە بەرامبەر کارەکەی ئەوەوە ئەبێتە هۆی تیاچوونی خۆت، دەی بۆ ئەمەیش قورئانی پیرۆز ئەفەرموێ: (وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ..).[5]

بەدەست خۆتان ـ موسڵمانەکان ـ گیانتان مەخەنە تیاچوونەوە. بێجگە لەمەیش ئەگەر ئەو جۆرە چەکانە بەکارنەهێنرێن بە درێژایی ڕۆژگار موسڵمانەکان زەلیل و ڕیسوا ئەبن، ئاشکرایە خوای گەورە ڕازی نییە بە سەرشۆڕی و ڕیسوایی بروادارەکان، بەڵکو موسڵمان ئەبێت هەموو سەربەرزو بەختیاریی هەردوو جیهان بێت: (وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ).[6]

بەڵام ئەوەندە هەیە لەم جێگەدا ئەبێ بزانرێ کە هەندێ تاوان هەیە کە دوژمن بیکات ئێمە بەو شێوەیە نایکەین، وەك ئەوە موسڵمانێك بکوژن بە جادوو و عەرەق پێدانی، موسڵمانان بۆ وەرگرتنەوەی (قصاص) جادوو گەری وعەرەق بەکارناهێنێتەوە.

هەروەها ئەگەر دوژمن دەستی دایە هەندێ کاروباری نامرۆڤانە وەك (زینا) و داوێن پیسی، ئەوە ئێمە مامەڵەی چوونیەك ناکەین، بۆ نموونە زینایان لەگەڵ بکرێتەوە، نەخێر، بەڵکو هەر کەسێك لە موسڵمانەکان هەڵسێ بەکاری ئاوا، ئەوە بەپێی فیقهی ئیسلامی تۆڵەی لێ وەرئەگیرێتەوە..[7].

ئینجا سەبارەت بە دوژمننەکەیش کە هەڵسێ بەو کارە ناپەسەندانە، ئەوە بەپێی یاسای دەوڵەتان ڕەفتاری لەگەڵدا ئەکرێ و بە تاوانبار ئەدرێتە قەڵەم...

### سیاسەتی ئیسلام لە سوپادا

بەڵێ، کاری زۆر گرنگی ئیسلامی پیرۆز ڕاستکردنەوەی کارە چەوتەکانی ناو کۆمەڵە، ئەوەیە کە هەموو زەوی ببێت بە (یانەی ئاشتیی) دیارە ئەمەیش بە ئاسانی دەستنادات، چونکە هێزە شەیتانییەکان بەرهەڵستی ئەوەستن و نایەڵن بگاتە ئامانجەکەی خۆی... کەوابوو ئەبێ شتومەکی جەنگ (عدە) پێکبهێنرێ بۆ ڕەتکردنەوەی هێرشی نامەردانەیان و پاراستنی

---

[1] (البقره : 194 )
[2] (الشورى : 40 )
[3] النحل : 126 ).
[4] ) فتح البارى ( ب6 ل94 ).
[5] (البقره : 195).
[6] (المنافقون : 8 )
[7] ) الأم (ب7 ل323 ).

یاسای خوا له هێرشی دەرەوە و ناوەوە، و بۆ ئەوەی وردە وردەیش جیهان بەتەواوی لەبتپەرستی ڕزگاری بێ و ملکەچی فەرمانی خوا بێت، بۆیە ئەفەرموێ: (.. قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً..)[1]

ئەمەیش کاتێ سەرکەوتوو ئەبێ کە کۆمەڵێ پیاو (بەمانای پیاو) دروست بکرێت، پەروەردە بکرێن و چەك و جبەخانە پێکەوەنرێ و هەموو ئامێرێکی تایبەتیمان ببێ، وە زۆر بە وردی ئیش بکەین، وە دوژمنی (دەرەوەو ناوەوەمان) هەڵسەنگێنین، وە خاوەنی ڕەوشتێکی تێرو تەواو بین... کلیلی ئەمانەیش هەموو لە قورئان و فەرموودە و هەڵسوکەوتی پێشەواکانایە، واتە ئەگەر بەوردی هەنگاو هەڵگرین ئەمانەمان بەرچاو ئەکەوێ.

بەڵێ، پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) زۆر بەوردی هەنگاوی هەڵئەگرت بۆ ئەم کارەیە بۆیە هۆیەکانی سەربازی و سوپای ڕێکئەخست بەم شێوەیە:

أ ـ لاوازو زەبوون و نەخۆش و پیرو بێدەسەلاتی عەفوو ئەکردو نەیئەهێنا بۆ ناو سوپاو سەربازی پێنەئەکرد.

ب ـ دوژمنی ئاگادار ئەکرد بە جەنگ.

ج ـ ئامانجی لە جیهادا بڵاوکردنەوەی وشەی خوای گەورە بوو. ئاگاداری ئەوانەی ئەکردەوە کە خۆیان دوا ئەخست و خۆیانیان حەشار ئەدا لە هێزی سەربازیی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ ...)[2].

د ـ سزادانی دواکەوتووەکان (عقاب المتخلفين)، واتە ئەوانەی خۆیان ئەدزنەوە لە جیهاد سزای دەروونی ئەدرێن، چونکە ئیسلام داوا ئەکات لە خزم و دۆستانی ئەو کەسە، تەنانەت ژنەکەیشی کە بەهیچ شێوەیەك قسەی لەگەڵ نەکەن، هەروەك داوای لە تەواوی موسڵمانان ئەکات کە نزیکی نەکەونەوە، بەڵکو ئەبێت بە چاوێکی تر سەیری بکەن: (وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ..)[3]. داوا کرا لە موسڵمانەکان لە جەنگی (تەبووك)دا دەنگوەرگرن لە دواکەوتووەکان ئەوانیش (50) دانە ڕۆژ قسەیان لەگەڵ نەکردن، تا سەرئەنجام تەوبەیان لێوەرگیراو خوای گەورە قورئانی نارد بە تەوبەکەیان... بەڵێ سزای ئەو کاتە تەنها ئەوەندە بوو، وە تەنها سزای دواکەوتووەکان ئەدرا، ئیتر کەس هەقی بەسەر خزمو کەسو کارو تیرەیەوە نەبوو، برا لەجیاتی برا نەئەگیرا، خزمو کەسوکار نەئەگیرا، وەك ئێستا نەفامی نەبوو ئەوە لە پێش چاو هەموو لایەکەوەیە کە چی ئەکرێ بە منالْ و خاو وخێزانی و عەشیرەت و تیرەی، تەنانەت خۆراك و خواردەمەنیشی لێ ئەبرێ !!

هـ ـ پاککردنەوەی سوپا... ئیسلام داوا ئەکات لەسەرکردە وفەرماندەی هێزەکانی کە هەستن بە پاککردنەوەی سوپا لە توخم و ڕەگەزە پیسەکان، تا سوپایەکی خاوەن بڕوا بە خوا دروست ببێ و هەرهەموویان لە پێناوی عەقیدەکەیاندا بجەنگێن، ئاشکرایە ئەو کاتە سەرکەوتن بەدەستدێنن... خۆ ئەگەر سوپا پێکهات لە جۆراو جۆری مرۆڤە بێرو بڕوا نەخۆشەکان، وەهەریەکەیان لە پارتێکدا ئیشی ئەکرد، دیارە بەرهەمەکەی ڕێك بەڕێك وەك سەدەی بیستەم ئەبێت، قورئان ئەفەرموێ: (.. وَلَوْ كَانُوا فِيكُم مَّا قَاتَلُوا إِلَّا قَلِيلاً)[4] ئەوانە ئەگەر لە گەڵیشتاندا بن جەنگێکی واناکەن. کەوابوو مەهێڵن لەناو سوپادا بمێننەوە.

و ـ ئیسلام سوپاکەی دابەش ئەکات بەناوچەو شوێنە پێویستیەکانداو ئەیکات بە چەند (لەشکر) و (تیپەوە)... واتە هەروا هەڕەمەکی نابێت، بەڵکو ئەبێ تازەترین شێوە بەکاربێنێ بۆ ئەو مەبەستە، سەیرکە قورئان ئاماژە ئەکات بەمە: (وَإِذْ

---

[1] (التوبه: 123).

[2] ) سورة التوبة .

[3] ) سورة التوبة .

[4] (الأحزاب : 20 )

غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)[1] عەرەبەکان بە شێوەی هەڕەمەکی جەنگیان ئەکرد، بەڵام کە ئیسلام هاتە گۆڕەپانەوە شێوەی ڕیزکردنی داهێنا بۆ سەربازەکان... قورئان ئاماژە ئەکات بەم مەبەستەیشە: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفّاً كَأَنَّهُم بُنيَانٌ مَّرْصُوصٌ)[2]. واتە: بێگومان خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە ئەجەنگێن لە پێناوی ڕێگەی ئەودا بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و لە جەنگەکەیاندا یاساو ڕژێمیان هەیە، وە ئەوەندە بە گورجی و چالاکی و (تەنظیم) بەرامبەر دوژمن ئەوەستن وەك بینایەکی قایمی داڕێژراو وان.

ز) ئیسلام سوپاکە هان ئەدات و داوای لێ ئەکات کە هیچ کات سەرپێچی سەرکردەو فەرماندەکان نەکات، ، وە ئەبێ دامەزراو بن و خۆیان دوور بگرن لەو شتانەی ئەبنە هۆی تێکشکاندن، وە ئەبێ پەنایان تەنها بە خوا بێ و تەنها بەناوی ئەوەوە جیهاد بکەن: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفاً فَلاَ تُوَلُّوهُمُ الأَدْبَارَ * وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ)[3]. واتە: ئەی براواداران هەرکات گەیشتن بە کۆمەڵێك (لە دوژمن) دامەزراو بن و یادی خوا زۆر بکەن، بەڵکو سەرکەوتوو بن، وە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی جێبەجێ بکەن.. وە خۆتان دوور بگرن لەناکۆکی ودووبەرەکی (تا لە ئەنجامدا) بڕووخێن و هێزو پێزتان بڕوا، ئارامتان بێت، (چونکە) بێگومان خوا لەگەڵ (کۆڕی) ئارامگرەکانە.

هەروەها ئەیانترسێنێ لەپاشەڕۆژی ڕەش و ناهەموار ئەگەر لە دوژمن هەڵبێن و ڕابکەن: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفاً فَلاَ تُوَلُّوهُمُ الأَدْبَارَ * وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفاً لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاء بِغَضَبٍ مِّنَ اللّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ)[4].

ح ـ ئیسلام سوپا ئەترسێنێ لەوەی کە نهێنی و زانیاری دەربارەی لەشکرەکە بڵاوبکاتەوە، پێیان ئەڵێ: ئەوە تەنها لە ئیشی دووڕووەکان ئەکات، وە داوایان لێ ئەکات کە هەرشتێك ڕوویدا خێرا بیگەیەننە فەرماندەی گشتی سوپاکە، چونکە ئەوان چارەسەری بۆ ئەدۆزنەوە... هەروەك داوا ئەکات لە موسڵمانەکان کە هەرکات دەنگ وباسێکیان پێگەیشت پێش ئەوەی ڕەفتاری پێ بکەن بە باشی ڕونی بکەنەوە: (لَئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلاً)[5].

ط ـ ئیسلام داوا ئەکات لە فەرماندەی هێزەکان کە هەرکات دوژمنان مەیلیان کرد بۆ پەیمان (هدنە) بەستن لەگەڵ سوپای ئیسلامدا وەڵامیان بدەنەوە و بەخێرایی پەیمانیان لەگەڵ ببەستن، ئەگەر نیشانەی ڕاستییان پێوە دەرئەکەوت و نیازی خراپ و خەڵەتاندنیان نەبوو: (وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)[6]. واتە ئەگەر ئەو بێ پەیمانانە داوای پەیمان و ئاشتیان کردو مەیلیان بۆ کرد (لە جیاتی جەنگ، ئەوە تۆیش ئەی پێغەمبەر (ﷺ) وەیا هەر پێشەوایەك، داخوازییەکەیان جێبەجێ بکەو پەیمانیان لەگەڵ ببەستە، بەڕاستی خوا هەموو وتەو داخوازییەك ئەبیسێ و ئاگایشی لەهەموو نیازێك هەیە.

خاوەنی "تەفسیری کەششاف" دەربارەی ئەم پەیمانە ئەفەرموێ: ئەم کرداری فرمانە (فاجنح لها) بۆ وەڵامدانەوەی داخوازییەکەیان بۆ پەیمان بەستن و جەنگ وەستاندن: قسەی ڕاست و بەهێز ئەمەیە کە هەواڵە بە پێشەوا خەلیفەی ئەو سەردەمە ئەکرێ، ئەگەر ئەو پەسەندی کرد و بەلایەوە جەنگ وەستاندن قازانج بوو بۆ ئیسلام ئەوا ئەیوەستێنێ، خۆ ئەگەر

---

[1] ) سورة آل عمران: 121.

[2] ) سورة الصف: 4.

[3] ) الانفال 45 _ 46 .

[4] ) الانفال / 15 _ 16 .

[5] ) سوورەتی الاحزاب /60 .

[6] ) الانفال / 61 .

بەرژەوەندی ئیسلام لەنەوەستاندنی جەنگەکەدا بوو ئەوا نابوەستێنێ با چەندەها جاریش هاواریان بۆ ئاشتی و پەیمان لێ بەرز ببێتەوە. ئەمەیش دەقی پەراوێزەکەیەتی: (و الصحیح أن الأمر موقوف علی مایری فیه الامام صلاح الاسلام وأهله من حرب او سلم،ولیس بحتم أن یقاتلوا أبدا أو یجابوا الی الهدنة ابدا) [1].

ی ـ دیل و یەخسیر: ئەگەر لە جەنگەکاندا دیل و یەخسیر پەیدا بوو ئەوە ئیسلام کاروباریان ئەدا بەدەست فەرماندەوە، بۆی هەیە بێ بەرانبەر (فدیە) بەرەلایان بکات، وە یاخود بەرانبەرێکیان لێ وەرگرێ.. ئەمەیش بەگوێرەی بەرژەوەندی ئەوکاتەی ئیسلامە: "فإذا لقیتم الذین کفروا فضرب الرقاب حتی إذا اثخنتموهم فشدوا الوثاق فإما منا بعد واما فداء" [2].

ئیسلام ـ وەك چەندجار وتراوە ـ شەڕ بەکەس نافرۆشێ، ئەو (ئەهلی) کتاب و بت پەرست و ئاگر پەرستانەی دانیشتوون بۆ خۆیان و دەست ناهێنێتە بەر ڕێگەی بانگەوازەکەی ئیسلام، ئەوانە دەستیان بۆ نابرێ و جەنگیان لەگەڵ ناکرێ و بەزۆریش داوای موسڵمان بوونیشیان لێ ناکرێ، بەڵام ئەوانەی ناهێڵن بانگەکەی ئیسلام بڵاو بێتەوە و بەرهەڵستی ئەوەستن، ئەوانە جەنگیان لەگەڵ ئەکرێ، جا قورئانی پیرۆز بەوان ئەفەرموێ: "هەرکات ڕووبەڕووی ئەو کافرانە بوونەوە (لەجەنگدا) بە توندی دایانگرنەوە و مۆڵەتیان مەدەن، و مەیان هێڵنەوە بە دیل و یەخسیری تا زۆرێکی زۆرینەیان لێ ئەکوژن و دەسەلات پەیدا ئەکەن، جا ئەوکاتە پەتەکەیان توند بکەنەوە و (واتە ئیتر مەیان کوژن)، ئینجا ئێوەیش (ئەی موسڵمانەکان) دوای تەواو بوونی جەنگەکە یەکێ لەم دوو بارەتان بۆ هەیە: یا بە خۆڕای بەرەلایان بکەن وە (فیدیە) و بەرانبەریان لێ وەرمەگرن: یا بە پارەو پول یا خود دیل بەدیل.

زانا (شافیعییە) کان ئەڵێن، پێشەوا چوار شتی بۆ هەیە لەگەڵ دیلەکانا بیکات، وە هەر کامێکیان قازانجی زیاتر بوو بۆ ئیسلام ئەوەیان هەڵئەبژێرێ.

ا ـ بیکوژێ ئەگەر موسڵمان نەبوو، (چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دوو دیلی کوشت لە دیلەکانی بەدر)

ب ـ بەخۆڕای بەرەلایان بکات، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەبووعیزەتی جەمەحی و ئومامەی بەرەلا کرد.

ج ـ فیدیە و بریتیان لێ وەرگرێ، چونکە هەر پیاوێکی بەردا بە دوو پیاو.

د ـ بیان کات بە بەندە.....

هەندێ لە زاناکانی تر کوشتنی دیل بەلایانەوە دروست نییە [3].

ك ـ ئیسلامی پیرۆز مامەڵەی لەگەڵ (دیل و یەخسیردا) دادگەرانەیە... ئەوەتە موسڵمانەکان لە (بەدر)دا (70) کەسیان لە قوڕەیش دیل کرد، (68)یان دابەشکران بەسەر هاوەلاندا و پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی "استوصوا بالأساری خیرا" واتە چاك بن بۆ دیلەکان.

ئینجا ئەوەی دەوڵەمەند بوو بەسامان خۆی ڕزگار کرد، ئەوەیشی هەژار بوو، بەشێکیانی بەرەلا کردن بەخۆڕایی ئەوانەیشیان خوێندەوار بوون (تەکلیف)ی لێ کردن بۆ فێرکردنی منالی موسڵمانەکان (نووسین و خوێندنەوە). دوایش بەرەلای کردن.

بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا بە کوشتنی دوو کەسیان (نەضیری کوڕی حارث) و(عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیط)، چونکە ئەمانە ئەشکەنج و ئازاری چەوساوەکانیان زۆر دابووکاتی خۆی... کەوابوو ئێستا کوشتنەکەیان لەبەر زۆری تاوانە کۆنەکەیانە، نەك لەبەر ئەوە کەدیلن، وەك هەندێ لە تانە لێدەرەکان ئەڵێن!

---

[1] ) الکشاف (ب2 ل166).

[2] ) سوورەی محمد (ﷺ) ئایەتی ( 4 ).

[3] ) التفیسر الواضع ( ب3 ، ل 23 .

ئەمانە بەپێی یاسی تازە پێیان ئەڵێن تاوانباری جەنگ (مجرمی حرب) نەك دیل.

بەڵێ ئیسلام لەگەڵ دیلدا ڕەفتاری ئاوایە، ڕێزی لێ ئەگرێ، بەڵکو پلەیشی بەرز ئەکاتەوە. ئینجا ماوەتەوە بارمتە (رهائن)، بۆ ئەمەیشیان قورئان ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَخُونُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ)[1]. گزیکاری لە سوپاردەتان مەکەن، ئاشکرایە بارمتەیش ئەمانەت و سپاردەیە. کەوابوو نابێ بێڕێز بکرێ...)[2].

ل ـ بریندارو کوژراو: هەندێ لە دیلەکانی (بەدر)دا بریندار بوون، ئینجا موسڵمانەکان هەڵسان بە چارەسەرو تیمار کردنیان بێ جیاوازی، نەك هەر لە (بەدر) دا بەڵکو لە هەموو جەنگەکانیاندا هەروابوون.

سەبارەت بە کوژراوی دوژمن... موسڵمانەکان هەستان بە شاردنەوەی کوژراوەکانی بەدریان، هەروەك چۆن (شەهید) ەکانی خۆیانیان شاردەوە.. واتە لە ئیسلامدا ڕێزی ئادەمیزاد هەیە هەرچی ببێت. موسڵمانەکان ئاوا ڕەفتاریان کرد، بەڵام خوانەناسەکان گوێ و لوتی شەهیدەکانی (ئوحود) یان بڕی ! ![3].

ئینجا با بڕۆینەوە سەر باسی چەك و جبەخانە و خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ.

**یەکەم: پێکەوەنانی شتومەکی سەربازیی ( اعداد العدة )**

خوای گەورە و بەدەسەلات ئەفەرموێ: (وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ)[4]... ئەم ئایەتە قورئانییە داوای ئامادەکردنی هێزو دەسەلات ئەکات بۆ ئەوانەی خاوەن پەیمان نین و ئەیانەوێ موسڵمانەکان بخەڵەتێن و هەموو کات خۆیان مەڵاس داوە بۆ بڕوادارەکان... دیارە ئەمە هەرچی ژێری ئادەمی بۆی بڕوا (لە ئامێری تیر ئەندازەی) ئەیگرێتەوە، چونکە قورئان داوای ئامادەکردنی هێز ئەکات، وە کاتی خۆیشی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: مەبەست بە ئەو هێزە: تیر ئەندازییە، کەوابوو ئەگەر لەو سەردەمەدا "تیر" باو بوویێ ئەیگرێتەوە، هەروەك ـ بۆ ئێستا ـ تۆپ ـ بەهەموو جۆرەکانیەوە ـ و مووشەك و بومبای ئەتۆم... ئەگرێتەوە.

دیسانەوە ئایەتەکە ئەفەرموێ: (وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ) واتە ئەوەی هۆی پەیوەندی جەنگەکە بێ وەك (حوشترو ماین و ئەسپ و...) لەو سەردەمەدا ئامادەی بکەن، چونکە ئەوکاتە دوژمنی موسڵمانەکان هەر ئەوانەیان بوو، دیارە مەبەست لەم ڕستەیە (وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ) ئەو شتانەیە کە بەئاسانی کەلوپەل و خواردن و خۆراك بگەیەنێتە ناو جەرگەی جەنگەوە، کەوابوو بۆ ئەمڕۆ هەرچی ئەو جۆرە شتانەن کە مرۆڤ سواریان ئەبێ وپێیان ئەگاتە ئەوێ، هەر هەموویان بەرئەکەون. واتە چەند جۆری ئۆتۆمۆبیل هەیە وپەیوەندی بەجەنگەوە هەیە ئەبێ هەمووی ئامادە بکرێ، هەروەك کەشتی و ژێر دەریاییەکان و فرۆکە و تانك و زرێ پۆش و...، هەموویان ئەگرێتەوە، خۆ ئەگەر جەنگی دەریایشمان تووش بووئەوە ئەبێ هەرچی هێزی دەریاییە ئامادە بکرێ.

ئەم ئایەتە (وَأَعِدُّواْ...) فرمان ئەدا بە ئیمانداران بە ئامادەکردنی هێز بە گوێرەی توانین، کەوابوو پێویستە لەسەر تەواوی کۆمەڵ هەرچی وزەی تێدایە بیخاتە ڕێ بۆ وەدەست هێنانی ئەو ئامێرە سەربازیانە.

پێویستە شتێکی تر لەم ئایەتەدا سەرنج بدرێ، ئەویش ئەمەیە کە خوا بۆیە داوای ئامادەکردنی هێز ئەکات تا کافرەکان بترسن وبەو هۆیەوە شەرم بییان گرێ و هێرش نەهێننە سەر ئیسلام ئەمەیش کاتێ ئەبێ ئێمە لەوان دەسەڵاتی سەربازیمان زیاتر بێت.. کەوابوو ئەبێ موسڵمانان هەوڵ بدەن گەورەترین هێز لە جیهاندا وەدەست بهێنن بۆ ئەوەی (دار الحرب) هەرهەمووی، لەگەڵ جۆری جیاوازییدا بترسێت، دەی ئەمەیش کاتێ ئەگونجێ موسڵمانان خۆیان چەك دروست بکەن، نەك لەمو لەو بیکڕن، چونکە ئەگەر لە (زەیدو عەمر) وەری بگرن هیچ کات ناگونجێ ئێمە لەوان بالادەست تر بین.

---

[1] الأنفال : 27.

[2] ) الرسول القائد ( ل335 _ 336).

[3] ) الرسول القائد ( ﷺ ) .

[4] ) الأنفال: 60 .

بەپێی ئەم ڕاڤەمان بۆ ئایەتەکە ئەبێ موسڵمانان باڵادەست ترین لە دوژمنانیان لەم خاڵانەدا:

1ـ هێزی سەربازیی و چەك و جبەخانە و هۆی گواستنەوە و هەمووجۆرە پێویستیەکانی سەربازیی (دەریایی) و وشکانیی ئاسمانیی).

2ـ ئەبێ خۆمان ئەم کارگانەمان بیێ کە ئەبنە هۆی پێشکەوتن و باڵا دەست بوونمان.

3ـ ئەبێ هەرچی هێزو پێزی کۆمەڵ بخرێتە ئیشەوە بۆ بەدەست هێنانیان.

لە ئایەتەکەدا گەلێ مانای تریش بەرچاو ئەکەون وەك ئەوە کە پەیدا کردنی "هێز" لەبەر خاتری "ئاشتیە" لە وڵاتدا، چونکە کە دوژمن تۆی بە لاواز بینی هێرشت بۆ دێنێ و هێمنی ئەڕوا. دیارە مەبەست لەم ئاشتیەش، ئاشتیی سەراسەری جیھانە بە تێکڕا.

**دووەم: دروستکردنی پیاو**

بەڵێ ئەم باڵادەست بوونی سەربازییەمان، چ ئامێریی، چ نائامێریی پێویستی بە کۆمەڵە "پیاو" ێکی کارامەی مەشق پێکراو "مدرب) هەیە، کۆمەڵە "پیاو"ێکی لێهاتوو پسپۆڕ بن بەمەشق دادانەوە، پسپۆڕ بن بە لێخوڕینی فڕۆکەوە، پسپۆڕ بن بە کاروباری دەریاییەوە، تایبەتمەند بن لە هەڵسوڕاندنی جەنگەکاندا و ڕێکوپێك کردنی ئازوقە و شتی دواوە بۆ سەربازەکان، ئەو پیاوانە خاوەنی چەند تاقیکردنەوەیەکی سەربازیی و سوپایی بن، دیارە تا ئەمانەمان بۆ پێکدێت پێویستمان بە هەوڵێکی زۆر زۆر هەیە لەگەڵ دەسەڵاتدا، وە ئەمە کە ئێمە ئەیڵێین ناگونجێ تا کۆمەڵ و گەل هەمووی بیێ بە جەنگاوەر و ئامادەیی جەنگ بیێ... بۆیە قورئانی پیرۆز بانگ ئەکات لە تەواوی براوادارانی بۆ ئەوەی ئامادەیی وەرگرن و خۆیان ڕێکبخەن و هەمووکات لە پارێزدا بن بەرامبەر بە دوژمنیان، وە داوای لێ ئەکات کە بەپێی پێویستی وڵات و ناوچەکە پەلاماری جەنگەکە بدەن، ئەگەر (سەرانسەری) یا کەمتر پێویست بوو، وەیا کاتەکە (نەفیری عام) ی هەڵئەگرت ئەوە ئەبێ ئامادە بن بێ سەرپێچی و خۆ دزینەوە: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ فَانفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُواْ جَمِيعاً).[1] واتە: ئەی بڕوادارەکان پارێز وەرگرن لە دوژمنانتان، وە هەموو کات ئامادەیی وەرگرن بۆیان (نەوەك فورسەت بێنن لێتان" ئێوەیش دوای ئەوە چیتان پێ ئەکرێ؟) کەوابوو بڕۆن بە کۆمەڵ کۆمەڵ (وەك سریە سریە و...) وەیا هەر بە تێکڕا و هەمووتان. واتە بزانن فەرماندەکەتان فەرمانی چۆنە و سیاسەتی ناوچە چی هەڵئەگرێ ئاوا بکەن.

(وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً).[2] واتە بەیەکدەست و یەکدەنگ بجەنگێن لەگەڵ هاوەڵ بڕیاردەرەکاندا، هەروەك ئەوان لەگەڵتاندا ئەجەنگێن بەیەك دەنگ.

بەپێی ئەم ئایەتە پێویستە لەسەر موسڵمانان ـ پیاوو ئافرەت و منالْ ـ بە تێکڕا ئامادە بن بۆ جەنگ لەگەڵ دوژمندا... بۆیە ئیسلامی پیرۆز داوا ئەکات و بە سووننەتێکی گەورەی دائەنێ کە منالّەکانمان فێری (تیر ئەندازی و مەلەوانی و سواریی)[3] بکەین... ئەمە سەبارەت بە منالْ ئینجا بۆ ئافرەتانیش ئیسلام ئەفەرموێ: هەرکات هێرش هێنرایە سەرخاکی ئیسلام پێویست ئەبێ لەسەریان کە بڕۆن بۆ جەنگ، تەنانەت با مێردەکەیشی ناڕەزا بێ، دەی باشە ئەگەر هیچ لە چەك نەزانێ و شێوەی جەنگ شارەزا نەکرابێ چۆن بڕوا بۆ جەنگ...؟! ئاشکرایشە ئیسلام بۆیە داوای بەشداریان لێ ئەکات کە ئەوان فێر کرا بن. کەوابوو موسڵمانان ئەبێ هەموویان (موجاهید) و جەنگاوەر بن، و پێویستە هەموو جۆرە پسپۆڕێکیان تیا بێت بۆ هەمووجۆرەکانی هۆی جەنگیی.

---

[1] (النساء : 71 )

[2] (التوبه : 36 )

[3] ) ئاشکرایە ئەو سوارییە بۆ ئێستا لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل وهۆ جەنگیەکان ئەگرێتەوە .

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: "إرموا بنى اسماعيل فإن أباكم كان راميا".[1] واتە: ئەی ڕۆڵەکانی ئیسماعیل تیر ئەندازی بکەن، چونکە باوکتان تیر ئەنداز بووە، و ئەفەرموێ: "وارموا واركبوا وان ترموا لحب الى من أن تركبوا..."[2]. تیر تەقاندن و سواریی فێر بن، بەڵام تیر تەقاندنەکەم پێ خۆشترە لە فێربوونی سواریی.

وە ئەفەرموێ: "من تعلم الرمى ثم تركه فليس مني او قد عصى"[3]. ئەوکەسەی فێری تیر تەقاندن ئەبێ و ئینجا لەبیری خۆی ئەباتەوە ئەوە ئەو کەسە لە ئێمە نییە.

لەم دەقانەی سەرەوەدا وەرمان گرت کە:

1ـ موسڵمانەکان ـ پیاو وئافرەت و منداڵ ـ پێویستە هەموو جەنگاوەر بن.

2ـ ئەبێ لە هەموو بوارێکی سەربازییدا پسپۆڕیان تیا بێت.

3ـ هیچ کات دروست نییە چاو لە هۆیەکانی سەرکەوتن بنووقێنن تا لاوازو بێ دەسەڵات ببن و هیچ کەسیش شەرممان لێ نەکات. وەك ئەمڕۆ.

## سێهەم: ڕێگەی بەکارهێنانی ئەم هێزە

وتمان ئەم هێزە پێکەوە ئەنرێ بۆ پاراستنی "وشەی" خوا، کەوابوو دروست نییە بەکارهێنانی لە شتێکا نەبێ کە ئەوخۆی ڕازیی لەسەر بێ، واتە لەو ڕێگەدا بەکاری بێنێ ئەو بۆی دیارییکردین وەك:

أ- بۆ کوژانەوەی ئەوجەنگانە ڕوودەدەن لە نێوان موسڵماناندا: (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)[4]... بەڵێ هەرکات لەنێوان دوو وڵاتی ئیسلامییدا یا دوو شاردا، یا دوو تیرەدا ئاژاوە وجەنگ پەیدا بوو ئەوە سوپای ئیسلامی ئەکەوێتە نێوانیانەوە ئەگەر ڕێك کەوتن باشە ئەگینا لێیان ئەدرێ تا دێنە سەر ڕێگەی خوا پەرستیی.

ب ـ بۆ ڕاستکردنەوەی ئەوانەی یاخی ئەبن و لائەدەن لە هێڵی "پێشەوا" و خەلیفە. واتە ئەو کەسانە لە فرمانی "ئیمام"ێکی ڕاست ئەڕۆنە دەرەوە بە ناهەق، کەوابوو هەرشارێك، وەیا وڵاتێك، یا هەرپارت و کۆمەڵێك هەڵسان دژی پێشەوایەکی ڕاستەقینەی موسڵمانان، وەیا دڵی نەنا بە ڕژێم و یاسای وڵاتدا ئەوە پێویستە لەسەر پێشەواو موسڵمانان ئەوانە بگێڕنەوە بۆ هەق و ڕاستیی.

ج ـ بۆ بەگژا چوونی ئەو کەسانە پاشگەز (مرتد) ئەبنەوە لە ئایینی ئیسلام، واتە ئەگەر کۆمەڵێك لە ئیسلام پاشگەز بوونەوە و هێزێکیان پێکەوە ناو بەشێك لە خاکی ئیسلامیان داگیرکرد ئەوە ئەبێ جەنگیان لەگەڵ بکرێ.

د ـ بۆ سەرکوتکردنی ئەوانەی ڕێگە بە موسڵمانان ئەگرن و ئەبنە هۆی تێکچوونی ئەمن و ئاسایشی وڵات، ئەوانە خوا دەربارەیان ئەفەرموێ: (إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ)[5].

هـ ـ بۆ جەنگاندن دژی ئەوانە لائەدەن و (انحراف) ئەکەن لە ئیسلام... دەستەی زاناکان دانیان ناوە بەوەدا کە هەر کات وڵاتێك "بانگ"ی خستە پشتگوێ جەنگیان لەگەڵ ئەکرێ، وە هەروەها ئەگەر ڕێسای "خەتەنە"ی واز لێهێنا... ئیمامی ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) جەنگا لەگەڵ ئەوانەدا زەکاتیان نەئەدا، کەوابوو هەر شارێك لە ئیسلام نشینەکان سنوورێکی

---

[1] رواه البخارى.

[2] رواه ابوداود

[3] رواه مسلم.

[4] ) الحجرات: 9.

[5] ) المائدة: 33.

خوایان شکاند، وەیا خراپەرکاری تیا بڵاوبوویەوە، ئەوە پێویستی سەرشانی پێشەواو موسڵمانانە جەنگیان لەگەڵ بکەن تا ئەگەڕێنەوە بۆ لای فرمانی خواو پێویستی یە ئاینییەکان جێبەجێ ئەکەنەوە.

و) بۆ جەنگ لەگەڵ پەیمان شکێنەکاندا... واتە هەرکات موسڵمان پەیمانیان بەست لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئەهلی کیتاب و ئەوان پەیمانەکەیان شکاند، پێویستە جەنگیان لەگەڵ بکرێ تادێنە وە ژێر پەیمانەکەیان و دەست لە پەیمانشکێنی هەڵدەگرن.

ز ـ جەنگی بەرگریی (الحرب الدفاعیه): لەهەرلایەکەوە هێرش هێنرایە سەر بستێك لەخاکی ئیسلام ئەوە پێویستە لەسەر تەواوی موسڵمانان هەستن بەجەنگ بەئەندازەی ڕەت کردنەوەی ئەو هێرشە..ئەگەر ئەوشارەی نزیکە لیێ ی بەرهەڵستی بۆنەکرا, ئەبێ شارێکی نزیکتر لێیەوە بڕوا بۆ یارمەتی وەهەروەها... ئینجا ئەگەر هێرشەکە زۆر گەورە بوو ئەوە تەواوی موسڵمانان هەوڵی بۆ بدەن ئەگینا هەموویان گوناهبار ئەبن... بۆ نموونە ئێستا هەندێ لە خاکی ئیسلام لەلایەن "ڕووس"ەوە یان لەلایەن جوولەکەوە داگیرکراوە دەی ئەمە پێویستی سەشانی ئەو شارانەیە کە نزیکن پێیانەوە هەوڵ بدەن بۆ ڕزگار کردنی، جا ئەگەر بەتەنها بە ئەوان نەئەکرا، ئەبێ موسڵمانان بەشداری بکەن: (وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ..).[1]

ح ـ جەنگی جیهادی (الحرب الجهادیة): خوا ئەفەرمووێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً..).[2] واتە: ئەی بڕواداران بجەنگێن لەگەڵ ئەو خوانەناسانەدا نزیکتانن و شارەکانیان نووساوە بە شارەکانتانەوە، وە با توندو تیژیتان تێدا بەدی بکەن تا شەرمتان لێ بەکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای هەق و ڕاستیی.

جەنگ لە ئیسلامدا بۆ هێمنی و ئاسایشە، بۆ ئەوەیە بە ئاسانی بانگەوازەکەی خوا بڵاوبکرێتەوە، واتە تەنها بۆ ئازادی بڵاو کردنەوەیە، نەك بۆ ئەوە بە زۆر بڕوا بێنێ بە مرۆڤەکان، نزیکەکان لە موسڵمانەکان لەوکاتەدا (ڕۆم و فارس و هەندێ تیرەی عەرەب) بوو، ئەوانیش زۆر جار نیازو نییەتیان خراپ بوو لەگەڵ موسڵمانەکاندا... ئینجا خوا فەرمووی پێش ئەوەی دوور بکەونەوە دوژمنی ژێر باڵتان ژیر بکەن و تەمێ خواریان بکەن.

ئاشکرایە ئەمانەی سەرەوە باسمان لێکردن پێویستیان بە هێزو چەکەمەنی و پیاو هەیە، دیارە ئەمانەیشمان بۆیە ئەوێ تا (هەیبەت) و دەسەڵات پەیدا بکرێ بۆ پیادەکردنی فەرمانەکانی خواو سنوورەکانی بێ ئەوەی ترسی لە هی کەسێك ببێ.

### چوارەم: پەروەردەیەکی تایبەتیی

بێگومان جەنگە ئیسلامیەکان جیاوازن لە ئامانجی ڕژێمە دەستکردەکان... خەڵکی تر ئەجەنگێن لە پێناوی نەتەوایەتی و، نیشتمانی و، دەمارگیریی و، ڕەگەزپەرستی و، ڕەنگ و، نەژاد و، دارایی و، هەر بەرژەوەندییەکی تری ناو کۆمەڵ. بەڵام موسڵمان نابێ لە پێناوی هیچ شتێکدا بجەنگێ تەنها لەبەر خاتری وشەی خوا نەبێت، واتە کاتێ تێ ئەکۆشێ لە پێناوی (کەرامەت) یا هەر لەبەر ئەوەیە ئەگەر جەنگا لە پێناوی (حکومەت)ەکەیدا هەرهەمان نیازی هەیە.

کەوابوو هەموو جەنگێکی ئیسلامیی ئەبێ بە دەوری ئەم ئایەتەدا بسووڕێتەوە و نابێ لە سنووری دەرچێ (.. حتى لاتكون فتنة ويكون الدين كله لله... ). بۆیە پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێ: "من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله". بەرهەمی ئەمەی سەرەوە ئەمە بووکە: ئەو پەروەردەیە ئەکرێ بۆ موسڵمانی جەنگاوەر ـ کە ئەبێ هەموو موسڵمانێك جەنگاوەر بێ ـ پەروەردەیەکی تایبەتی وئامانجیشی جیاواز و تایبەتیە، بۆیە سەرئەنجامیش جەنگاوەری بڕوا دارو بێ بڕوا جیاوازیان زۆرە، سوپای کافر وا ئەیخەنە مێشکیەوە کە جەنگەکەی لەبەر خاتری نیشتمان و بەرز بوونەوەی ئاڵاکەیەتی... زۆر جار بەتەماع و پارەو پوول جەنگی پێ ئەکەن، وەیا ناوی لەناو "شەهید"ەکانا تۆمار ئەکرێ....!!.

---

[1] البقرة: 190.

[2] التوبة: 123.

کەولبوو موسڵمان هەرلەبناغەدا لەگەڵ کافردا جیاوازە، بۆیە ئەبێ پەروەردەکەیشی جیاواز بێ و تایبەتی بێت. ئەمانەیش چەند خاڵێکن بۆ پەروەردەی جەنگاوەری موسڵمان:

1ـ پەروەردەی لەسەر گوێڕایەڵی و پیادەکردنی فەرمانی خوا بێ، وە هیچ کات لە نەخشەی خوا نابێ لابدات و پێویستە هیچ کات نەگۆڕێ: (وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ..)[1] وە ئەم گوێڕایەڵییە پێویستە لە نهێنی و ئاشکرادا بێ: (وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ الَّذِي تَقُولُ وَاللّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ وَكَفَى بِاللّهِ وَكِيلاً)[2]. واتە هەندێکیان خوویان وایە، تا لەلای تۆدان ئەڵێن ملکەچین، کەچی کەلای تۆیان بەجێ هێشت تەگبیرو ڕاوێژێکی تر ئەکەن، و بەشەو کۆئەبنەوە (و چەندان تەڵە ئەنێنەوە) لە کاتێکدا خوا هەمووی ئەڵێ بە تۆو ئاگادارت ئەکات (واتە لێیان مەترسە) کەوابوو وێڵیان بکە و تۆیش پشت ببەستە بە خوای خۆت، تەنها خوایش بەسە بۆ پشت پێوە بەستن. ئەم پەروەردەیە گوێ ڕایەڵییە لەهەموو کاتێکدا:

(بايعنا رسول الله (ﷺ) على السمع والطاعة في العسر واليسر والمكره والمنشط..). واتە: وا پەیمان و بەیعەتمان بە پێغەمبەر دا (ﷺ) کە لەکاتی تەنگانەو خۆشی و ناخۆشیدا گوێڕایەڵی بکەین.

ئەم گوێڕایەڵیەش کاتێ واجیب و پێویستە گوناهوو تاوان نەبێت (على المرء المسلم السمع والطاعة فيما احب وكره الا ان يؤمر بمعصية فإن أمر بمعصية فلا سمع ولا طاعة)[3].

وە ئەفەرموێ: "من أطاعني فقد اطاع الله ومن عصاني فقد عصا الله ومن يطع الأمير فقد أطاعني ومن يعص الامير فقد عصاني"[4]، واتە ئەوی گوێڕایەڵی من ئەکات ئەوە گوێ ڕایەڵی خوای کردووە، وە ئەوەی سەرپێچیم ئەکات، ئەوە سەرپێچی خوای کردووە، وە هەرکەسێك فەرمانبەرداری (ئەمیر) بکات ئەوە هیی منی کردووە، ئەوەیش سەرپێچی لێ بکات ئەوە سەرپێچی منی کردووە. یان ئەفەرموێ: "من خرج من الطاعة وفارق الجماعة، فمات مات ميتة جاهلية".

وە ئەفەرموێ: "اسمعوا وأطيعوا وان استعمل عليكم عبد حبشي كأن راسه زبيبة ما أقام فيكم كتاب الله".[5] بەڵێ، بەپێی ئەم ئایەت و فەرموودانە زاناکان ئەڵێن گوێڕایەڵی بۆ سەرۆك و پێشەوا (فەرزە) لەکاری پەسەندو (مەعروف) دا، تەنانەت ئەڵێن ئەگەر فرمانیدا بە کردنی شتێك (موباح) و حەڵاڵ ملکەچی و گوێ ڕایەڵیی پێویستە بۆی.

پێویستە ئەم خاڵەیش ـ لەم شوێنەدا ـ پێش چاو بگیرێ کە: سەربازی موسڵمان گوێڕایەڵییەکەی لەپلەی یەکەمدا بۆ (ئەمیرولمۆمنین)ە، ئینجا لە پلەی دووەمدا بۆ ئەو فەرماندەیە سەروکاری ئەکات لەجیاتی ئەمیرولمۆمنین... جا کە هەرکات ئەم "ئەمیر" ەی ویستی دژی "ئیمام" هەستێ (بەناهەق) ئەوە بۆی ڕەوایە بیکوژێ: "من أتاكم وأمركم جميع على رجل واحد يريد ان يشق عصاكم أو يفرق جماعتكم فاقتلوه"[6].

2ـ پەروەردەکەی وابێ متمانەی تەواو پەیدا بکات کە "تەمەن" لای خوا دیاریکراوە، نەلە جەنگا، وە نە لە ئاشتیدا تەنها چرکەیەك پاش و پێش ناکەوێ، وە ئەو ئەندازە تەمەنە بۆت دیاریکراوە هەر ئەیبەیتە سەر: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّواْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلا أَخَّرْتَنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ قُلْ مَتَاعُ الدَّنْيَا قَلِيلٌ وَالآخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَى وَلاَ تُظْلَمُونَ فَتِيلاً * أَيْنَمَا

---

[1]) سوورەی محمد (ﷺ).

[2]) سوورەی النساء: 81.

[3] أخرجه الخمسة

[4] رواه البخاري ومسلم والنسائي.

[5] رواه البخاري.

[6]) رواه مسلم . لە پێشەوە مانا کراوە .

تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ )[1]. واتە: ئایا تەماشای ئەو کەسانە ناکەی پێیان وترا: دەست لە جەنگ (هەراو ئاژاوە) هەڵبگرن، وە نوێژ بکەن (بەرێکوپێکی) زەکات بدەن (و هەوڵ مەدەن بۆ زیندوکردنەوەی ئەو جەنگانە لەسەردەمی نەفامیدا ئەکران کەچی هەر ئەوان داوای جەنگیان ئەکرد) دەی کاتێ جەنگ (فەرز کرا) لەسەریان (دوای کۆچکردن) کەچی تاقمێکیان لێیان ئەترسان (لە کافرەکان) هەروەك لە خوا بترسن، نە بەڵکو پتر لەویش، وە ئەیان وت خوایا بۆچی (جەنگت دا بەسەرماندا، بۆ مۆڵەتت نەداین تاماوەیەکی کەمو نزیك (تا بەڵکو ماوەیەکی ژیانمان ببردایە سەر) تۆ بڵێ: ئەی محمد (ﷺ) ژیانی دنیا لەزەتێکی زۆر کەمە (لەچاو هی قیامەتدا) ئەو ژیانەی تر باشترە بۆ ئەو کەسەی لە خوا بترسێ (جا هەموو کەسێك پاداشتی ئەدرێتەوە) وە بە ئەندازەی ئەو دەزوولە باریکە لە ناوەڕاستی "ناوکە" خورمادا هەیە ستەمتان لێ ناکرێ... کەوابوو مرۆڤ نابێ لە مردن بترسێ، چونکە لە هەر شوێنێکدا بێ مردنتان ئەگاتێ با خۆتان بخەنە ناو کۆشك و (بورج) ی زۆر قایمکراوەوە. وە خوا ئەفەرموێ: (الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا قُلْ فَادْرَؤُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ[2] واتە: (دووڕووەکان) ئەو کەسانەن بە براکانیان (ئەوانەی هاوڕەگەزو هاوئاینن) ئەڵێن، وە (خۆیان دانیشتوون نەڕۆیشتن بۆ جەنگ لە ترسی مردن) ئەگەر بە گوێی ئێمەیان بکردایە نە ئەکوژران! ! دەی تۆیش بڵێ: ئەی محمد (ﷺ) دە ئەگەر ڕاستە هەر کەسێك نەڕوا بۆ جەنگ نامرێ) دەی مردن لە خۆتان لادەن ئەگەر ڕاست ئەکەن.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِي الأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُوا لِيَجْعَلَ اللَّهُ ذَلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ)[3]. واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناو (ئێوە) وەك ئەو کافرانە مەبن (و ڕێگە هەڵە مەکەن و بە باشی تێ بەگەن) ئەوان کاتێ برا هاو ئاینیەکانیان، یا هاو ڕایەکانیان بڕۆیشتنایە بۆبازرگانی یان کاسبیکردن یان جیهادکردن ولە ڕێگەدا بمردنایە، ئەیانووت ئەگەرلای ئێمە بمانایەنەوە نەئەمردن وە نەئەکوژران! ! بۆیە وایان ئەوت ببێ بە داخ و حەسرەت و بڕواتە ناودڵیانەوە... بڕوادارەکان ئێوە وا مەکەن چونکە تەنها خوایە زیندەگی و مردن ئەبەخشێ.

3ـ پێویستە پەروەردە بکرێن کە یارمەتی تەنها بەدەست خوایە، نەك بەزۆری ژمارەو چەکە، (كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ)[4]. واتە: (ئەی خەڵکینە ژمارەی زۆری ئەوان چەواشەتان نەکات چونکە) زۆر جار کۆمەڵێکی ژمارە کەم سەرکوتووە بەسەر کۆمەڵێکی ژمارە زۆرو چەك زۆردا (ئەمەیش) تەنها بە هێزو دەسەڵاتی خوای بە توانا، وە خوایش لەگەڵ ئارامگرانایە.

ئەمەیش مانای ئەوە نییە کە دەست لە هەموو ئامێرە جەنگییەکان هەڵگرین، نەخێر ئەبێ هەموو هۆ جەنگییەکان ئامادە بکەین، وە ئەبێ تەنها بە خوا پشتببەستین: (وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئاً )[5]. واتە بیر لە بەرسەرهاتی جەنگی "حونەین" بکەرەوە کاتێ کە زۆریتان سەرگەرمی کردن (و واتان زانی چونکە زۆرن سەرکەوتنتان مسۆگەرە" کەچی هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندن.

کەوابوو ئەبێ مرۆڤ هەموو شتێك ونیازو نییەتی ببەستێ بە خواوە، ئەگەر ئەو یارمەتی نارد ئەوا سەرکەوتوویش ئەبێ، خۆ ئەگەر نەی نارد ـ لەبەر هەر هۆیەك بێت خۆی ئەیزانێ ـ سەرکەوتن نایەت با کەرەستەی جەنگیشمان تەواو بێ.

---

[1] ) النساء : 77ـ78.

[2] ) آل عمران ( 168 ) .

[3] ) آل عمران / 156 .

[4] ) البقرة / 249 .

[5] ) آل عمران /

خوا ئەفەرموێ: (إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ).[1] واتە: ئەگەر ئێوە یارمەتی "ئایینی" خوا بدەن خوایش یارمەتی ئێوە ئەدات و دامەزراویشتان ئەکات و ناهێڵێ لەڕاستی بترازێن.

(وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ * الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ) (الحج: 41 ـ 40).[2] خوای گەورە سوێند ئەخوا بەزاتی خۆی کە: ئەو کەسەی یارمەتی ئایینەکەی ئەو بدات ئەویش سەری ئەخات و یارمەتی بۆ ئەنێرێ (وە بالادەستی نییە)، چونکە بێگومان خوا زۆر بەهێزو لێهاتووە. جا ئەوانە خوا یارمەتیان ئەدات ئەو کەسانەن کە ئەگەر دەسەلاتمان پێدان (ئەم چوارشتە ئەکەن):

أـ نوێژ بە شێوەیەکی زۆر تێرو تەواوی ئەکەن.

ب ـ زەکات ئەدەن.

ج، د ـ (فرمان ئەدەن بە چاکە) وە (بەرگریی ئەکەن لە خراپە) وە پاشەڕۆژی هەموو شتێك بۆ خوایە.

4 ـ پەروەردەبکرێت لەسەر خۆش ویستنی مردن، چونکە (پاشەڕۆژ زۆر زۆر باشترە لەم دنیایە)وە، چونکە مردن لە ڕێگەی خوادا ژیان و زیندوێتی یە: (وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبيلِ اللّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاء وَلَكِن لاَّ تَشْعُرُونَ).[3] واتە: ئەلێن بەو کەسانە لە ڕێگەی خوادا کوژراون مردوون، نا، بەڵکو زیندوون و (جۆرە ژیانێکیان هەیە) بەڵام ئێوە هەستی پێ ناکەن.

5ـ وا پەروەدە بکرێ کە دوژمن هەرچەندە ببێ بایەخی نییە، چونکە ئەم خوای لەگەڵە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئەبێ هەموو جۆرە (ئیحتیاط) ێك وەرگرێ: (وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَاناً وَتَسْلِيماً).[4] واتە: کە موسڵمانەکان (لەجەنگی خەندەقدا) (حیزبەکانیان بینی) ئەو تیرەو خێڵانەی بوو بوونە یەك بۆ سەرکوتکردنی موسڵمانەکان) وتیان ئەمە ئەوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەڵێنیان پێداین، وە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕاستیان فەرموو (لە بەڵێنەکەیاندا)... (وە ئەو قەڵەباڵغییە) بڕوای زیاد کردن و ملکەچی فرمانی خوا بوون.

وە هەروەها ئایەتی سوورەی (آل عمران)، وە ئایەتی سوورەی تەوبە ئەم مەبەستەمان بۆ ڕۆشن ئەکەنەوە.

6ـ ئەبێ وا پەروەدە بکرێ کە مەبەست تەنها خوا بێ لە جیهادەکەیاندا: (فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآخِرَةِ وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيُقْتَلْ أَو يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْراً عَظِيماً)[5] واتە: با بجەنگێن لە ڕێگەی خوادا، ئەوکەسانە ژیانی دنیا ئەفرۆشن بە پاشە ڕۆژ، وە هەرکەسێك بجەنگێ لە ڕێگەی خوادا، ئینجا بکوژرێ، وە سەرکەوێ ئەوە پاداشتێکی گەورەی پێ ئەبەخشین.

7ـ پەروەردە بکرێ لەسەر بڵاونەکردنەوەی درۆو دەلەسە... وە لەسەر ئەوە ئەگەر شتی وا بڵاوبوویەوە بیگەیەننە فەرماندەی هێزەکان و درۆزنەکانیش سزا بدرێن: (لَئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلاً * مَلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلاً)[6] واتە: ئەگەر دوو ڕووەکان وە ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایە و ئەوانەیش کە تۆوی فەساد و درۆ و دەلەسە بڵاو ئەکەنەوە (ئەمانە هەرسێکیان یەك شت ئەگرنەوە،چونکە (نیفاق) هەموو شتێکی لێ ئەوەشێتەوە) لە (مەدینە) دا... ئەگەر ئەمانە دەست لەو ئیشانە نەکێشنەوە

[1]) سوورەی محمد (ﷺ) / 7 .
[2]) الحج / 40 _ 41 .
[3]) البقرة / 154 .
[4]) الاحزاب / 26 .
[5]) النساء / 74 .
[6]) الاحزاب / 60_ 61.

تۆ هان ئەدەین بۆ گیانیان و سەرت ئەخەین بەسەریاندا، ئینجا دوای ئەوە ئیتر لە مەدینەدا لەگەڵت دانانیشن و هەڵدێن و ئەڕۆن، سەردەمێکی کەم نەبێت.

ئەوان دوورخراوەنەتەوە لە سۆزی خوا، لە هەر شوێنێکدا ژێردەست بوون و گیران، ئەوە لێیان ئەدرێ و سەرزەنشتیان ئەکرێن، وە ئەیشکوژرێن هەر گیران. بەڵێ پاداشی نەفامان و دووڕووەکان و جاسووسەکان و ئەوانەی دژی (حکومەتی) ئیسلام درۆودەلەسە بڵاوئەکەنەوە ئەمەیە. جێگەی سەرسوڕمان نییە چونکە ئەوەتا لە دەوڵەتانی ئەمڕۆشدا ئەوانە هەر وایان لێ ئەکرێ: (وَإِذَا جَاءهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ...)[1] .

8ـ وا پەروەردە بکرێ کە هیچ کات نەپسێ لە جەنگی دوژمناندا و هیچ کات زەبوونی و لاوازی نیشان نەدات: (وَلاَ تَهِنُواْ فِي ابْتِغَاء الْقَوْمِ إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمونَ وَتَرْجُونَ مِنَ اللّهِ مَا لاَ يَرْجُونَ وَكَانَ اللّهُ عَلِيماً حَكِيماً).[2] واتە لاوازو بێ تین مەبن لەگەڕان بەدوای تیرەی (کافراندا) ئەگەر ئێوە ماندو بن، ئەوانیش ماندو ئەبن وەك ئێوە ماندو ئەبن، وە ئێوە بەتەمای پاداشت ئەبن لای خوا، ئەوان بەتەمای نین، خوایش (هەر هەمووکات) زانایە بە هەموو وتارێك، وە دانایە بەکردنی هەرمووکارێك.

(فَلَا تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ)[3] واتە (کە ئەزانن لە ڕێگەی خوادایە جەنگەکەتان) کەوابوو لاوازو بێ تین مەبن، ئینجا (لە لاوازییدا) داوای پەیمان (هدنە) بکەن، لە کاتێکدا ئێوەن خاوەنی پلەی بەرز (چونکە کارەکەتان بەرزە، سەرخستنی وشەی خوایە) وە خواتان لەگەڵە، وە هیچ کات پاداشتی کردوەکانتان کەم ناکاتەوە.

9 ـ پەروەردە بکرێ لەسەر خۆش ویستنی (جیهاد) زیاتر لە سامان و ماڵ و منداڵ: (قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ)[4] . واتە: تۆ بڵێ: ئەی محمد (ﷺ) ئەگەر باوو باپیرانتان و کوڕەکانتان وبراکانتان و خێزانەکانتان و عەشیرەت و تیرەتان و ئەو داراییەی پەیدا ئەکەن و بازرگانیەك بترسن لە بێ ڕەواجی و برەوی (بەهۆی بروا هێناتانەوە) وە خانوو و بەرەیەك دڵتان پێوەی بەسراوە... ئەگەر ئەمانە خۆشەویستر بن لای ئێوە لە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) وە لەجیهاد و تێ کۆشان لە ڕێگەی خوادا ئەوە چاوەڕوانی وەڵامی خوا بن (چاوەڕوانی سزاو تۆڵەی بن "خوایش ئەو کەسانەی لە سنووری ئەو دەرئەچن نایان خاتە سەر ڕێگەی ڕاست".

10 ـ ئەو سەربازە وا پەروەردە بکرێ لە جەنگەکان ـ ئەگەر دەستکەوت بوو ـ دەست نەبات بۆ هیچ شتێك... واتە سامان و دارایی کۆنەکاتەوە بە فرمانی پێشەوا نەبێت: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ)[5] جیاوازی کەوتە نێوان موسڵمانانەوە سەبارەت بە دەستکەوتوو (غەنیمە)ەکەی (بەدر): ئاخۆ بۆ کۆچکەرەکان و یارمەتیدەرەکانە؟ یا تەنها بۆ لاوەکان ئەبێ؟ یا بۆ پیرەکانیان ئەبێ؟ یا بە تێکڕا بۆ هەموانە؟. ئینجا لەبەر ئەوە خوا بڕیاری بۆ دەرکردن بەم شێوەیە: پرسیاری "غەنیمەت"ی لێ ئەکەن (ئاخۆ بۆ کێ ئەبێ) ئەی محمد (ﷺ) بڵێ: حوکمی ئەو دەستکەوتانە بۆ خواو پێغەمبەرە (ﷺ)، (وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[6] . واتە: ئەو کەسەی گزیکاری و خیانەت بکات (لە دەستکەوتووە

---

[1] ) النساء / 83 .
[2] ) النساء / 104 .
[3] ) سوورەی محمد (ﷺ) / 35 .
[4] ) التوبة / 24 .
[5] ) الانفال / 1 . لەئایەتی ( 41 ) دا هەر لەم سوورەتەدا بە تەواوی ڕۆشن کراوەتەوە .
[6] ) آل عمران / 162 .

جەنگییەکاندا) لە ڕۆژی قیامەتدا خۆی و گزیکارییەکەی دێن (بۆ بەردەم خوای پەروەردگار) واتە خوا پێی ئەزانێ و دەوری پێ ئەکاتەوە. یا ئەیگرێ بە کۆڵیەوە و هەموو خەڵکەکەیش پێی ئەزانن بۆ ئەوەی ئابڕووی بچێ.

بەڵێ دروست نیە بۆ هیچ کەسێك دەست ببات بۆ سادەترین سامانە جەنگییەکان، بەفرمانی ئیمام نەبێت، وە هەروەها دروست نییە بڕواتە لای هیچ کەنیزەکێك دوای دابەشکردن و کەوتنە (حەیزە) وەی نەبێ، یا ئەگەر "حامل " بوو زگەکەی دابنێ..

خوێنەری بەڕێز: ئەمانەی سەرەوە بۆت باس کرا گرنگترین ئەو بناغانەن کە پێویستە سەربازی موسڵمانی لەسەر ڕابهێنرێ. هەرچەندە ئەمانە لەڕاستیدا پەیوەندییان بە مەشقی دەروونەوە هەیە: واتە سەربازی موسڵمان ئەبێ دوو جۆرە مەشق دابدرێ:

1ـ مەشقی دەروون پاکی و داوێن پاکی وەك لەسەرەوە باسکران.

2ـ مەشقی جەستەیی (التدريب الجسمي) بە شێوەیەك پەروەردە بکرێ بەرگەی هەموو نارەحەتیەك بگرێ، وە فێری هەموو جۆرە چەکێکی ئەوسەردەمە بکرێ (وەك لەسەرەوە باسکرا). هەرچەندە ئەم بەشەیان ئیسلام داوا ئەکات کە هەر بەمناڵی فێر بکرێن و ڕابهێنرێن: ﴿ علموا اولادكم السباحة والرماية وركوب الخيل ﴾.... ﴿ ومروهم أن يثبوا على الخيل وثبا ﴾.

**ڕازێك !**

کاتێ ئەمانە جێبەجێ ئەبن کە کۆمەڵێ سەربازی ڕاستەقینەی خوا بێن وە ئەو سیفەتانەیان تێدا بێ کە لە کتێبی (جند الله) دا باسکراون. وە هەروەها ماڵەوە و قوتابخانە و بەشی ئاگادارکردن "قسم الأعلام" و مزگەوت و هەموو بەشە سەربازییەکان یەك دەنگ بن بۆ ئەمە.

## پێنجەم: ناسینی دوژمن و خۆ ئامادەکردن بۆی

ئەمەیش بەپێی کات و شوێن و سەدەکان ئەگۆڕێ... پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە بووهەندێ جار مەفرەزەیەکی سەربازی ئەنارد بۆ دەرخستنی جێگە و ڕێگەی دوژمن و... وە هەندێ جاریش تەنها کەسێکی ئەنارد، وا ئەبوو ئەڕۆیشتە ناو دوژمنەوە و پێیان نەئەزانی و هەڵئەسا بە جێبەجێکردنی کاروباری سیاسی ئیسلامیی.

بۆ ئەوەی (هێزی سوپا) قایم و دامەزراو بێ، وە لەسەر بناغەیەکی ڕێکوپێکی و تەواو بڕوات پێویستی بە سەرکردایەتیەکی بەرزی ڕامیاریی هەیە، وە ئەو سەرکردایەتیەش کاتێ سەرکەوتوو ئەبێ ئەم خاڵانانەی تێدا کۆببێتەوە، هەروەك و یەکەم پیاوی "سیاسی" حەزرەتی محمد (ﷺ) چۆن خاوەنی ئەم خاڵانە بوو:

1ـ بانگەکەی کرداری بێت و متمانە و "ثیقە"ی بیێ بە سەرکەوتنی.

بەڵێ، ئەگەر مرۆڤێك هەڵکەوتبێ لەم جیهانەدا هەموو لایەنەکانی پێشەوایەتی تیا بوویێ ئەوە تەنها "محمد" بووە (ﷺ)... ئەگەر پێشەوایەك هەڵکەوتبێ و ڕیبازێکی هێنابێ، وە ئەو ڕیبازەی بەکردەوە و هەوڵ و جیهاد سەلماند بێ بە کۆمەڵ ئەوە تەنها "محمد" بووە (ﷺ).

ئەگەر سەرکردەیەك هەر لەسەرەتای کارەکەیەوە متمانەی تەواوی بوویێ بەسەرکەوتنی ئیشەکەی، نەك لە ناوەڕاستیدا، نەك لە دوایيدا باوەڕی لاواز نەبوویێ بەخۆی، ئەوە تەنها "محمد" بووە ـ ﷺ ـ.

پێغەمبەر (ﷺ) بەلایەوە ڕوون بوو کەناوەڕۆکی بانگەکەی بریتیبوو لەوە کە "حاکم"ی ڕاستەقینە بۆ کۆمەڵەی ئادەمیی تەنها "خوا"یە (جل جلاله) وە ملکەچ کردنی بۆ غەیری دەسەڵات و بڕیارەکانی ئەو "شیرك"ە... وە گۆڕانی سەرەکی و بناغەیی بریتیە لەوە کە خەڵکی ڕزگار بکرێ لەسەر دانەواندنی هەندێك بۆ هەندێکی تر.. ڕزگار بن لەوە و بێن

بۆ لای بەرنامەکەی خوا... ئاشکرایە هەرگەلێك ئاوا بێت کلیلی ژیانی بەختیاریی ئەکەوێتە دەستی ئەو.. مافی ئەوەی هەیە پێشەوایەتی گەل بکات.

أ ـ سەرکردەکانی قورەیش ـ وەك عوتبەو شەیبە و ئەبوجەهل و ئومەیەو ئەبوسووفیان و هەندێکی تریان ـ کۆبونەوە و رێگەی ماڵی (ئەبوطالیب) یان گرتەبەر و وتیان تۆخۆت ئەزانی چەند خاوەن رێزی لای ئێمە و برازاکەتدا... کەوابوو بانگی بکە پەیمان لە هەر دوو لامان وەربگرە کە باسی یەکتر نەکەین، وەواز لە ئاییمان بێنێ، واز لە ئاییی دێنین! !.

ئەبوطالیبیش ناردی و هات و پێی وت: برازاکەی من، ئەوانە پیاوە ناودارەکانی گەلەکەتن لەبەر تۆ ئەوەتە کۆبوونەتەوە تا تۆ پەیمان بدەی بەوان، وە ئەوانیش پەیمان بدەن بەتۆ کە هیچتان باسی ئەکتر نەکەن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: تەنها وشەیەك بلێن ئەبن بە خاوەنی هەموو عەرەب و (عەجەم)یش سەرتان بۆ داوئەنوێنن.

ئەبووجەهل وتی: کورە بەڵێ بەگیانی باوکت (10) وشەیش ئەلێین، فەرمووی: بلێن: "لااله لا الله".. وە ئیتر دوای کەس نەکەون، دوای ئەم فەرمودەیە ئەو نەفامانە دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان! ! !(وەك گاڵتە پێکردنێك).

ب ـ جارێکی تر پێغەمبەر (ﷺ) چوو بووە ناو تیرەی (بەنی عامر) و خەریکی ئەوە بوو بانگەکەی خۆی پێ ڕائەگەیاندن... لەم کاتەدا گەورەکەیان وتی: جا باشە ئەگەر ئێمە دوای تۆ بکەوین، تۆیش خوا سەری خستی ئایا دوای تۆ ئێمە ئەڕۆینە جێگەکەی تۆ؟ ئەمیش (ﷺ) فەرمووی: ئەم کارە بەدەستی خوا یە بەکێی ئەسپێرێ ئارەزوویەتی. ئینجا سەرکردەکەیان وتی: جا ئەمە ڕاستە ئێمە سنگمان بکەین بە "هەدەف" بۆ عەرەبەکان لەبەرخاتری تۆ. تۆیش هەرکات سەرکەوتی کاروبار بۆ ئێمە نەبێ؟! کەوابوو (بڕۆ بەرێی خۆتەوە) پێویستمان بە تۆ نییە.[1]

ج ـ موشریکەکان چەندان جار داوایان لە پێغەمبەر کرد (ﷺ) کە چینی لاوازو هەژارە (مستضعف)ەکان وەك "صوهەیب و بیلال و خەبباب و عەممار" (خوایان لێیان ڕازی بێت) دەربکات جا ئەوان دێن بۆ لای! ! بۆ ئەم مەسەلەیە قورئان جار لە دوای جار ئەهاتە خوارەوە: دەریان نەکەی (با ئەوانە هەر بلێن) ئەمیش ئیتر داواکەیانی ئەدایە دواوە.. خوا ئەفەرمووێ: (وَأَنذِرْ بِهِ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُواْ إِلَى رَبِّهِمْ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِ وَلِيٌّ وَلاَ شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ * وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ ..) (الأنعام: 51ـ 52). واتە: ئەوانە بترسێنە بە قورئان کەئەترسن کۆبکرێنەوە بۆلای خوای خۆیان و بێجگە لەویش هیچ یارمەتی دەروو (تکا کارێکیان) نییە.. (ئەوانە بترسێنە)، بەڵکو بترسن و (ترس بکەوێتە دڵیانەوە) وە لەکۆڕەکانت دووریان مەخەرەوە ئەو کەسانەی بەیانی و ئێوارە بانگ لەخوای خۆیان ئەکەن و خواپەرستی تەنها بۆ ئەوئەکەن. وەك ئەوهەژارنە باسمان کردن[2]. بەڵێ لەم هەڵوێستانەی سەرەوە دەرکەوت کە پێغەمبەر (ﷺ) چەند سوور بووە لەسەر بەرنامەکەی و چۆنیش متمانەی تەواوی بووە بەوەی کە سەرکەوتن ـ بەپشتیوانی خوا ـ بەدەست دێنێ. وەهەروەها دەرکەوت کەئەو پێشەوایە هیچ کات دژایەتی (تناقض) لە ئیشەکانییدا نەبووە...بۆ یەکەمجار ڕای چۆن بووەو نیازی چۆن بووە هەر ئاوایش بووە لەکۆتایی دا.. ئەمەیش بەپێچەوانەی "سیاسیە" کانی ئەمڕۆی جیهانەوە کە ئەبینی لەماوەیەکی زۆر کەمدا چەندان (تناقض) لەکارەکەیاندا ئەبینرێ و لەگەڵ دوژمنەکەیاندا چەند جار ئەکەونە "ماستاو" کردن! !.

2 ـ کۆڵنەدەربێت لەگەیاندنی کارەکەیدا:

دوو شت هەیە زۆر پێویستن بۆفرماندەی بزووتنەوە سیاسی و فیکرییەکان :

م ـ سوور بوون و کۆڵنەدان بۆ ڕاگەیاندنی داخوازییەکەی.

ب ـ وردبین بێت لە هەڵوێستەکانیدا لەگەڵ دوژمندا.

---

[1] ) الرسول / سعید حوی .

[2] ) هەمان سەرچاوە .

ئاشكرایه هەر بانگەوازێك بەردەوام نەبێت لەئیشەكەیدا ئەوەستێی و سەرئەنجامیش تیائەچێت... هەروەك ئەگەر هەلۆیستی خۆی دیاری نەكات لەگەڵ دوژمندا كوتوپڕ لێی ئەدرێ و سەركوت ئەكرێ، بۆ نموونە: (هیند)ییەكان كاتێ ویستیان خاكەكەیان پاك بكەنەوە لە (ئینگلیزەكان) ڕێگەی نەرمونیانییان گرتەبەر.. واتە: ڕووبەڕووی ستەمكارەكان توندوتیژ نەبوون، وەبڕیاریاندا دان بگرن بەخۆیاندا لەژێر باری ستەمەكەیان بۆ ئەوەی، بەڵكو ئەوان بەزەییان بجوولێ و سەر ئەنجامیش دابەزن لە بیرەكەیان.

كەڵكی گرتنی ئەم ڕێگەیە (كەبەرامبەركەی بەزەیی تێدا دروست ببێت و لەولایشەوە (پشتیوانی) و پشتگیری بكرێن لە لایەن ڕای گشتی جیهانەوە ئەگەر لەسەر هەق و ڕاستی بێ.. بەڵێ سەرئەنجام ـ بەهۆی گرتنی ئەم ڕێگەوە ـ هیندییەكان توانییان وڵاتەكەیان ئازاد بكەن، لەگەڵ ئەوەیشدا خوێنێكی وایان نەدا، خۆ ئەگەر ئاوا نەرمونیان نەبوونایە خۆیانیان بۆ نەئەگیرا لەبەردەم ئەو هێزەی (بەریتانیا) دا، وەتووشی زیانێكی گەورەئەبوون.

ئەگەر بەراوردێكی ئەم دووخاڵە بكەین لە پێغەمبەردا (ﷺ) ئەبینین بەشێوەیەكی بێ وێنە تیایاندا سەركەوتووە، ئەوەبوو نیوە دوورگەی عەرەبی هەستان دژی ئەوو دوژمنایەتییەكی بێ وێنەیان بەكارهینا لەگەڵیدا !! كەچی تەنها چاوتروكاندنێك دەستی لەئیشەكەی هەڵنەگرت، و بەردەوام ئەچووە ناو تیرەكان و باسی ئاینەكەی بۆ ئەكردن پتر ئەمەبووە هۆی پشتیوانی بۆی..

ئەم خۆگرتنە (13) ساڵی خایاند بێ وچان بێ ماندووبوون.

ئەمەلەلایەكەوە، ئینجا لەلایەكی ترەوە ــ هەروەك بێ وچان ئیشی ئەكرد ــ زۆریش خاوەن ئارام بوو ــ بەتایبەت ــ لە (مەككە) دا.. داوایشی لەهاوەڵان ئەكرد تا ئارامیان ببێ، دەی ئەگەر وای نەكردایە هاوەڵان ئەكوژران و نەیشی ئەتوانی بەردەوام بێ لەسەر ئیشەكەی، هەروەك لەو لایشەوە بوو بەهۆی ڕاكێشانی چەندەها دڵ لەناوچەكەدا.

ئەمە لە مەككەدا، كەهاتە (مەدینەی) یش پتر سور بوو لەسەر كارەكەی و ڕاگەیاندنی بانگەواز بەموسڵمانان و بە ئارام بوو لەسەر بڵاوكردنەوەی ڕێبازەكەی، ئەوەتا جارێ (پەیمان) ئەبەستێ، جارێ خەریكی ئاشتییە، جارێ جەنگ و.... هتد.

ئینجا ئەگەر بەراوردێكی ئەم سەركەوتنەی بكەین لەگەڵ ڕێبازەكانی تردا كە چۆن ئەم سەركەوتنەی بەدەست هینا بڕوا دێنی كەهێزێكی نهێنی یارمەتیدەری بووە ئەگینا چۆن لەماوەی (23) ساڵدا ئاوا گەشە ئەكات و پێ ئەگات؟!

حەز ئەكەی ڕیبازە "سیاسی" یەكانی ئەمڕۆ یەكە یەكە هەڵسەنگێنە بزانە بەچەند ساڵ پێگە یشتوون؟

3 ـ توانای ئەوەی بێ كەهەموو ئەندامەكانی چاودێری بكات، چ پەروەردەیی، چ هۆنینەوە، چ خستنە ئیشیان.

* بێگومان هەر ڕێبازێك ئەگەر بەشێوەیەكی وردو پاك پەروەردەی ئەندامەكانی نەكات، بەخراپ ئەو بانگەوازە ئەكەوێتە پێش چاو كۆمەڵ و ئەوكاتە لە جیاتی ئەوەی مرۆڤەكان پێڕەوی لێ بكەن، لێی دوور ئەكەونەوە، واتە: پێش ئەوەی هەستێ بەبانگەكەی خەڵكی لێ ئەسڵەمێتەوە ئەمیش ئەبێتە هۆی ئەوەكە: (ڕای گشتی (الرأي العالم) دژی بوەستێ... بەڵام هەر لە سەرەتاوە ئەندامەكانی پەروەردەیەكی قورئانی بكات ئەوە زۆربەی كۆمەڵ (ئەگەر نەڵێن هەمووی) بڕوای پێ دێنێ پێش ئەوە دەستبەكار بێ بۆ بانگەكەی، وەخۆشەویستیان ئەڕواتە دڵییەوە. سەرئەنجام هەركات هەڵسا بەبانگەكەی خەڵكەكە بێ دوودڵی دوای ئەكەوێ، چونكە ئاشكرایە چەند كەس كۆمەڵە پیاوێكی پاك و چاك لە دەوریدا كۆئەبێتەوە بێ ئەوەی بانگەكەی ئاشكرا بكات.

* ئەگەر نەتوانێ ـ ئەو ئەندامانە بخاتە ئیش ـ سەرئەنجام وەك دەست بەسراویان لێ دێت، نەدژی بانگەكەن، وەنە هیچ خزمەتێك پێشكەش ئەكەن، دیارە ئالەم كاتەدا سەركردایەتی بانگەكە لێی بەپرسیار ئەبێ.. وەلەئەنجامدا ناشتوانێ هەستێ بەهەموو ئەركەكانی بانگەكەی.. واتە وای لێدێت: (تەنها بانگكەرێك چەندان بانگكراو)... وە لێ ئەگەر بكرێ بتوانێ هەموو ئەندامەكانی بخاتە ئیش بۆ بەرژەوەندی بانگەكەی ئالەم كاتەدا هەموویان بەرپرسیار ئەبن، وەهەریەكێ لە ئەندامەكان جێگری پێشەوا (قائد) ئەبن.. كە بانگەوازەكەی پەرەی سەند سەرئەنجام ئەتوانن ببەن بەڕێوە.

* ئەگەر چاودێری ئەوئەندامانە نەکات و سەرپشتی کارو باریان نەکات، وەیا هەرکەسە بەپێی توانای خۆی ئیشی نەدرێتێ ئەوە یەکە یەکە لەبیر ئەچنەوە و ئەوانیش تەممەڵی و سستی ڕوویان تێ ئەکات. جائەگەر لەم سێ خاڵەوە تەماشای پێغەمبەر (ﷺ) بکەین ئەبینین زۆر باڵا دەست بووە..

**خاڵی یەکەم:** دنیا پڕە لەشایەت بۆ (گەورەیی) و ئاستی پەروەردەی پێغەمبەر (ﷺ)، بۆ بەرز بوونەوەی ئەندامەکانی لەدۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر.

**خاڵی دووەم:** ئەبینی پێغەمبەر _ ﷺ _ هیچ کات وچانی نەگرتوە لە بانگەوازەکەیدا، وەئەوەی هاتبێتە ناو ئەم دینەوە هەمووکات لەناویشیا ژیاوە و بەردەوام گوشی کردووە.

**خاڵی سێیەم:** ئەبینی زۆر وردەکاری بووە لەچاودێری ئەندامەکانیدا بەشێوەیەك جێگەی سەرسوڕمانە بۆنمونە: (ئیبنی ئیسحاق) لەئوممی سەلەمەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەگەڕێتەوە کاتێ شاری (مەککە) هاتەوەیەك بەرامبەر بە بانگەکەی پێغەمبەر، وەهاوەڵانیشی سزاو ئازاردران و جۆراو جۆر چەرمەسەرییان تووش ئەبوو و پێغەمبەریش (ﷺ) بۆی سوك نەئەکرا لەسەریان، بەڵام ئەوخۆی بە بۆنەی تیرەکەیەوە بەتایبەت مامی دەستیان بۆ نەئەبرد، جالەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون: "إن بارض الحبشة ملكا لاتظلم أحد عنده فالحقوا ببلاده، حتى يجعل الله لكم فرجا ومخرجا مما أنتم فيه" لە زەوی (حەبەشە)دا پاشایەك هەیە هیچ کەسێك لای ئەو ستەمی لێ ناکرێ، جا لەبەرئەوە بەخێرایی پەیوەندی پێوە بکەن، تا بەڵکو خوا دەرووتان بۆ بکاتەوە، وە ڕزگار بن لەوەی وان تێیدا. پێغەمبەر (ﷺ) دووجار هاوەڵانی بەرەو وڵاتی "حەبەشە" نارد، جارێکیان لەساڵی (5)ی پێغەمبەرێتی دابوو.

ئینجا کە خۆیشی بڕیاریدا بۆ کۆچکردن بۆ (مەدینە)، هەستا شوێنکەوتووەکانی بەرەو ئەوێ نارد، دەستە دەستە و یەکە یەکە.

ئەو پێغەمبەر (ﷺ) زۆر خەمخۆری هاوەڵان بووە، هیچ کات لەبیری نەچوونەتەوە... جا فەرموو تۆو یەك دوو نمونەی تر بۆ ئەوەی کە چەند هەوڵیداوە بۆ مسۆگەرکردنی ژیانی شوێنەکەوتووەکانی، تا دەرسی سیاسییەکان دا بدات بۆ ئەوەی کە هەر نەکەن بە گیرفانی خۆیاندا و ئەندامەکان ئاتاج و موتاج و سەرگەردان بسوڕێنەوە وەك (سیاسی) یەکانی ئەمڕۆ !! تەنانەت هەڵی ناون بۆ پێکەوەنانی "ماڵ و خێزان" پێیان ئەفەرموێ: ژن بێنن. ڕەبیعی ئەسلەمی ئەڵێ: من خزمەتی پێغەمبەرم ئەکرد (ﷺ) فەرمووی: ڕەبیعە ئەوە بۆ ژن ناهێنی؟! وتم: ئەی پێغەمبەری خوا نامەوێ ژن بهێنم، چونکە دەسەڵاتم نییە، وە نایشمەوێ هیچ شتێ دوورم خاتەوە لە تۆ (کە ئەمەم وت) ڕووی لێ وەرچەرخاندم، دوای ماوەیەك دیسانەوە فەرموویەوە، منیش هەر وەك جاری یەکەم وەڵامم دایەوە، ئەویش ڕووی لێ وەرچەرخاندمەوە... منیش بیرم لێ کردەوەوە وتم سوێندم بەخوا پێغەمبەر دڵسۆزترە بۆ من زیاتر لە خۆم کەوابوو ئەگەر ئەمجارە فەرموویەوە ئەڵێم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ڕات بە چییە؟ ئامادەم... ئەویش زۆری نەبرد فەرمووی ڕەبیعە بۆ ژن ناهێنی؟! وتم ئەی پێغەمبەر ئامادەم چی ئەفەرمووی؟

فەرمووی بڕۆ بۆلای تیرەی (بەنی فلان) ی ئەنصارییەکان بڵێ: فلانە ئافرەتت بدەنێ، منیش ڕۆیشتم فەرموودەکەی پێغەمبەرم بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش وتیان: مەرحەبا بێ لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)و نێراوەکەیشی. سوێندمان بەخوا بە ئارەزووی خۆی ئەگەڕێتەوە. واتە ئیشەکەی بۆ جێ بەجێ ئەکرێ ئەو جا ئەڕواتەوە.

بەڵێ ژنەکەیان دامێ و ئەوەندەیش متمانەیان بە پێغەمبەر (ﷺ) بوو داوای شایەتیان لێ نەکردم.. منیش بەخەفەتەوە هاتمەوە (چونکە هیچ نەبوو بیکەم بە مارەیی) وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشتمە ناویان زۆر بەڕێزبوون و ژنیان دامێ و بەنەرمونیان لەگەڵم جوڵانەوە و داوای شایەتیان لێ نەکردم (بۆ ئەوەی کە لەلایەن تۆوە ڕۆیشتبوم) وا ئێستا هیچ نییە بیکەم بە مارەیی.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بورەیدەی ئەسلەمی بڕۆن بەئەندازەی ناوکە خورمایەك زێڕی بۆ کۆبکەنەوە. ڕەبیعە ئەڵێ دەستبەجێ بۆیان کۆکردمەوە و بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بیبە بۆیان و بڵێ ئەمە مارەییەتی. منیش بۆم

بردن و ئەوانیش پێی ڕازی بوون لێیان وەرگرتم، وە وتیان زۆریشە و باشیشە. ئینجا هاتمەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بەخەفەتەوە! ! ئەویش فەرمووی: ڕەبیعە چییە خەفەتباری؟! وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشتم، گەلی ئاوا بەڕێزم نەدیوە، وەڕەزامەندی خۆیانیان خستە پێش چاو و وتیان زۆر باشە، بەڵام ئێستاهەرچی بیر ئەکەمەوە هیچ شك نابەم زەماوەندی پێ بکەم، فەرمووی: بورەیدە ئادەی مەڕێکی بۆ پەیدا بکەن، بەڵێ خێرا بەرانێکی گەورەی قەڵەویان بۆ پەیدا کردم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بڕۆ بۆلای (عائیشە) بڵێ ئەو (زەمیلە = مکتل)ی خۆراکەکەی تێدایە بینێرێ. منیش ڕۆیشتم پێم وت و هێنام... زەماوەندەکەم کردو پێغەمبەریشم (ﷺ) بانگ کرد. ئەم ڕوداوە گەلێ ڕەوشتی تیدا بەرچاو ئەکەوێ وەك:

أ ـ سوننەتە بۆ پێشەواو سەرکردە فرمان بکا بە شوێنەکەوتووەکانی بۆ ئەوەی ژن بهێنن.

ب ـ ئەبێت موسڵمانان (ئەگەر دەوڵەت نەی پرسیەوە لە لاوەکان) یارمەتی یەکتر بدەن بۆ ژن هێنان، وە ئەوەی نیەتی مارەیی بۆ کۆبکەنەوە.

ج ـ گوێڕایەڵی موسڵمانان بۆ سەرکردە و پێشەوا.

د ـ شایی و زەماوەند کردن سوننەتە، تەنانەت ئەگەر نەیشی بوو موسڵمانان بۆی کۆبکەنەوە ئەبوو بەرزەی ئەسلەمی (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ: یارمەتیدەرەکان ئەگەر ئافرەتێکی بێ مێردیان بوایە نەیان ئەدا بە شوو تا لە پێغەمبەریان ئەپرسی، ئاخۆ پێویستی پێی هەیە، یا نەء؟ جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە پیاوێکیان: کچەکەتم پێ بدە ! ئەویش وتی بەڵێ بەسەرچاوو بەڕێزیشەوە ئەی پێغەمبەر! فەرمووی ئاخر بۆ خۆمم ناوێ. کابرا وتی: ئەی بۆ کێت ئەوێ ئەی پێغەمبەر؟ فەرمووی بۆ فلان، کابرا وتی: با ڕاوێژ بکەم بەدایکی، دوای ئەوە ڕۆیشت وتی: پێغەمبەر (ﷺ) داوای کچەکەت ئەکات، ئەویش وتی: زۆر باشە، پیاوەکە وتی ئاخر بۆ خۆی نایەوێ بەڵکو بۆ فلانێکە. دایکەکە وتی: نە سوێند بەخوا نایدەمێ! پیاوەکە کاتێ هەستا بڕواتەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و هەواڵەکەی بۆ بباتەوە، کچەکە وتی کێ داوای کردووم؟ دایکەکە قسەکەی بۆ گێڕایەوە. کچەکە وتی: چۆن قسەی پێغەمبەر ڕەت ئەکەنەوە؟! قسەکەی مەشکێنن ئەو من نادات بەدەم ئاوەوە ! باوکەکەی ڕۆیشت و هەواڵەکەی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئیتر ئەوە خۆت و کچەکە بەکێی ئەدەی بیدە؟....

خوێنەری بەڕێز: ئەم یەك دوو نمونەیە بەڵگەیە بۆ چاودێری کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هاوەڵانی لەهەموو ڕوویەکەوە. هەروەك دڵسۆزی و گوێڕایەڵی هاوەڵانیشی تێدا بەدی ئەکرێ.

4ـ شوێنکەوتووەکانی متمانەی تەواویان پێی ببێ.

ئاشکرایە متمانە لەنێوان فەرماندە و شوێنکەوتوەکانیدا بایەخێکی تەواو گرنگی هەیە لای خاوەن پیاوی سیاسەتمەدار، بۆیە لە ڕژێمی گەلانی دیموکراتخوازدا تا ئەو خەڵکە متمانەی ببێ لای خەڵکەکە هەر ئەمێنێتەوە.. وە هەرکات خۆشەویستی و متمانە نەما لەنێوانیاندا (سیاسەت) بشیان ڕائەوەستێ و کۆمەڵیش وردە وردە بەرەو ڕووخان مل ئەنێ چونکە دڵسۆزی نامێنێ، لەمەیشەوە کار ئەکاتە سەر لایەنی ئابوورییان.

جا ئەگەر سەرکردە سیاسییەکان یەکەیەکە هەڵسەنگێنین و لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بەراوردێکیان بکەین ئەبینین پێغەمبەرمان پتر لە هەمووان خۆشەویستی و متمانەی لای هاوەڵەکانی بووە.

بۆ نمونە:

* عەبباسی کوڕی عوبادە ئەڵێ:

هۆزی (خەزرەج) ئەزانن چۆن لەسەر چی پەیمان ئەدەن بەم پیاوە (مەبەست پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ).

وتیان بەڵێ. ئەویش وتی: پەیمانی لەگەڵ ئەبەستن لەسەر جەنگ کردن لەگەڵ سورو ڕەشدا، جا ئەگەر ئەو جەنگە بوو بەهۆی تیاچوونی سامان ودارایی و پیاوە هەڵکەوتووەکانتان، ئایا ئەوئەدەن بەدەستەوە؟ دیارە ئالەم کاتەدا ئەگەر شتی

ئاوا بکەن سوێندم بەخوا تووشی سەرشۆڕی دنیاو قیامەت ئەبن، خۆ ئەگەر پەیمانەکەتان بەرنە سەرو جەنگی سەروماڵی لەسەر بکەن سوێندم بەخوا تووشی چاکەی دنیاو پاشەڕۆژ ئەبن، ئەوانیش وتیان: بەڵێ ئێمە جەنگی سەروماڵی لەسەر ئەکەین...".

* لە هەڵوەێستەکانی (بەدر) دا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم جەنگە چۆن دێتە بەرچاوتان و ڕاتان چییە سەبارەت پێی؟

(مقدادی کوڕی عەمر) وتی: ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك گەلەکەی موسات پێ ناڵێین، بڕۆ تۆو خواکەت بجەنگێن و ئێمەیش ئالێرەدا دائەنیشین! !..

ئینجا سەعدی کوڕی عوبادە وتی: دیارە پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەی مەبەستە، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فرمانمان پێ بدەی بڕۆینە ناو ئەو دەریاوە ئەڕۆینە ناویەوە، ئەگەر بفەرموێ: هەتا (برك الغماد = جێگایەکە لە یەمەن) ناوێستینەوە.

بەڵێ ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) زۆر زۆر خۆشەویست بووە، بەشێوەیەك هەرکەسێك لەگەڵیدا ژیابێ لەناویا تواوەتەوە.. بۆیە (زەیدی کوڕی حاریسە) باوکی و مامەکانی دێن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) تا بیکڕنەوەو ئازاد بێت و بیبەنەوە بۆ لای خزمو کەسوکاری خۆی... کەچی زەید ئەوەی پێ خۆش نەبوو! !. بەڵکو پێی خۆش بوو ـ هەرچەندە بە بەندەیی و لە غەریبیدا ئەمێنێتەوە ـ هەر لەلای محمد (ﷺ) بمێنێتەوە. ئەگەر بڵێی لەوانەیە منداڵ بوویێ، نەخێر بیروهۆشی پێگەیوو بوو.. بەڵێ ئەمانە و چەندەها نموونەی تری وەك ئەوان هەموویان بەڵگەن بۆ ئەوەی هاوەڵان زۆریان خۆشویستووە پتر لەوەی (تصور) بکرێ.

5ـ کەڵك وەرگرین لە هەموو شوێنکەوتووانی، چ لەڕووی ژیرییانەوە، چ لە ڕووی بیروڕایانەوە، لەگەڵ دانانی هەموو تاکێکدا لەو جێگەی خۆیدا.

لێهاتوویی هەڵکەوتوویی سەرکردایەتی هەر شۆڕشێك بە تاقیکردنەوە و ناسینی ئەندامەکان دەرئەکەوێ وە لەکەڵك وەرگرتندا لە ژیریاندا ئەبێت...

پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) لەمانەدا دەستی باڵای بووە، لە باسی پێشوودا هەندێك دواین کە چۆن پرسوڕاو تەگبیرو ڕاوێژی ئەکرد بە هاوەڵانی، لە کاروباری دەوڵەتەکەیدا.. ئاشکرایە هەر تاکێك (مەشوورەت) و پرسو ڕای پێ بکرێ دڵ و دەروونی پتەو و بەهێز ئەبێ بەو (سەرکردایەتییە) یەو دولیش زۆر بەدڵ و قایمییەوە خزمەت ئەکات، بۆیە خوا لە هەندێ جێگەدا داوا ئەکات لە موسڵمانان کاروباریان بە (مەشوورەت) بێ. لە (بەدر) و (ئوحود) و ڕۆژی (ئەحزاب) و (حودەیبیە)دا مێژوو شایەتە کە چۆن ڕای هاوەڵانی وەرئەگرت، نەك هەر ڕای پیاوانی وەرگرتبێ، بەڵکو ڕای ئافرەتانیشی پەسەند کردووە وەك لە (حودەیبیە)دا پرسی بە (ئوم سەلەمە)ی خێزانی کردوو ڕایەکەیشی وەرگرت. بەڵێ (قیادەی ئیسلام) ڕای هەموو کەسێك وەرئەگرێ بەمەرجێ ئەوە لەگەڵ ئیسلام و سیاسەتی ئیسلامدا گونجاو بێت، ئیتر عەرەب بێ یان "عەجەم".

بەڵێ لە شووراڕا هەموو مرۆڤێك مافی تەواوی مرۆڤایەتی خۆی وەرئەگرێ... موسڵمانانی پێشوو لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) چاك فێری تەگبیرو ڕاوێژ بوون و بە باشیش ڕەفتاریان پێ ئەکرد.

ئیمامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) هەندێ جار پرسی بە ئافرەت ئەکردوو ڕاکەیشی وەرئەگرت.

ئەمە لە ڕووی پرس و ڕاوێژەوە.. ئینجا لەبارەی دانانی هەموو ئەندامێك لە جێگەی شیاوی خۆیدا پێغەمبەر (ﷺ) هیچ کەسی پێ نەگەیشتووە.

لەسەردەمی خۆییدا (ئەبوو بەکر) و (عومەر) هاوەڵانی تر پێیان ئەوتن "وەزیر"ەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

چونکە گفتوگۆو ڕاوێژی لەگەڵ ئەوانەدا ئەکرد سەبارەت بە چارەسەرکردنی کاروباری موسڵمانان، کە خۆیشی نەخۆش کەوت و فرمانی بە ئەبوو بەکر کرد بەرنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە، هەر ئەمەیش وای کرد کە موسڵمانان دوایی هەڵیبژێرن و بیکەن بە جێنشین، ئینجا دوایی ئەو عومەر (خوای لێ ڕازی بێت).

عەمری کوڕی عاس ئەڵێ: سوێندم بە خوا لەوکاتە من و خالیدی کوڕی وەلید بڕوامان هێناوە هیچ ڕووداوێك نەبووە کە پێغەمبەر (ﷺ) پرسی بە ئێمە نەکردبێت بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆی.

هۆزی (بەنی تەمیم) جارێك هاتن بۆ لای بۆ خۆ هەڵکێشان ووتیان: محمد ئێمە بۆ ئەوە هاتووین خۆمان هەڵکێشین، کەولبوو مۆڵەتی (شاعیر) و (دواندەر) ەکەمان بدە بۆ هۆنراوە وتنەوە و وتار دان !! حەزرەت (ﷺ) فەرمووی: دەی داوندەرەکەتان بڵێ، (خەطیب) یان هەڵسایەوەو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە (ثابتی کوڕی قەیس) وەڵامی بدەرەوە، ئەویش وەڵامی دایەوە.

ئینجا "شاعیر"ەکەیان هەستایەوە، شاعیرەکەی پێغەمبەریش (ﷺ) حەسان وەڵامی دایەوە و بە چاکترین وەڵام.

بەڵێ ئەو پێغەمبەرە بۆ هەموو جێگەیەك پیاوی تایبەتی خۆی بۆ ئامادە کردووە، وە مێژوو شایەتە کەلە هەموو کەسێك ـ لەم ڕووەیشەوە ـ وێنەی نەبووە.

6ـ توانای تەواوی هەبێ بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفت.

بانگەوازە دنیاییەکان و هەموو (پارت)ە سیاسییەکان زۆر جار لە نێوان خۆیاندا ئەبن بەچەند تاقم و دەستەی جیاوازەوە بەهۆی ئەوەوە کەهەندێ جار بڕێ گیروگرفتیان دێتە بەردەم و"قیادە" کەیان ناتوانێ چارەی بکات بۆیان.

هەندێ لە "قیادە"کانیش پەلامار ئەدات بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان، بەڵام ئەوانیش لە ڕێگەی خۆیەوە نییە، ئەبینی دارو دارکاری و بەندکردن و.. و.. بەکار دێنێ وەك ئێستا لە زۆربەی وڵاتان بەکار ئەهێنرێ.

بەڵام ئەگەر چاوێك بەپێشەوایەتییەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بگێڕن ئەبینن زۆر بە شێوازێکی ناوازە گیروگرفتەکانی ناوچەی چارەکردووە بەژیری و سەلیقەی خۆی.

ئەو وڵاتەی کە پڕ بوو لە گرێ و گیروگرفتە جۆراو جۆرەکان بۆ نموونە:

1) دانانی بەردە ڕەشەکە ـ الحجر الاسود ـ پێش ئەوەی بکرێ بە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك قورەیش ویستی (کەعبە) تازە بکاتەوە سەرئەنجام ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە لەسەر دانانەکەی: ئەم هۆزە ئەیوت من دای ئەنێم لە بەشی خۆمدا.. ئەو هۆزە ئەیووت نەخێر حەقی منە و هەروەها.... تا وای لێهات بکەن بە شیردا بۆ یەکترو یەکتر قەڵاچۆ بکەن!! قۆڵیان لێ هەڵماڵی بۆ شەڕو ئاژاوە و خوێن ڕشتن لەسەر ئەوە.. یەکێکیان وتی: من ڕام وایە ئەمڕۆ کێ یەکەمجار لە دەرگای (کەعب)ەوە هاتەژوورەوە ئەو کەسە بکەین بە حەکەم و دەمڕاستتان بۆ ئەوەی ئەو کێشەکەتان بۆ چارەسەر بکات.

ویستی خوا بوو یەکەم کەس کە هات محمد (ﷺ) بوو ئەوانیش کە چاویان پێکەوت بە جارێ وتیان: ئەوا "ئەمین" هات ئێمە پێی ڕازین ئەم محمدە... کە گەیشتە لایان و هەواڵیان دایە، فەرمووی: هەر ئێستا پارچە قوماشێکم بۆ بهێنن، بۆیان هێناو بەدەستی پیرۆزی خۆی بەردەکەی خستە ناویەوە، فەرمووی دەبا هەر تیرەیەك بێت و چمکێك بگرێ و بەیەکدەست بەرزی بکەنەوە.. ئەوانیش وایان کرد تا گەیاندیانە ئاستی خۆی پێغەمبەریش (ﷺ) دەستی بردوو لە جێگەکەی خۆی دایناا[1].

[1]) ( ژیاننامەی پێغمبەری مەزن (ص ) عبدالعزیز پارەزانی .

2) چارەسەرکردنی دوو ڕوووەکان (المنافقین).

کاتێ موسڵمانان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) گەڕانەوە لە "غەزا"ی (بەنی موصطه لیق)دا چوونە سەر ئاوێك و دابەزین لەوێ، دوای ئەوە ڕووداوێك ڕوویدا (عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی) ویستی ئەوە بکا بەبیانوو و هەرچی لە دڵیدا هەیە بیخاتە کار تا جەنگێك فەراهەم بێنێ و بیێ بە هۆی تێکدانی یەکێیتی بڕوادارەکان....!! ئێنجا پێغەمبەر (ﷺ) بەڕێزی هاتە ناو مەسەلەکە بۆ چارەسەرکردنی ئەو ڕووداوە.

"ئیبنی هیشام" ئەڵێ کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئاوەکە بوو هەندێ خەڵك هاتن بۆ سەری، (عومەری کوڕی خەتتابیش) کرێکارێکی هەبوو ناوی (جەهجاە) بوو، ئەم جەهجاهە و (سینان جوهەنی) چوون بەگژ یەکتردا و لێیان بوو بەقڕە و جەنگە (جوهەنی) یەکە هاواری برد بۆ یارمەتیدەرەکان، جەهجاهیش بۆ کۆچەرەکان، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی ئەمەی کرد بە بیانوو، هەندێ وشەی ناشیرینی بەکار هێنا سەبارەت بە بڕوادارەکان... وتی: ئەم مەسەلەی ئێمە وای لێهات کەپێشینان ئەڵێن: (سمع کلبك یأکلك) سەگەکەت قەڵەو بکە تابتخوات. کورە بزانن! (ئەمە قبووڵ ناکەم کە گەڕێینەوە بۆ (مەدینە) کێ بەدەسەڵات و پیاو بێ، ناپیاوو بێ دەسەڵات دەرکات (مەبەستی لەموسڵمانەکان بوو)....

(زەیدی کوڕی ئەرقەم) گوێی لێبوو بۆی گێڕایەوە، لەوکاتەدا (عومەر)یشی لابوو، وتی: فرمان بدە "عوبادە" بابیکوژێ.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی عومەر چۆن ئەبێ شتی وا، سبەینێ خەڵکی بڵێن محمد هاوەڵەکانی ئەکوژێ... نابێ شتی وا، بەڵام هەر ئێستا هاوەڵان ئاگادار بکە بابڕۆین و ئیتر بەجێی بهێڵین (بۆ ئەوەی قسەیەك لەم و یەکێك لەو تەشەنە نەکا) هەرچەند کاتی ڕۆیشتنیش نەبوو... لێیان داو ڕۆیشتن ئەوڕۆژە تا ئێوارە وشەویش تا بەیانی بێوچان، تا زۆر ماندوو بوون، کاتێ ئیسرلحەتیان کرد خێرا خەویان لێکەوت. بەڵێ پێغەمبەر (ص) بۆیە بەپەلە ئەوێ ی بەجێهێشت تا ڕووداوەکەیان لە بیر بچێتەوە و دامودەزگای کوفر سوودی لێوەرنەگرێ.

3ـ چارەسەرکردنی گێرە و کێشە لەکاتی کۆچکردندا:

پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ لەگەڵ هاوەڵاندا کۆچیان کرد بۆ (مەدینە) چەندەها گیروگرفت هاتە ڕێگەیان و پێویستی بە چارەسەرێکی وریاو زیرەکانە بوو:

أ ـ بەستنی هاوەڵان و موسڵمانەکان بە هۆزەکانی ترەوە.

ب ـ فەراهەمهێنانی (کەش و هەوایەك) لە (مەدینە) دا تا موسڵمانەکان بتوانن تێیدا بژین، چونکە دانیشتوانی ئەوێ سێ تاقم بوون جوولەکە و دووڕوو وموسڵمان.

ج ـ چارەیەك بۆ ئابووری، چونکە ئەوەبوو موسڵمانەکان ماڵ و منداڵ و خانوو بەرەیان لە (مەککە) دا بەجێ هێشتبوو. هیچیان بەدەستەوە نەمابوو، کەواویوو پێویستە هەوڵ بدات بۆ فەراهەمهێنانی ژیانیان. ئەمانەو چەندانی تریش، ئەویش هەستا بەخێرایی: بازاڕێکی کردەوە تەنها موسڵمانەکان لەوێ شتوومەك بکڕن و بفرۆشن، تا تێکەڵی جوولەکەکان نەکەن. لەو لایشەوە هەر کۆچەرێکی کرد بە برای یارمەتیدەرێك لە ژیان و ژیواردا، بە شێوەیەك میراتیان لەیەك ئەبرد!! ئەوانیش بەڕاستی برا بوون پارووی دەمی خۆیانیان ئەگرتەوە بۆبرا کۆچکەرەکانیان، برا بوون برا (بەمانای وشەکە).

ئینجا هەستا وتارێکی بەنرخی بۆ خوێندنەوە، دوای پێشکەشکردنی سوپاس بۆ خوای گەورە، فەرمووی: "أما بعد أیها الناس فقدموا لأنفسکم، تعلمن و الله لیصعقن أحدکم ثم لیدعن غنمه لیس لها راع، ثم لیقولن له ربه ـ لیس له ترجمان ولا حاجب یحجبه دونه ـ ألم یأتك رسولي فبلغك وآتتك مالا وأفضلت علیك؟ فما قدمت لنفسك؟ فینظر یمینا وشمالا فلا یری شیئا، ثم ینظر قدامه فلا یری غیر جهنم، فمن استطاع أن یقي نفسه من النار ولو بشق تمرة فلیفعل، ومن لم یجد فبکلمة طیبة، فأن

بها تجزي الحسنة عشر أمثالها إلى سبعمأة ضعف والسلام عليكم وعلى رسول الله". [1] واته: ئەی گرۆهی ئادەمی: چاکە و خێرو بێر پێش خۆتان بخەن. ئەزانن سوێندم بەخوا کە یەکێکتان ئەمرێ و مەڕو ماڵاتەکەی بەجێ ئەمێنێ و بێ شوان ئەمێننەوە (واتە دڵتان خۆش نەکەن بەدنیا، چونکە دنیاکەتان ئاوایە، کەوابوو پێشی خۆتانی بخەن) ئنجا کە مرد پەروەردگاری ـ بێوەرگێڕو دەرگاوان ـ پێی ئەڵێ: ئایا پێغەمبەرەکەم نەهات ڕێگەی ڕاستی پێ ڕاگەیاندی؟ ئایا سامانم نەدایتێ؟ ئایا لەپاداشتی ئەوانە دا چیت پێشی خۆت خستووە؟ تەماشای ڕاست و چەپی خۆی ئەکات هیچ شتێك نابینێ.

سەیری بەردەمی ئەکات تەنها دۆزەخە، ئنجا هەرکەسێك ئەتوانێ خۆی بپارێزێ لە دۆزەخ با بەلەتە (خورما) یەکیش بێت خۆی بپارێزێ، ئەو کەسەیش هیچ شك نابات بابە وشەیەکی چاك بەشداری بکات، چونکە چاکە پاداشتەکەی یەك بەدەیە تا حەوت سەدە سلاو لەسەر ئێوەولەسەر پێغەمبەری خواش بێ.

ئیمامی بوخاری ئەگێڕێتەوە کاتێ: موسڵمانەکان چوونە (مەدینە) پێغەمبەر (ﷺ) عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ڕەبیعەی کرد بەبرا.. دوای ئەوسەعد وتی بە عەبدوڕڕەحمان: من لە یارمەتیدەرەکان سامانم زیاترە، لەگەڵ تۆدا ئەیکەم بە دوو بەشەوە، دوو ژنیشم هەیە حەزت لە کامیانە دیاری بکە با تەڵاقی بدەم بۆت کە (عیدە) ی تەواو کرد مارەی بکە. عەبدوڕڕەحمان وتی: (بارك الله لك في أهلك ومالك أين سوقكم...؟ خوا پیت بخاتە ماڵ و خێزانتەوە بازاڕەکەتانم نیشان بدە (بابڕۆم ئیش بکەم).؟

پێغەمبەر (ﷺ) وای تێگەیاندن لە ئیسلام کە کۆچەرەکان هاتنە (مەدینە) یارمەتیدەرەکان پەلاماریان بۆ بردن (هەموو کەسێك حەزی ئەکرد مێوانی بەرکەوێ) تا سەرئەنجام دەویان لێخستن!! ئابەم شێوەیە سەرکەوت بەسەر ئەو گرێ کوێرەدا هاتە ڕێگەی ئەندامەکانی.

7ـ دوور بین بێت لە ئیش و کاردا:

أ ـ هەرکەسێك سەرنجی هەڵسوکەوتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بدات بۆی دەرئەکەوێ کەهەموویان پڕن لە حیکمەت و فەلسەفە، وە بۆی دەرئەکەوێ کە زۆر دووربین بووە.

بۆ نموونە: کیسرا ناردی بۆلای کارگێڕەکەی لە (یەمەن) بۆ ئەوەی دوو کەس بنێرێ بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بیگرن و بیهێنن بۆلای!! ئەمیش دووکەسی نارد بۆ ئەوەی کە زۆر بەوردی دیراسەی ژیانی پێغەمبەر بکەن.. بەڵێ کە گەیشتنە ئەوێ پێغەمبەر (ﷺ) (15) ڕۆژ هێشتنیەوە بێوەلام، وە لە ڕۆژی (15) هەمدا کیسرا کوژرا، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵەکەی پێگەیاندن و، هەر لەوێش پشتێنێکی بەخشی بە یەکێکیان و نووسیشی بۆ (باذان) ئەگەر بڕوای هێنا هەرچی وا لەژێر دەستیا ئەیداتێ.. سەرئەنجام بەهۆی ئەم کارە زۆر وردو لەسەرخۆیەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەستی لە کیسرا بەرداو موسڵمان بوو.

ب ـ کۆمەڵێ لە دووڕووەکان هەستیان کرد بەوەی کە بەتەواوی ناپاکییان دەرکەوتووە و بەتەواوی بێ ڕێز بوون هەستان بۆ ئەوەی تۆزێ خۆیان شیرین بکەنەوە لای کۆمەڵەکە هەڵسان بە کردنەوەی مزگەوتێك دژی موسڵمانەکان، بۆ ئەوەی شیعارو دروشمی موسڵمانەکان ڕابکێشنەوە بۆ خۆیان و ئینجا ئیتر هیچ کەسێك قسەی نەمێنێ پێیان بڵێ (منافق) و دوو ڕوو!! ئەی ئەوە نییە مزگەوتیان کردۆتەوە؟!

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) وازی لێهێنان تا لەجەنگی (تەبوك) گەڕانەوە.. ئینجا مزگەوتەکەی سوتاند و ڕوخانیشی. ئا بەو شێوەیە زۆر بەوردبینیەوە سەرکەوت بەسەریاندا، دەنگی نەکرد تا کاتی موناسیبی هات.

بەڵێ ئەبێ (قیادە) و پێشەوا خاوەنی ئەو خاڵانەو هەندێکی تریش بێت کە لەجێگەی خۆیدا باسکراون، هەر ئەمەیش ـ دوای یارمەتی خوا ـ پێغەمبەری سەرخست، چونکە لە هەموو هەڵوێستەکانیدا ورد بین بووە، وە خاوەنی نەخشەیەکی

[1]) الرسول سعيد حوى ،ـ ﷺ ـ ، بەرگی یەك ( 1 ) لاپەڕە ( 222 ) چاپی چوارەم 1399 ك .

سەرسورڕهێنەر بووە. کە هەرچی دۆست و دوژمن هەیە سەری سورِ ئەمێنێ چۆن ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) لەو ماوە کەمەدا ئابەو شێوەیە سەرکەوت بەسەر ئەو ئاژاوە و (فوضى) و پشێوییەدا کە لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا بڵاوبووبوویەوە؟!.

توانی سەرکەوێت بێ ئەوەی خۆی بخاتە باوەشی لایەکەوە (ڕۆمەکان، یان فارسەکان) واتە پێویستە پێشەواکانی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامی سەرنجێکی باری ژیانی دونیای موسڵمانان بدەن، تا بزانن جیهان چییان بەسەرا هاتووە؟ وە تا بزانن تا (ئەوان) نەگەڕێنەوە سەر نەخشەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو کاروباریدا، کۆمەڵایەتی، ئابووری، سەربازی، سیاسی، هەر ئاوا ئەبێ بە دەست خەڵکەوە خەلك یارییان پێ بکات.

هیوام وایە هەموو شۆڕشگێڕێك سەرئەنجام بێتەوە سەر ئەم نەخشەیەو لەم هێڵەوە شۆڕش بکات دژی دنیا خۆران و ستەم کاران و خوێن مژانی بەش خوراوەکان لەسەرانسەری وڵاتدا.

لە کۆتاییدا ئەڵێم:

1ـ ئەم باسە ـ سیاسەت لە ئیسلامدا ـ زانین و ڕەفتار پێکردنی باسێکی زۆر گرنگ و بە بایەخە، بۆ ئەوەی دەم کوتی ئەوانەی پێ بدەیتەوە کە هەموو هەوڵێکیان جیاکردنەوەی "ئایین"ە لە "دەوڵەت". بەلایانەوە ئیسلام چەند شێوەو دروشمێکی "خوا پەرستی = عیبادەت"ە نوێژو ڕۆژو...هتد.

سیخورمەیەکە لەسەر دڵی ئەوانەی ڕائەکەن لە (سەروەری) و ڕابەرایەتی ئیسلام بەرەو بێ یاسایی و بەرەڵایی و ڕێگەی تاریك ئەدەنە بەر. ئەیانەوێ بەو ناوەوە کە ئیسلام یاسای دەوڵەت بەڕێوەبردنی تێدا نییە ڕابکەن و ڕژێمی ڕزیوی چەندە ساڵەی ئەمو ئەو بێنن بۆ گەلەکەمان! ! گەلی باوباپیر موسڵمان و، خاوەن زانست و زانیاری و، فەرهەنگ و ڕێزمان و، خەباتگێڕو فیداکار، گەلی دڵپاك و زمان پاك و داوێن پاك و ڕەسەن و هەڵکەوتە و گورجوگۆڵ و وریاو زیرەك.

ئەم سیاسەتە ئیسلامییە کە لە پێشەوە باسمانکرد خەنجەرێکە بۆ سەر دڵی دوژمنانی ئیسلام، پێیان ئەڵێ: ئەوە نییە هەموو جۆرە سیستم و یاسایەکی دەوڵەتی لە ئیسلامدا ئەبینرێ؟! کەوابوو ئەم پڕوپاگەندانەتان لە چییە..؟!.

2– ئەبوو چەند لیژنەیەك بیان نووسیایە هەریەکەیان پسپۆر بووایە لە بواری خۆیدا... سەربازی بە جیا، ئابووری بەجیا... دادوەری، پیادەکردنی یاسای جەنگ... وە هەروەها، بەڵام کە نەبوو ـ ئەڵبەتە بە زمانی گەلەکەمان ـ منیش لە ناچاریدا پێنووسم خستە کار بۆ ڕێخۆش کردن و(سەرەتایە) و کردنەوەی دەرگای سیستمی سیاسی لە ئیسلامدا، نە سیاسەتی _ تەواو _ لەئیسلامدا.

3ـ سیاسەت کاری ئەوەیە کە موسڵمانان و ئادەمیزادە خەمنەخۆرەکان بجووڵێنێ و کۆیان بکاتەوە لە ژێر یەك ئاڵاو پەرچەمدا ڕاپەڕن و هەوڵ بدەن بۆڕزگاری ئایین و وڵات و نیشتمانیان، هەروەك لە یەکەم خاڵی دەست پێکردنی پێغەمبەرەوە دەرکەوت، ئەوە بوو دەستی کرد بە هۆنینەوەو کۆکردنەوەی وزەی لاوو پیرو ئافرەت و پیاو هەموو جۆرە کەسێکی خێر لێبینراو، لە ڕاستیدا کەڵکی بینراو هاتە بەرهەم... بەڵام شایانی باسە ئەبێ ئەوەمان لە یاد نەچێ کە تەنها بە ناوی ئەو (پێغەمبەر)ەوە کۆکردنەوە و ڕێکخستن ئەکرا، واتە نەئەبوبەکر نە عومەر نە..نە.. بەجیا جیا بەناوی خۆیانەوە خەریك نەبوون، (زەید وعەمر) یش بۆخۆیان لەولاوە، هەریەکەیان (9_10) کەسێك، سەرئەنجام یا هەر یەکناگرن، یا ئەبێ (مفاوضە) بکەن بۆ یەکگرتن، ئینجا لەم کاتەدا مەگەر خوای گەورە یارمەتی بدات ئەگینا ڕێبەرو کۆکەرەوەی هیچ لایەکیان ئامادە نابێت لەگەڵ ئەو دەستەکەی تردا تێکەڵ ببێت و ببنە یەك لاشەو یەك دڵ.. !! چونکە هەریەکە (تصور) و بۆچوون و پێشنیارو (پرۆژەیەکیان) ئەبێ بۆ شێوەی ئیش و کارکردن !! سەرئەنجام قەناعەت بە یەکتر ئەکەن و ئەڵێن هەریەکە بۆ خۆی هەوڵ بدات، لە ئاکامدا هەریەك ئەگرنەوە، چونکە هەمووی هەر خزمەتە بە ئیسلام !! چ جیاوازیەك ئەبینرێ لەمەدا تۆ لەوێوە دێیت و منیش لێرەوە... هەر بەم نیازو فیکرەوە هەر یەکە کارئەکات بۆخۆی، وا ئەبێ تەنها (لاوێك) چەند هەوڵی بۆ ئەدەن و ئەویش کە ئەبینێ ئاوایە لە دەست هەموویان ڕائەکات ! ! هەر لەمەوەیە کە پیاوە هەڵکەوتووەکان _ گەلێکیان _ ڕائەکەن لە وشەی "سیاسەت" و بەهۆیەکی گرنگی دائەنێن بۆ تەفرەقەو ئاژاوە دروستکردن لە مێشکی لاوەکاندا و

یەکنەگرتنیان، بۆیە لە پەرتووکی (سیاسة الحكم) نووسینی "ئۆستن رني" وەرگێڕاوی دکتۆر (حەسەن عەلی الذنون) دا هاتووە: "سیاسەت کردەوەیەکی پیسە، سیاسییەکان بەتایبەتی ئاژاوەچی و خۆ هەڵکێش و فشەکەرو ڕەوشت نزمن، سیاسییەکان تەنها ئیهتمام بە بەرژەوەندی و دەستکەوتی خۆیان و ئەوانەی سەر بەوانن ئەدەن، هەمیشە لە ئیشێك دەگەڕێن کە سەرنجی جەماوەر ڕابکێشن ئەگەرچی زۆر باش بزانن ئەو ئیشە ڕاست نییە، سیاسی هەرگیز کار بۆ پاشە ڕۆژ ناکەن، ئەوکات و ساتەی ئەوی تێدا ئەژی چی بوویت ئەوە دەکات..!! بۆیە هەندێکی تریان بیٚ پەردە ئەڵێن: "سیاسەت عیبارەتە لە فروفێڵ و پیلان و تەڵەکە بازی بەشێوەیەکی ڕەسمی ومەشروع بەناوی ڕێکخراوێك، یان حکومەتێکەوە بۆ گەیشتن بە مەرام و مەبەست و ئامانجە نەخشە بۆ کێشراوەکانیان".

هەر لە زانایانی ئایینیدا گەلێکیان بێزاری دەربڕن لەوشەی (سیاسەت) و بەشتێکی تەفرەقەو پەرەوازەی و هۆی دروستکردنی دوژمنایەتی و ناڕێکی دائەنێن، بۆ نموونە "شێخ متەوەلی شعراوی ) بە شتێکی زۆر سەیر تەماشای "سیاسەت" ئەکات، چونکە بەلایەوە _ وایە دروست بوونی ئەو هەموو پارت و دەست و _ تاقمانەی ئەبینریٚ سەرئەنجامی (دید) و بۆچوونی چەند کەسێکی تایبەتییە لە ئاکامدا ئەندامەکانی ئەم ڕقیان لەوە، چونکە لە (خانە) و شانەی ئەودا کار ناکات، ئەندامەکانی ئەوی تریان ئەمان بەڕاست نازانیٚ چونکە بڕوایان بەو (دید) و پرۆژانەی ئەوان نییە. ئەگەر تۆزیٚ هەنگاو هەڵگرین بەو لا ترەوە ئەبینین پیاوێکی وەك "سعیدی نورسی" ئەڵێت: "اعوذ بالله من الشيطان ومن السياسة.." ئیتر با بەڕێز (سەعید حەووا) و وێنەی بوەستن چی ئەڵێن و چی ئەکەن لە کتێبەکانیاندا، چەند بێتاقەت و گیرخواردەن لە مەبەستەکەیاندا.. چەندە ڕەش بینن، چونکە گەلیٚ ڕێکخراو هەیە ئەوی تریان بە کافر دائەنی چونکە پشتگیری ئەو ناکات (حەزناکەم پەنجە بخەمە سەر کەس).

4_ منیش دەڵێم ئەگەر "سیاسەت" بریتی بێت لە تێکدانی مێشکی لاوەکان و تێگەیاندنیان هەریەکە بەئارەزوو بۆچوونی ئەوچاودێرکەرە، خۆزگایە هەر نەبوولیە، ئەگەر بریتی بێت لەکۆکردنەوەی چەند ئەندامێك لەسەر (دیدو) و (بەرنامە) و (فتوا) و (ئیجتهادی) چەند کەسێك و، ئەو خاوەن فەتوایانە هەرخۆیان بەڕاست بزانن، هەزار جار ئەڵێم: کاشکایە هەر نەبوایە.. !!

5ـ بەداخەوە پتر لەمەی بەردەستت ئەمادە کرابوو، بەڵام لەکاتی نەهاتدا، هەروەك گەلێك لە بەرهەمی نووسەران بە کالۆکرچی بەسەر ئەچیٚ وگوم ئەبیٚ، ئەمیش ملی تیاچوونی نایە بەرو لێمان بزر بوو و بارێك داخ و خەفەتی بەجیٚ هێشت، شایەنی باسە بۆمان نەگونجایەوە بینووسینەوە و کۆی بکەینەوە.. جا لەبەرئەوە داوا لە برایان ئەکەین لەکەم و کوڕی ببورن، هیوادارم بەئەندازەی خۆی کەلێنێك پڕ بکاتەوە لە نامەخانەکانی کوردستاندا.

6ـ سیاسەت لە ئیسلامدا ئەوەندە باسێکی دەوڵەمەندە ـ سوپاس بۆ خوا ـ بە دەیان کتێب و نامیلکەی لەسەر نووسراوە، هەرچەندە لەوانە زۆر کەمیان بەردەست خوێنەرانی ئێمە کەوتبن، جا بۆیە پێمخۆشە هەندیٚ کتێبت بۆ تۆمار بکەم لە باسی سیاسەت لە ئیسلامدا.. تۆیش هەوڵبدە ـ بە پشتیوانی خوا ـ بە دەستیان بهێنە، تا پتر حەقیقەت و ڕاستیت بۆ ڕۆشنتر ببێتەوە:


1) من أصول الفكر السياسى الإسلامي، الدكتور محمد فتحي عثمان
2) الدولة القانونية و النظام السياسي الإسلامي، الدكتور منير حميد البياتي
3) تأريخ الإسلام السياسي. الدكتور حسن ابراهيم حسن
4) حقيقة الإسلام و أصول الحكم، محمد نجيب
5) منهاج الحكم في الاسلام، محمد أسد
6) الأحكام السلطانية، الماوردي
7) الخادمة أو الإمامة العظمى، محمد رشيد رضا
8) النظريات السياسة الإسلامية، محمد ضياء الدين الريس

9) نظام الحكم في الإسلام، محمد الغزالي

ئەمانە و چەندان كتێب و باسی تر لە گۆڤارو ڕۆژنامە. هیوادارم زیاتر بەرەو پێش برۆیت.

## سەرچاوەكان


1 – الدولة القانونية و النظام السياسي الإسلامي، الدكتور منير حميد البياتى

2_ من أصول الفكر السياسي الإسلامي، الدكتور محمد فتحي عثمان

3_ منهاج الاسلام في الحكم، محمد أسد

4_ ماركس والخلق

5 _ حقيقة الشيوعية

6_ الماركسية والعلم والفلسفة

7_ هزيمة الشيوعية

8 _ الإسلام وأوضاعنا السياسة، عبدالقادر عوده

9 _ الطبقات الكبرى، إبن سعد

10 _ النظريات السياسة الإسلامية، الدكتور محمد ضياء الدين الريس

11 _ تفسير المنار

12 _ المنهاج، النووي

13 – المقدمة، إبن خلدون

14 _ الحسبة في الاسلام، إبن تيمية

15 _ أصول الدعوة، الدكتور عبد الكريم زيدان

16 _ إرشاد الساري، القسطلاني

17 _ السيرة النبوية، إبن هشام

18 _ نهاية الأقدام، الشهرستانى

19 _ السياسة الشرعية، إبن تيمية

20 _ الرد على الباطنية، محمد الغزالي

21_ مبادئ نظام الحكم في الاسلام، الدكتور عبدالحميد متولي

22 _ نحو الدستور الاسلامي، أبو الأعلى المودودي

23 _ الأحكام السلطانية، أبو يعلي الماوردي

24 _ نيل الأوطار، الشوكاني

25 _ الطرق الحكمية في السياسة الشرعية، ابن قيم الجوزية

26 _ التشريع الجنائى الاسلامي، عبدالقادر عودة

27 _ العقائد النسفية، التفتذاني.

28_ مجموع الفتاوي، إبن تيمية

29 _ معالم الثقافة الاسلامية، الدكتور عبد الكريم عثمان

30 _ العدالة الإجتماعية، سيد قطب

31 _ تأريخ الاسلام، الدكتور حسن ابراهيم حسن

32 _ العلاقات الدولية والنظم القضائية في الشريعة الإسلامية

33 _ الرسول القائد، محمود شيت خطاب

34 _ الرسول، سعيد حوى.

## ناوەڕۆك

## بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| 1 | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| 2 | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| 3 | ئاشتینامە، وەلامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| 4 | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| 5 | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| 6 | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەکەم" | جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
| 7 | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| 8 | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵلا |
| 9 | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| 10 | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
| 11 | مێژووی دێرینی کوردستان "بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| 12 | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| 13 | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگە و گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| 14 | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| 15 | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |

| | | |
|---|---|---|
| 16 | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی<br>بۆ نووسیوە |
| 17 | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| 18 | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| 19 | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| 20 | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| 21 | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| 22 | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| 23 | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| 24 | بەرەو بەختیاریی ئافرەت<br>"بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| 25 | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| 26 | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| 27 | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| 28 | هەڵەبجە 1889 ـ 1930، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |

| | | |
|---|---|---|
| 29 | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدورڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| 30 | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| 31 | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| 32 | شێخ مەحمودی حەفید (1922 – 1925) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| 33 | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |